أبو عبد الرحمن الكردي

زنجیرەی کەڵە پیاوانی ئیسلام

# سەلاحەددینی ئەیوبی

## تێکشکێنەری خاچپەرستانی دوژمنکار

وەرگێڕان

محمد [illegible]



# سەلاحەددینی ئەییوبی
# تێکشکێنەری خاچپەرستانی دوژمنکار

نوسینی

**د. محمد رجب البیومی**

وەرگێڕانی

**مەلا محمد حسن سەرگەینێڵی**

چاپی یەکەم




بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

١٤٢٩-٢٠٠٨

ناوی کتێب: سەلاحەددینی ئەییوبی تێکشکێنەری خاچپەرستانی دوژمنکار

نوسەر: د. محمد رجب البیومی

وەرگێڕ: مەلا محمد حسن سەرگەینێڵی

بڵاوکەرەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن/ هەولێر

خەت: نەوزاد کۆیی

بەرگ: أمین مخلص

نەخشەسازی ناوەوە: عزالدین محمد

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٠ك - ٢٠٠٩ز

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٧٥٠)ی ساڵی ٢٠٠٨ ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

12000

(رووداوەکان ڕۆمانێکن نووسرانەوەتەوەو، فلیمێکن نمایش کروان، دیاردە مێژووییەکان لە هەموو کاتو شوێنێکدا بە پێی چەند پرەنسیپو یاسایەکی مێژوویی دوبارە دەبنەوە وەکو چۆن دیاردە سروشتییەکان دوبارە دەبنەوە کە قورئان بە ﴿سنن﴾ ناویان دەباتو، دەفەرموێ: ﴿...وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلاً﴾(فاطر-٤٣)

قەت بۆ یاسای خودا گۆڕان نابینیت﴾.

ئەم بە سەرهاتەی سەلاحەددینو خاچ پەرستی نموونەیەکە لەم دیاردانە کە پێشکەشی ئێوەی بەڕێز دەکرێت. بۆیە ئێمە لە لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی ژیانماندا پێویستیمان بە کەڵك وەرگرتن هەیە لەو ئەزموونە مێژوویی یانە کە بەرلە ئێمەدا ڕابردوون - ﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لأُوْلِي الألْبَابِ﴾(یوسف-١١١)، واتە: لە گێڕانەوەی بە سەرهاتی ئەوانەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ هۆشمەندان. تا بتوانین لە پرۆسەکانی ژیانماندا سەرکەوتووو بەختەوەربینو، لەو هۆیانە پارێزراوبین کە لە سەرکەوتنو پێشەکەوتن دامان دەبڕنو، دوامان دەخەن بۆ دواوە، چونکە ئەوەی ئیمرۆ دەیبینین لە ڕابردووش هەرئەوە بوو ڕوویداوە کە دووبارە دەبێتەوە).

وەرگێر

١٣/٥/ ٢٠٠٦ زایینی

## ئــەم پیــاوە

{ئەو ڕەحمەتی خوای لێبێ چاو زۆر پڕ لە فرمێسك بوو، كاتێ گوێی لە قورئـان دەبوو دڵی دەترسا، زۆربـەی كاتـەكانی ئەشـك[1] بـە چـاویدا دەهاتـە خـوار، زۆر تامەزرۆی بیستنی فەرموودە بـوو.... فـەرمانی بـە خـەڵك دەدا دابنیـشن وەكـو شكۆیەك بۆ فەرموودە}.

(ئەوە ڕحمەتی خوای لـێبێ كاتێ جەنگ گەرم دەبوو، خۆی بـە نێـوان هـەردوو ڕیزدا دەخولایەوەو، سەربازەكانی لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەبڕی و، خۆی سوپای ڕێـك دەخستو خۆی فەرمانی دەدانێ پێشو پاش بكەن، لەو شوێنانەی دەیبینی، ئەو لە لێواری دوژمن نزیك دەكەوتەوە، هەتا دەبـوو بـە هاوسـێی ئـەو، ئـەو دوو بەشـی قسەی لە نێوان هەردوو پۆلدا بۆ دەخوێنرایەوە).

(هاوڕێیەتی خۆش بوو، ڕەوشت جوان بوو، ڕووخۆش بـوو، ڕێـزی لـە عـەرەبو وەقایعی ئەوان دەگرت[2] و ژیاننامەی ئەوانی دەپاراست، لە نەژادی ئەسپ شـارەزا بوو، دانیشتوان بە شێوەیەك سودیان لەو دەبینی كـە شـتی وایـان لێدەبیـست لـە كەسیتریان نەزانیوە، هەروەها دانیشتنی پاكژو خاوێن بوو.

## قازی (ابن شـداد)

(تــەنیا نازنــاوی گــەورەتر دەبیــستێ، وەسـیفەتی تـر كـە بەدەسـتهێنانیان بێسوودە.... تەنیا ﴿سەلاحەددین﴾ شای شامو میسرو حیجازو یەمـەن نـەبێ كـە ناوداربوو بە چاكەو دادگەری، ئـەم نـاوە لەگـەڵ ناوەكەیـدا پێكاوپێكـەو، لەگـەڵ ماناكەیدا وەكو یەكە) (لەو كـارە جـێ شـانازیەی ئـەم سـوڵتانە لـەخوا نزیكـەو،

---

١) ئەشـك: فرمێسك

٢) شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەڵـێ: (عەرەب ئینكاری فەزلی ئێوە ناكەم ئەفزەڵن، ئەمما صلاح الـدین كـە دنیـای گرت لە زومرەی كوردی بابان بوو). منیش بڕوام وایە ڕێز بە تەقواو زانست و خەباتە: ﴿ان اكرمكم عن الله اتقاكم﴾. وەرگێڕ ٢.

شوێنەوارەكانى كە وەكو یاداشتێكى جوان بۆ دین‌و دنیاى هێشتۆتەوە: لابردنى گومرگ‌و باج بوو كە لەسەر حەجاجەكاندا دانرابوو........ تا ئەو گومرگەى لە وڵاتى میسرو شوێنەكانى تردا هەبووو هەم باجەكان، سوڵتان ئەم بیدعە نەفرین لێكراوەى هەمووى لابردو، دادگەرى فراوان‌و گوشاد كردو، ئاسایشى بڵاوكردەوە).

## (ابن جبیرى گەشتیار)

(نیازى دڵم بە تۆ دەڵێم— واتە: بە ابن شداد —: هەركاتێ خوداى گەورە پاشماوەى كەنارەكەى بۆ ئازادكردن، ئاسان كردو، وڵاتم بەش كردو، ڕاسپاردەم ئەنجامدابایەو، سوارى ئەم دەریایە بام، تا دەگەیشتە دورگەكانى‌و شوێن ئەو بێباوەڕانە كەوتبام تا لەسەر زەوى كەس نەدەما كە بیروڕاى بە خودا نەبێ، یان بمردبام).

## (سوڵتان سەلاحەددین)

(لە زۆرى بە خشندەیى‌و دەستگوشادى ئەو ئەوە بوو،كە فەرمانبەرانى ئەو سامانیان لێدەشاردەوە، تا كاتى پێویست بوون دەهات‌و ئەوەى دەیویست پێى دەدان، ئەمەش بەشێكە لە بەخشندەیى زۆرى ئەو). (كاتێ دیمەشقى رزگار كرد، هیچى لە گەنجینەى ئەوێ هەڵنەگرت، بەڵكو بەسەر دانیشتواندا دابەشى كردو، ڕێزى ئەوانەى دەگرت كە لە خزمەتیدا بوون و، بە نەرمى لەگەڵیاندا دەجولایەوە، ئەگەر خراپەیەكى لێ بینیبان‌و پێى ناخۆش با دەیشاردەوە).

(دانیشتن‌و كۆڕى ئەو خاوێن بوو، كەس نەیدەوێرا قسەكى خراپ بە بەرامبەرەكەى بدات، هەر هەتیوێكى دەبینى سۆزى بۆ دەجوولاو بەزەیى پێدا دەهاتەوە، سەربارى ئەوەش منداڵ‌و خێزانى خۆى خۆشدەویست‌و، لەگەڵ منداڵەكانیدا زۆر یارى‌و گەمەى دەكرد).

نووسەرێكى ئەوروپى خاوەنى كتێبى (تاريخ المؤرخين).

# پێشـــەکی

ئەمــە پاڵــەوانێکی (جــەنگی بــەدرە)، ســەردەمی ئــەو لــە ســەردەمی پێغەمبەرایەتیدا دواکەوت، تا ڕۆژگار بە باشی زانــی کــە لــە چــاخی جەنگــەکانی خاچیەکاندا بێت، تا ڕۆڵی پاڵەوانانی (بەدر) ببینێ کە لــە بەرامبــەر دوژمنکــاری ستەمکاردا سەقامگیر بوون، کاتێ لە وڵاتــی هاوبــەش پەرســتی بۆیــان هــات تــا ڕیشەکێشیان بکات، جا خودا بــە ســەرکەوتن لەلایــەن خۆیــەوە خــەڵاتی کــردن و، بەرپەرچی بێ بڕواکانی داو هیچ دەسکەوتێکی باشیان دەستنەکەوت.

هەروەها سوپای بەرەو وڵاتی مسوڵمانان کشا بۆئەوەی ڕیشەکێشیان بکات، جا نەوەی بەدریەکان، ئەوانەی بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێنابوو، دەســتیان بــە فەرزی جیهاد کرد، خوای گــەورەش لــە مەیــدانی ململانێــدا چەســپاوی کــردن و، بەرپەرچی بێبڕوایان دایەوە وێڕای ئەوەی کە هیچ بەهرەشیان دەست نەکەوت.

ڕەنگــە گــرنگترین شــت کــە (ســەلاح حــەددین) بــە پاڵەوانــەکانی (بــەدر)ەوە دەبەستێتەوە، بڕوای چەسپاوی ئەوە کە نالەقێت کە دەیزانــی ئــەو لەچــاو ســوپای ئەورووپادا کە لــە چــەند دەوڵــەتێك و کەشــتیگەلێکی بەرگریکــەر پێکــدێن، وەکــو کۆمەڵەکی زۆر کەم کە بــەو ژمــارە کەمــەی ناگاتــە ئــەو ئاســتەی لــە بەرامبــەر کۆمــەڵێکی چڕژاوو قەڕەباڵغدا بووەستێت، بەڵام ئەوەش دەزانێ کە خوای شــکۆدار دەفەرموێ: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللهِ وَاللهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (البقرة-٢٤٩). واتە: زۆرجار کۆمەڵێ کەم -بە ئیزنی خوا- بەســـەر کۆمەڵێکی

زۆردا وەسەرکەوتون. خوا یاری خۆڕاگرانە[١].

چا ئەو ئیمانو بڕوایە بووە هۆی سەرکەوتنی، بەمەش ڕۆڵی یەکلاکراوەی خۆی لەسەر شانۆی مێژوودا نواند.

خوێنەر نموونەی زیندووی زۆری ئەم بڕوایە لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا دەبینێ، ڕەنگە ئاسانترین نموونە کە ئاماژەی بۆ دەکەین خوێندنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بێ بە (اسناد)ی خۆی لە گەرمەی شەڕدا کە سەختترین هەلۆێستە لەکاتێ لە کاتەکانی ناخۆشیدا، لە قازی (بهاء الدین) کوڕی (شداد) لە مەیداندا شانبەشانی پاڵەوان دەوەستێو، دەڵێ: گەورەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لە زۆر هەلۆێستدا خوێنراونەوە، بەڵام نەمزانیوە لە گەرمەی جەنگدا خوێنرابنەوە، بۆچی ئێمە ئێستا نەیخوێنینەوە؟) سەلاحەددین (دەستووریدا بەئامادەکردنی گەورە پیاوانی فەرموودە، تا فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بخوێننەوە. بەم پێشنیارەی قازی هاوڕێی، سنگی گوشادو گەشبین بوو، بەرەکەتو پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ گۆڕەپانی گرتەوەو، گۆڕا بە سەرکەوتنەکی یەکلاکەرەوە کە مسوڵمانان بەدەستیان هێنا.

ئەم هەلۆێستە بە تەنیا جەخت لەسەر بڕوای ئەم پاڵەوانە دەکات کە ئەو سەربازێکە لە سەربازەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شکۆدارترین مەیداندا بەرگری لە مسوڵمانان دەکات و، هەروا جەختدەکات کە ئەو کۆمەڵە کەمەی کە بڕاوی وایە لە پێشبڕکێی کێشەدایە، سەرکەوتنی پشتگیریکراوی بۆ دێنێتەدی لە ژیانداو، پاداشتێکی زۆرترو گەورەتریش لەلای خوایە.

زۆر کتێب لەمەڕ (سەلاحەددین) نووسراوە، هەیانە ئامانجی پێکاوە و، بەرێکی ئارەزومەندی هێناوەو مافی کەس ناخۆینو، کاتێ دەبێتە سەرچاوەی قسەیێ لە پەراوێزدا ئاماژەمان بۆ کردووە، بەڵام هەیە لەو نووسراوانە بە گیانی خۆ بە زلزانی

١- وەکو یارانی (طالوت) کە (٣١٣) کەس بوون لە بەرامبەر سوپای (جالوت)دا کە بێشومار بوون (البقرة /٢٤٧-٢٤٩) سەیر بکە، یارانی بەدریش لە بەرامبەر بت پەرستەکاندا (٣١٣) کەس بوون، وەکو لە (المستدرك الحاكم)دا هاتووە... ئەم دیاردەیەش وەکو یاسایەکی مێژوویی نەگۆڕ دوبارە دەبێتەوە. (وەرگێر).

نووسراوە كە مامۆستايان بۆ قوتابييانيان نووسيويانە. ئەمانە بوون بە مێژوونووس، چونكە ئاستەكى زانستييان وەرگرتووە كە دەبەخشرێ بۆ بەدەستهێنانو پاداشتو گواستنەوە، نەك بۆ حاڵى بوونو سۆراغو شيكاريى، هەيانە وادەزانێ ئەو بە ڕەخنەكى بڕەڕ هاتووە كە چەند هەڵوێستێ ڕاو دەكاتو هۆيەكانى سەرى لێدەرناكات و، پاڵنەرەكانيشى تێناگات، ئينجا ڕەخنەى سەركۆنەكەر لە پاڵەوانى ئەو هەڵوێستانە دەگرێ، وەك بڵێى بۆتە پياوەكى شەڕخوازو خۆى كاتى كارەساتێكە هەڵدەسوڕێنێ و، پاشان بڕيار لەسەر ئاكامەكانى بەڕاستو هەڵە دەدات، هەيانە بۆ (موتورييەكان) دەگەڕێتەوە كە مێژوونووسى ئەورووپين، تا بيانكات بە ڕووناكى بەخشى ڕێنمابەخش، هەرچى هەڵيانبەستووە بڕواى پێدەكات، لەگەڵ ئەوەشدا نووسەر هەيە لە فەڕەنگەكان بە ويژدانەوە لەسەر (سەلاحەددين)ى نووسيوە، وەكو ئەوانەى بە ويژدانەوە جاشترين شت دەنووسن، بەلام خەزى بە گەورەزانى بەسەر پاڵەوانانى مێژوودا بچووكەكان هاندەدات بۆ پەلاماردانى گەورەكان بە ناحەقيش نەك بە حەقەوە، جا ئەم كتێبەيان ئاڕاستە دەكەم، نەك لەبەرئەوەى كە (سەلاحەددين) لە هەموو كارێكدا كە كردوويەتى يان نەيكردووە ڕاستى پێكاوە. بەڵكو بۆئەوەى بڵێم: ئەم پياوە بەڕاستى لە ڕاستىو هەڵەكانيدا مەزنە، چونكە هەر كارێك كردويەتى مەبەستى خێرو چاكە بووەو، خوداش لە زۆربەى كارەكانيدا سەرى خستووە، ئەمجا ئەو بەرگريكەر بوو نەك هێرشبەر، دادوەر بووە، نەك ستەمكار، خاكى (متواضع) بووە، نەك خۆ بە زلزان، ئەو پێشەنگێكى نموونەو شاهيدەكى ئەمين بوو. ئەمڕۆ حاڵەتى ئوممەتى ئيسلامى پێويستى بە وەبيرهێنانەوەى هەڵوێستەكانى (سەلاحەددين)ە، تا لە ڕوحمو سۆزى خوا نائومێد نەبێ، چونكە دوژمنانى ئەم ئوممەتە بە ئەسپو چەكو پلانو فێڵەوە هاتونەتە سەريانو بۆيان لە كەميندان، ماناى شكانو ڕووخانيان بۆ دووپات دەكەنەوە، هەتا واى لێهات دڵ لەرزۆكەكان، وايانزانى سەركەوتنو سەربەخۆيى نييە، هەروەها هەمان هەستى گشتى لەكاتى بلاوبوونەوەى پەتاى خاچپەرستەكانو هاتنە ناو

ولاتی عەرەب بۆ داگیرکردن[1] مسوڵمانان ترسانو واقیان وڕمابوو، وایانزانی تازە قیامەت نزیك بۆتەوە، بەلام باوەڕدارانی وەکو (عمادالدین)و (نورالدین)و (سەلاحەددین) لە نالەبارترین ڕەوشی شەڕدا بەرهەڵستی داگیرکەریان کرد، تا شکاندیانو وشەی خودا بەرزکرایەوە، جا ئەگەر بمانەوێ سوود لە ڕابردوو وەربگرین، لە ژیاننامەی (سەلاحەددین)دا هەڵوێستی زۆر هەیە بۆ پەندو ئامۆژگاری، بەمەش سرودێکە لە سروودەکانی سەرکەوتن کە جەنگی جیاکەرەوە پێش دەخاتو هەست دەبوژێنێتەوەو، هیمەتو ئازایەتی زیندوو دەکاتەوە.

مەبەستم بووە کە ئەم کتێبە ئاشکراو بێ پێچو پەنابێو، بە ڕووداوی زۆر قورسی نە کەمو پڕ لە ژمارەو مێژووی نە کەم، بەڵکو پشت بە شتە ڕوونەکان ببەستم لە کارە ڕاستو دروستەکان کە ئاکامی یەکلاکەرەوەیان هەیە، تا بەو سۆراغە یەك لەدوای یەكو بەردەوامە نووسینەکی ڕاستگۆیانەبێ بۆ ڕابردوو کە بووە. ئەگەر برادەرانی (سەلاحەددین) لە نووسەرانو سەرکردەکان لەگەڵ ئەودا ڕۆڵێکی بەهێزیان بینیبێ لە مەیداندا، ئەوا ئەم کتێبەم لەوانەش بێبەش نەکردووە تا ڕۆڵ (دەور)ەکان بە پێودانگی تەواوی خۆیاندا برۆن، هەندێ لەوەی کە بۆ ئەم پاڵەوانانەم تەرخانکردووە کە بە پێودانگی داستان هاتووە، ڕاستییەکانی مێژوو کۆ دەکاتەوە بێ خەیالکردن بە هیچ زێدەکارییەك... دیارە زۆریشم لەدەست چووەو کەمم باسکردووە، چونکە سۆراغکردن پێویستی بە چەندان بەرگ (مجلد) هەیە کە بابای پسپۆڕ بیانخوێنێتەوە.... ئەوەندەم بەسە کە پوختەکی چڕوپڕو دەوڵەمەند پێشکەش بکەم، ئەوەتا کتێبێکەم پێشکەشی خوێنەر دەکەم، هەندێکی هەر دەستدەکەوێ کە لێی ڕازی بێو پەسندی بکات. هەر خوا ئاگای لە نیازی دڵانە.

دکتۆر: محمد رجب البیومی

---

١) پێویستە بزانین کە ئەم ولاتە هەر هی عەرەب نییە، بەلکو هی سەرجەم گەلو پێکهاتەکانی مسوڵمانانە. ئەنجا سەلاحەددین لەبەرخاتری ئەمە خەباتی کردووە نەك لەبەر خاتری عروبییەت، بە تایبەتی قودسیش کە شوێنەکی پیرۆزی سەرجەم مسوڵمانانە. ئەمانە هاندەری ڕاپەڕینی (سەلاحەددین) بوون! پێویست بوو (البیومی) بنوسێ: لە ولاتی مسوڵماناندا نەك لە ولاتی عەرەبیدا. -وەرگێڕ

# چەند دێرێك لەبارەی سەلاحەددینەوە

١- لە ساڵی (٥٣٢ ك) لە شاری (تكريت) لەدایك بووە.
٢- بۆ یەکەم جار لەگەڵ سوپای شێرکۆدا ساڵی (٥٥٩ ك) چۆتە میسر.
٣- دووبارە لەگەڵ سوپای مامی دا لە ساڵی (٥٦٢ ك) بۆ میسر چووە.
٤- لەگەڵ سوپای مامی دا لە ساڵی (٥٦٣ ك)دا چووە (میسر).
٥- پلەی وەزیریی لە (٥٦٤ ك)دا وەرگرت.
٦- ساڵی (٥٦٧ ك) دەوڵەتی فاتیمی ڕوخا.
٧- پیلانەك ڕێکخرا بۆ زیندوکردنەوەی دەوڵەتی فاتیمی، بەڵام لە ساڵی (٥٦٩ ك) لەناوی بردن.
٨- (نورالدين زنكی) لە ساڵی (٥٦٩ ك) مرد.
٩- چووە شام بۆ پشتگیریکردنی لە یەکڕیزی لە (٥٧٠ ك) دا.
١٠- لە (٥٧٢ ك)دا لە ئیسماعیلیە هەوڵی تیرۆرکردنی درا.
١١- لە (٥٧٢ ك)دا گەڕایەوە بۆ میسر.
١٢- لە ساڵی (٥٧٣ ك)دا لە جەنگی خاچپەرستەکان سەرکەوت.
١٣- ساڵی (٥٧٤ ك) گەڕاوە شام.
١٤- لە(٥٧٦ ك)دا لەچەند جەنگی جیاجیادا بەسەر خاچپەرستەکاندا سەرکەوت.
١٥- لە (٥٧٦ ك)دا کەشتیگەلی میسری پێك هێناو، هێزی دەریایی دروستکرد.
١٦- لە (٥٧٨ ك)دا گەڕاوە میسر، پاشان چووە دیمەشق.
١٧- ساڵی (٥٨٣ ك) لە جەنگی (حطين)ی سەرکەوت.
١٨- لە ساڵی (٥٨٣ ك)دا قودسی رزگار کرد.
١٩- جەنگی عەککا لە ساڵی ٥٨٧ ك دا.
٢٠- ڕێکەوتنی (الرملة) لە ساڵی (٥٨٩ ك) دا.
٢١- لە ساڵی (٥٨٩ ك) سەلاحەددین - رحمه الله - کۆچی دوایی کرد.

# پــەتای پەرەســـەندوو

که باس له جەنگەکانی خاچ پەرستەکان دەکەین، وەك بلێی سەر گوزەشـتەیەك بوو بەسەرچوو، بەڵام ئەو کەسەی له حاڵی ئیمـڕۆ ڕامێنـێ، دەبینـێ کـه جـەنگی خاچپەرستی له گەرمەی هەڵگیرسـانییەتی، خۆرئـاوای ئـەمڕۆ هـەمان خۆرئـاوای دوێنێیه، لەگەڵ هەندێ جیاوازیدا، ئامێرەکانی جیایه و، بەڵام ئاکەمـەکانی وەکـو یەکە ئەگەر جەنگی کۆن ڕون‌و ئاشکرا بووبێ و، سوپاکەی به چەك‌و ئاگر چـووبێته پێشەوەو، سوپایەکی داگیرکەرو تاڵانکەر بووبێت، ئەو جەنگـەی ئیمـڕۆ دەبیـنین جەنگی زیرەکانەو فێڵکردنەو، جەنگی ئاژاوەگێڕی‌و هەڵپەرستییەو، به توانایـەکی فێڵکەرانەو فریودەرانـه تەڵـەو داوە دەنێتـەوە. بۆیـه هـەمان ئاکـامی ڕابـردووی دەبێت‌و، ئەمەش زیرەکانەترو سـامناکترە، چـونکه هەنـدێ خـەڵکی بـه شـێوازی پێچاوپێچی فریو دەخۆن‌و، کەسانێك لێی بێ ترس دەبن بەبێ توێژینەوەو پشکنین، باڵندە کاتێ خۆی به تەڵەوە دەبینێ دەکەوێت‌و دەیگرێ بێئـەوەی ببیـنێـت، بۆیـه مافی ڕۆڵەکانی ئیمڕۆیه که ئەوەی ڕابردوو ڕوویداوە بیزانـێ تـا ڕێگاکـه لـه ڕووی پرەنسیپ‌و مەبەستەوە له هەنگاوەکانیدا ببینن‌و، بەو بینینـەش پەنـد وەردەگـرن‌و هۆشیار دەبنەوە.

پەتای خاچپەرستی به ناوچە هێمن‌و نامەترسیەکانی خۆرهەڵاتدا کشا بێئـەوەی هیچ بیانووو پاساوەکی لۆژیکی هەبێ، بەڵکو ئەوە جەماوەری به هاوارو ژاوەژاوە، پروپاگەندەی ناڕاست کاری تێدەکات و، بێ بیرکردنەوە ملی بۆ کەچ دەکات! بـەڵام ئەو کەسەی ئەو بیانووو پەڵپانە دەنێتەوە پیاوەکی ئایینییە، بەڵکو گـەورە پیـاوی پیاوانی ئایینی‌یه له ئەوروپا، به هەمان واقیعی ڕابردووی خۆی سەیری ئێـستاکەی

کردووە، بینی خەڵکی بە کارە جوانەکانی پاپای پێشوو هەڵدەدەن، بە جێنشینی ڕاستگۆی مەسیحی لە قەڵەم دەدەن، ئەمەش لەکاتێکدا بوو بە چاوی سۆزو بەزەییەوە سەیری گەلی خۆی دەکرد، ئەویش (گریگۆری حەوتە) بوو کە کاروبارەکانی کەلێسای ڕێکخستەوە و، ڕێساکانی بێسەرەوبەری فڕێدا، بە ڕاشکاوی بە هەموو دەستدرێژکاری دەگوت گوناهو تاوانت کردووە، پیاوانی ئایینی ئەوانەی شوێنی کەوتبون، وای لێکردبوون کە لە زەبرو زەنگی ئەو دەترسان، ئەگەر هەڵەیان کردبایە لەبەرچاوی ئاپۆڕەیەکی جەماوەری هۆشیاردا لەگەڵیاندا بەرەنگار دەبۆوەو، حەڵاڵی حەرام کردو، حەرامی حەڵاڵ کرد.

کاتێ (ئەربانی دووەم) بەدوای ئەو داهات، بینی ئەم پۆشاکە فراوانەو باڵای ئەوی تێدا بچووك دەبێتەوە و، بینی ڕەهبانی دەوروبەرەکەی ئەوەی لێیان قەدەغە دەکات لەبەری پێڵە (ڕاست) دەبنەوە و، وەکو ئەو پیاوەی بەر لە خۆی ناتوانێ بە قسەی ئاشکراو ڕەوان پەرچیان بداتەوە، هەرچەندە ڕەخنەی هەیەو دەترسێ ئەگەر باسیان بکات بە باڵای ئەو نەکاتو لە سنووری ئەودا نەبێ، بۆیە لە شکۆو ڕێزێ دەگەڕا خەڵکی پێوە سەرقاڵ بکاتو وایان پیشان بدات کە ئەو دووربینەو مەبەستی فراوانە، پاپا (گریگۆری حەوتەم) بە دڵخۆشییەوە سەیری کلێسای (بێزنتی) نەدەکرد لە (قوستەنتینی)یەدا، بەڵکو بە مەترسییەکی گەورەی دەزانی لە بڕینی نینۆکی داو، کەمکردنەوەی دەسەڵاتیداو نەشیدەتوانی هیچ شتێکی لەگەڵدا بکات، چونکە گەلو یاساو دەوڵەتی خۆی هەیە، پاشان (قوستەنتینی یە) لەگەڵ (سەلجوقییەکانی)دا کە حوکمی خۆرهەڵاتیان دەکرد کەوتە دوژمنایەتییەوەو بەسەریاندا زاڵ بوو، بەهۆی ئەوەی لە بارەگای حوکمی خۆیدا هەڕەشەی لێکردن، پاپای کلێسای (بیزەنتی) پێشبینی هێرشەکەی دەکرد کە لەسەر تەختی دابەزێنێو کەس نەبێ پارێزگاری لێبکات، بەبیریا هات کە داوای فریاکەوتن لە (ئەربان) پاپای ڕۆما بکاتو پێی بڵێ بە تەنیا تۆ پارێزەری مەسیحییەتی لە ئەورووپادا و،

جا ئەو گوێڕایەڵی دەبێ‌و ئەمەش گەورەترین هەڵو[1] بوارە بۆ کەسێ سەیری مەزنەتی‌و گەورەیی دەکات‌و ئێستاش دەستی کورتە، تا شکۆی ئەو کەسەیە بەدەست بهێنێ کە بەر لەخۆی هەیبووە.

(گریگۆری حەوتەم) بیری لە چاککردن‌و ڕێکخستنەوەی خەڵکی دەکرد لە ئەوروپادا، تەنیا بیری لەوە دەکردەوە کە ئەو دەوڵەتە بچوکانە پێکەوە شەڕ دەکەن و، فەرمانڕەوایە دەرەبەگەکان هەر یەکەیان سەربەخۆن‌و گەورەبن یان بچوك بن و، شەڕی ناوخۆیان هەیە، کەس بەهۆی جەنگی بەردەوامی نێوانیان بە یەکگرتویان سەیر ناکات. (گریگۆر) هەوڵی دەدا شیرازەو پەیوەندییان چاك بکاتەوە، ئەمەش لەکاتێکدا کە سەرۆك سوپاکان دەهاتن بۆ لای‌و کەلێن‌و درزەکان چاك بکاتەوە و، تا ماوەیێ یەکیان خاتەوە و، لەناو دۆستان‌و لایەنگرانیدا ناوی بە باشی بڕوات، بەڵام (ئەربان) دڵی بەوە خۆشبوو کە بیری خۆی بەسەر کلێسای چڕژاودا بسەپێنێ‌و، دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئاپۆڕەی هەموو هەرێمەکاندا بسەپێنێ، تا بەرگری لە گۆڕەی مەسیح بکات لە خۆرهەڵاتدا، بەڵکو ئەو دەوڵەت‌و پایتەختانە داگیر بکات کە لە دەوری گۆڕەکەوەن، مەبەستەکە لەمە دورترەو هیواکە گوشادترە، پێویستە بە هەنگاوی یەکەمدا بڕواو، شوێنکەوتووی هەبوون بە هەموو لایەکدا ڕەوانەی دەکردن، تا ڕای گشتی ئەوروپی وەربگرێت و، ئەویش لە کلێسادا چۆکی دادا بوو بەجێی نەدەهێشت. پاپای ئەربان لەساڵی (١٠٩٥ ز) چووە شای (کلیرمونتا) هەتا سەرۆکایەتی گەورەترین کۆمەڵ بکات کە نوێنەرایەتی سەرجەم دەوڵەتانی ئەوروپایی‌دەکرد، سەدان سوار چاك لە سوپای دەرەبەگەکان ئامادەی بوون کە هی چەندان ناوچە بوون، لەوتارەکیدا کە دەروونەکانی گشتی تایبەتی بەدڵیان بێ

١) لە کتێبی (ماهية حروب الصليبية)دا، د. قاسم عبدە قاسم، کویت،١٩٩٠، ل ٣٧)دا هاتوە: لە بۆچونی زۆر لە لێکۆڵەراندا گریگۆری حەوتەم (Greg org viF)١٠٧٣—١٠٨٥ز بیرۆکەی جەنگی پیرۆزی ڕاگەیاندووە لە دوا شێوەی داو، گواستنەوەی جۆرێتی هەڵوێستی مەسیحییەتی لەمەڕ جەنگەوە دروستکردووە، بۆ یەکەم جار سوپای مەسیحی (Miitia cheisti) بەکارهێناوە بە مانای دینییەوەیەوە نەك بە مانای مەجازییەوە کە قەدیس پۆڵس بەکاریهێناوە. (وەرگێڕ).

هەرچی خەڵکی گشتی بوو بەوە لە ژێی دڵی دان. کاتێ وتی مسوڵمانان سوکایەتی بە گۆڕی مەسیح دەکەن‌و، ئەوان کردویانە بە شوێنی میزکردنی ئاژەڵان، ئەگەر ئەوان تۆزقاڵێ هۆشیان هەبوایە دەیانزانی کە مسوڵمانان بڕوایان بەوەنیە کە مەسیح هیچ گۆڕەکی هەیە، چونکە خودا بۆ لای خۆی بەرزی کردۆتەوە و، لە خاچ نەدراوە! ئەی چۆن سوکایەتی بە گۆڕێ دەکەن کە هیچی تێدا نابینن کە وەکو کەسانی تر بڕوایان پێی هەیە. لە وروژاندنی هەستی ئایینیدا زۆر سنوری بەزاندو هەندێ بەسەرهات‌و ڕووداوی دڵتەزێنی بۆ گێڕانەوە کە مسوڵمانان لەگەڵ ئەو حەجکەرانە کردویانە کە مەبەستیان چون بووە بۆ (بیت المقدس)، ئەوەی ڕاستی بێ هەندێ ڕووداو ڕوودەدات کە حەججاج‌و سەردانکەران هەراسان‌و بێزار دەکات، بەڵام ئەمە سەرهەڵداوی ڕای گشتی نیە تۆڵە لە حەججاجەکانی (بیت المقدس) بسێنرێ، بەڵکو ئەم ڕووداوە وەکو کارێکی ناوێزە ڕێگرو چەتەکان لە هەموو شوێنەکدا ئەنجامیان دەدا، دوورنیە ئەم جۆرە کەسانە هەتا پەلاماری حەججاجە مسوڵمانەکانی ماڵی خواش بدەن لە مەککەدا، تا ئەو ماڵ‌و دارایی‌و کەلوپەلانەی پێیانە لێیان بستێنن، بەڵام ئەم دەنگۆیە (الاشاعة) کە پەرۆشی‌و بە خەمەوەبوونی گشتی دەوروژێنێ پاپا بۆی هێنانەدی، ئەو وروژاندنەی سەرخست، توانای ئەم قسە وروژانییەرانەشی بە یەکێ لە یارمەتیدەرانی وەرگرت کە (پەترۆس ناسك) بوو کە هانیدەدا بۆ دانی ڕتاری وروژێنەر لە هەر کۆمەڵگایەکدا کە بڕواتە ناویەوە! کاتێ شاسوارانی دەرەبەگ لە چێژو خۆشیە کەسایەتییەکانیان دەکۆڵنەوە و، هیوایەکیان دەچنن بۆ بەدەستهێنانی میرنیشینەکان، پاپاش بۆیان باس‌لەو شتانە دەکات‌کە بوار بۆ ئەو هیوایانە فراوان دەکات‌و، وتی: ئەم گەشتە جەنگییە بۆ وڵاتی خۆرهەڵات (تەنیا بۆ بە دەستهێنانی یەك شار نیە، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی تەواوی ناوچەکانی ئاسیایە، بەتەواوی دەوڵەمەندی‌و گەنجینە بێشومارەکانیەوە، ئەگەر (بیت المقدس) بارەگایەك بێ بۆ مەسیح کارەکە بەوە ناوەستێ، بەڵکو بۆ مالیکەکانی ئیسلامیش لە هەواری بێ بڕواکاندا درێژ دەبێتەوە، چونکە بەتایبەتی بێ لەو بێبڕوایە (مسوڵمانانە) بۆ ئێوەیەو، ئەمەش وەکو لە تەوراتدا هاتووە: (شیرو هەنگوین زۆر دەکات).

هەموو لێکۆڵەران لە نووسەرانی خۆرئاوا یەکدەنگن کە گیانی ئایینی لە دەوڵەتانی ئەوروپیدا لاواز بووە بۆئەوەی کە ئەوروپییەکان پاڵبدات بۆ کۆچکردن بۆ رزگارکردنی گۆڕەکە بە تەنیاو، خەڵکی ئاسایی‌و تایبەتی هەموویان نقومی تاوانەکان ببوون‌و، ئەو تاوانانەیان دەکرد کە مەسیح یاساغی کردون‌و، پاپا بەڵێنی پێدان کە چاوپۆشی لە تەواوی گوناهەکانیان دەکرێ، هەرچی بکوژو دزو شەڕواڵ پیس‌و گەواهیدەری بە درۆو چەتەیە ئەگەر بەرەو (بيت المقدس) بچن گوناهەکانیان بووراوەو، لە هەموو تاوانێ بێتاوان‌و بەری دەبن.

چەك (پسوله)ی لێخۆشبوون (صكوك الغفران) کە پاپا دەیدا بە تاوانباران لە بەرامبەر پارەیەکی سەپێنراودا (تا وایلێهات لای مەسیحییەکان بووە راستییەکی گومان هەڵنەگر)، بیرۆکەی لێخۆشبوونی لە هزرەکان نزیك خستنەوە، چونکە کلێساکە ماڵ‌و دارایی وەردەگرێ تا لێبوردن ببەخشێ هەر ئەویش بەرامبەر بە پارەو ماڵ گەشت‌و سەفەرە کە بەرامبەرو یەکسان دەکات، هەرکەس کۆچ بکات ئەوە لە تاوانەکانی کوشتن‌و دزی‌و زیناکاری رزگاری بووە! کاتێ گوناهو تاوانەکانی ئەو شاسوارانەی چەکیان بەناو میرنشینەکانی دەرەبەگایەتیدا هەڵگرتبوو زۆر لەوە زیاتر بوو کە بژمێردرێ، بەخشینی ئەو تاوانە بەس نیە بۆ سەرنج ڕاکێشانیان بەرەو گۆڕەپان‌و، پاپا بە دڵنیاییەوە ئەوەی دەزانی، بۆیە پێویستە هیوای ئەوەیان بداتێ کە ئەوان دەبن بە خاوەنی دەوڵەتانی خۆرهەڵات، بۆیە پێویستە هەر فەرمانڕوایێ سوپایەکی تەواو بۆ خۆی ئامادە بکات تا ناوچەیەکی گەورە یان گەر توانی یەك دەوڵەتی گەورە بۆ خۆی داگیر بکات‌و، ببێتە دەسەڵاتدارو دەست ڕۆیشتوو، بە بەهرەکانی خۆرهەڵات شاد بێ، هەم بەو بە شیرو هەنگوینەی تەورات باسی لێوە کردوون[١] بەم شێوەیە هیوایەتەکان زۆر دورتر لەوە ڕۆشتن کە هەژارێکی برسی

---

١) دەقی لێبوردنی (ئەدبان) کە دەیبەخشی ئەوەبوو: (هەرکەس بڕواتە ئورشەلیم، بە دڵپاکی‌و دڵسۆزییەوەو بەس، نەك بۆ گەورەیی‌و ماڵ، بەڵکو بۆ ئازادکردنی کەڵێسای خوراء دەتوانێ ئەم گەشتە بکاتە جێگرەوەی هەر کارێ کە گوناهەکانی پێ ڕەش بکاتەوە).

تاوانبار لەناو خەڵکی ئاساییدا بە خەیاڵی دادێت‌و، هیوای سوربووان‌و چاوتێبڕانی بۆ فەرمانڕوایانی دەرەبەگ بوو، بە تایبەتی گەر بەرەو خۆرهەڵات بکشێن‌و ماڵ‌و منداڵ‌و خانوبەرە بەجێبهێڵن لە هیچ شتێ ناترسن، چونکە کلێسا بە پاراستنی ئەوانە هەڵدەستێ‌و هەر کۆچکەرێ مافەکەی زامنکراوە، گەر گەڕایەوە بۆمان هەیە وتارەکەی پاپا بگوازینەوە کە ئەمە دەقی قسەکانییەتی: (ئەی سوپای مەسیحییەکان، ئێوە بێهودە هەوڵتان دەدا کە ئاژاوەو ئاشوب لەناو خۆتاندا هەڵگیرسێنن‌و هەڵسنەوە، ئیمڕۆ هۆیەکی راستەقینەتان کەوتۆتە بەردەست بۆئەوەی ئێوە رۆژگاری هۆکاری بێزارکردنی هاونیشتیمانییەکانتان بوون، ئیمڕۆ بچن بەربەریەکان بێزارو وەڕەس بکەن‌و، بڕۆن ولاتی پیرۆز لە دەستی کافرەکان رزگار بکەن.

ئەی سەربازان! ئێوە ئیمڕۆ کەلوپەلی شەڕن، ئێوە ئەمڕۆ خۆتان ئامادە بکەن هێزو بازووتان پێشکەش بکەن بۆ سودی بڕوایەکەتان‌و، بە چەکی ئایین‌و تەقوا خۆتان چەکدار بکەن‌و ئێوە بەوە بەهرەی هەمیشەیی دەخەنە دەست. ئەگەر ئێوە سەربکەون بەسەر دوژمنتاندا، مەمالیکەکانی میسر بۆ ئێوە دەبێت، ئەگەر بشکێن مەسیح لە کوێ مرد لەوێ دەمرن‌و پەروەردگاری بەسۆزی خۆی لەیادتان ناکات‌و لە شوێنی دۆستانی خۆتاندا دادەنێ، ئەمە کاتێکە ئازایەتی خۆی تێدا دەردەخەن کە لەکاتی ئاشتیدا دەرتانخستبوو، ئەگەر مسۆگەرە دەبێ تۆڵەی خۆتان بستێنن، ئەوە بچن دەستی خۆتان بە خوێنی ئەو بێبڕوایانە بشۆن.

لێرەدا گوێگران بە گریانەوە هاواریان لێ بەرزبۆوەو، پاپا ووتی: (وا سەربازی ئاگر بوون بە سەربازی خودا ئەی گەلی من، ئەگەر خودای مەسیح داوای یارمەتی لێتان کرد پشتی لێمەکەن‌و لە ماڵەوەتاندا دابنیشن، بیر لە هیچ شتێ مەکەنەوە تەنیا بیر لەوە بکەنەوە کە برایانی مەسیحیتان دوچاری بوون لە سەرشۆڕی‌و ریسوایی‌و، گوێ لە قودس‌و هەناسەکانی نەبێ مەگرن‌و، چاك یادی ئەو وتەیەی

(ماهیة حروب الصلیبیة / د: قاسم عبده قاسم / ل: ٥٥). (وەرگێر).

مەسيح بكەنەوە كە وتوويەتى: ﴿ئەوەى دايكو باوكى زياتر لەمن خۆشبوێ لە مـن نييەو، هەركەسێ ماڵو زێـدو دايـكو بـاوكو ژنو منـداڵى بـەجێ بهێڵـێ لەبـەر خۆشەويستى منو خاترى من لەناو بەهرەكەدا نەمر دەبێت﴾.

دواى ئەم وتارە ئاگربيە (پەترۆس ناسك) دەسـتيكرد بـە گەشـتوگەڕان بـەناو سەرتاپاى ئەورووپاداو سوارى كەرێكى لەڕو لاواز بوو بوو، بەرگێكى شڕى كردبـووە بەرەوە، پێى خاوس كردبوو، خاچە گـەورەى هـەڵگرتو، بـە گريـانێكى وروژێنـەر هاوارى دەكردو ئازارو ئەشكەنجەى مەسيحييەكانى لە خۆرهەڵاتدا دەگێڕايـەوە، وە بارى عەرەبى دڕندەو نەزان چۆنە لەسەر گۆڕى مەسيحدا.

يەكێ لە رێكەوتە سەيرەكان ئەوە بوو قاتو قوڕييەكى سەير بەشـى خۆرئـاواى ئەورووپاى گرتەوە، وەچەو كشتوكاڵى لەناوبردو سواڵكەرو دەرۆزەكـەر زۆربـوون كـە خواردنى رۆژانەيان دەست نەدەكەوت، تـەنيا بەشـى پەيـداكردنى ئـاوى دەموچـاو شوشتنيان نەبێ، كاتێ دەيان دێهـات وێـرانو كـاول بـوو، كێڵگـەكان ڕەقو ڕووت مانەوەو سەوزاييان نەما، برسييەكان بيريان لەوە كردەوە كە دەبێ بير لە شوێنێكى بە پيت بكەنەوە، تا لەو برسێتييەى ئێستاو مردنى چاوەڕانكراو رزگاريـان بكـات، لەكاتێكدا گوێيان لە دەنگى پاپابوو ئاماژەى بـە خێروبێـرى خۆرهـەڵات دەكـردو تالانو دەسكەوتەكەى بە رەوا لـە قەڵـەم دەدا بـۆ كۆچـكەرانو گەشـتياران، ئـەو برسييانە بە دڵ روويان لەو كۆچكردنە كرد، چونكە چارەى برسـيەتى ئـەوانى تێـدا هەبوو، كاروانەكە بە تەواوى گروپو هۆزەكانەوە لە فەرمانڕەواو بكوژو دزو چەتەو تالانكار كەوتە ڕێگا، هەريەكە هيواى تايبەتى خۆى لەدڵ گرتبوو، برسى دەيويست بخواتو فەرمانڕەوا دەيويست ببێتە خاوەن كورسىو تەختو تاوانبار ئارەزوومەندى لێبوردەيى خوايى بوو.

هەڵمەتی یەکەم کاتێ (ئاسیای بچوکی) داگیرکرد لەگەڵ بەرگری سەلجوقیەکان[1] بەرەو ڕوو بۆوە، ئەگەر هێزی تریان مابێ ئەگینا ئەو گەداو رووتانەیان بە تەواوی لەناوبردن کەمێ نەبێ دەربازیان نەبوو، بەڵام ئایا کلێسا لەو شکانییەیان بێدەنگ دەبن و بەردی لەسەر دادەنێن و، پاساو بیانووی چی بۆ چ ئەمە دێننەوە؟ پاپا ئەو پڕوپاگەندەی بڵاوکردەوە گوایە دڵەکان لە خۆشەویستی مەسیحدا خاوێن نەبوون و، کۆمەڵەکان لەژێر ئاڵای سەرکردەیەکدا نەبوون کە نەخشەو پلانکێش بن، بۆیە پێویستە ئەوجارە سەرکردایەتییەکە بەدەستی کەسێکەوە بێ شێوازی جەنگ بزانن و، ئەمەش هاتەدی و، لە قوستەنتینییەدا چەند سوپایەکی هاوپەیمان و سوێندخوار لە (لورینەکان)[2] و (ئەڵمان) و (نۆرماند)یەکان و (فەڕەنسی)یەکان کۆبونەوە، ڕێگاکەیان بە شێوەیەك ڕێکخست کە لە هەڵەکانی دوێنێ خۆ پەنابدەن و سەرکەوتنێکی بە پەلە بەدەست بێنن و، دەست بەسەر ئەڕڕەها (الرها) و (تەرابلوس) و (بیت المقدس) دابگرن. بەڵام چۆن ئەم

---

١) سەلجوقیەکان: چەند فەرمانڕەوایەکی تورکن، باپیرەیان سەلجوق بووەو، چەند لقێکن گرنگترینیان: (سەلجوقە گەورەکان (١٠٣٧ — ١١٧٥) تەغرۆل بەگو جەغری بەگ دروستی کردن کە نەوەی سەلجوق بوون. ناودارترینیان لەوانە: ئەلب ئەرسەلان و مەلیك شاه بەرکیاروقە. سەلجوقی کرمان (١٠٤١ — ١١١٨) قەرە ئەرسەلان دروستی کردن، سەلجوقی سوریا (١٠٩٤ — ١١١٧) تتش کوڕی ئەرسەلان دروستی کردن. سەلجوقەکانی عێراق و کوردستان (١١١٧ — ١١٩٤) مغیث الدین محمود دروستی کردن. سلجوقی ڕۆمی لە ئاسیای بچوکدا (١١١٧ — ١٣٠٠)، لەوانە چەند رشتە بڵاوبوونەوە کە ئەتابکەکان بنیاتی نان. (المنجد في الاعلام/ لویس معلوف)وە بە پێی (مێژووی گەلی کورد/ صالح قەفتان) و سەرچاوەی تری مێژوویی تورکەکان دەوڵەتی عەبباسی و فارسی و فاتیمییان رووخاندووە. لە کاتێکدا ئەلبا ئەرسەلان لە شەڕی مەلازگردا سوپای ڕۆم دەشکێنێ و ئیمپراتۆری ڕۆمانۆس بە دیل دەگرێ بەرەبەرە هەموو کوردستانیشی داگیر کردووە. بەڵام سەلجوقەکان وەکو صالح قەفتان لە (ل ٢٥١) ئاماژە دەکات لەگەڵ کورد دا نەرم و هێوربوون و، تەنانەت وشەی کوردستان لەو سەردەمەدا بە ڕەسمی بەکارهاتووە..... بۆ زانستی زیاتر لەمەڕ سەلجوقەکان و ئەتابەگەکان بڕوانە (ل ٢٥٠ — ٢٥١) لەم کتێبەدا. لە (تاریخ الخلفاء السیوطی/ ل ٤٣٤)دا هاتووە: (بنەماڵەی سەلجوق شاکانی وڵاتی ڕۆمەکانن) (وەرگێڕ).

٢) لورین: ناوچەیەکە لە خۆرهەڵاتی فەڕنسا، نورماندیشی ناوچەیەکی کۆنە لە باکوری خۆرئاوای فەرەنسا. (وەرگێڕ)

کارەساتانە پەیدا بوون؟ وەڵامەکەی ڕوونە، چونکە لاوازیو زەبونی فەرمانـدەکانی شارە بچوکەکانی شامو، لاوازی خەلافەتی عەبباسیو فاتمیو جۆراو جـۆری هـەواو ئارەزووکانو، نەبوونی سەرکردەیێ کە کەلێنەکان پڕ بکاتـەوە، پێویـستە هـەموو ئەو شتانە سەرنەکەوتنو دۆڕانو سەرشۆڕی پەیدا بکات.

سوڵتانی سلجوقی (قونییە) بەرگری لە بەرامبەر ئەم لافاوە کەفاوییەکرد، بەڵام نەیتوانی لە بەرگریکردندا خۆی ڕابگرێ، چونکە لافاوە گەورەکـە هـەموو لایـەکی (قونییە)ی گرتەوەو، پـەنجا ڕۆژ گـەمارۆدراو، پاشـان بـە نائومێدییـەوە خـۆی دا بەدەستەوە، ئازایـەتی سـەلجوقییەکان کوانـێ؟ لـەو کەسـانەدا کـە لـەو شـارانەی حوکمیان تێدا دەکرد لێکترازابوونو هەریەکە بە کاری خـۆی خـەریك بـوو. ئەگـەر دەسەڵاتدارانی سەلاجیقی لە دیمەشقو بەیتولـموقدەسو ناوچـەکانی تـری شـامدا لەش سـوکیان کردبایـە بـۆ فریاکـەوتنی دەسـەڵاتداری (قونییـە) دەیـانتوانی لـە شوێنەوارەکانی گەمارۆکە کەم بکەنەوە، بەڵام ڕکابەری یەکتری بوون، بـە شـێوەیێ دژایەتی یەکترییان دەکرد، بۆیە دوژمنان ئەوانیان خوارد. ئێمە لێـرەدا نکـوڵی لـە هەوڵو تەقەللای ئەوانە ناکەین کە ئازایانە بەرگرییان لە (ئـەنتاکیا) کـرد، کاتـێ (٩) مانگ خۆیـان بـۆ جـەنگ ڕاگـرتو، (باغیـسیان) فەرمانـدەی بـەرگری لـە تێشکاندنی هێرشبەراندا سەرکەوت تاوای لێهات نائومێدی خستە دڵـی ئەوانـەوە، بەڵام ناپاکی ناوخۆی گوناهبارانە شکاندی.لەکاتێکدا یەکێ لە پاسەوانانی قەڵاکـە بە پارەو بەشدان فریوی خواردو ئەویش چووە گـەڵیان هـەتا دەروازەکـانی شـاریان پیشان بدات، جا لە تاریکایی شەودا هێرشیان کردە سەر (باغیـسیان)و، دەسـتیان بەسەر خەوتووەکاندا گرتو نەیانتوانی یەك بگرن، بەڵام فەرمانڕەوایانی (حەلەب)و (دیمەشق) نامەی فێڵاوی فەرەنگییەکانیان بـۆ هـات کـە لەوێـدا ڕایانگەیانـدبوو، ئەگەر ئێوە یارمەتی گەمارۆداران نەدەن، ئەوان نایانەوێ زیان بە ئـەوان بگـەیێنن، ئەوان تەنیا ئەو ناوچـانەیان مەبەسـتە کـە (ڕۆم) لـە ڕابـردودا داگـیری کـردونو، پلانەکە سەری گرت، چونکە هەردوو بێئاگا کە دوای ئەوە پەلاماریان دراو، هەر لە

رابردوودا شکانیان بەسەر داهێنراو، چونکە ڕۆژی کوژرانی (گای سپی) ئەوانیش کوژران. تراژیدیاو گەرمەساتی (بیت المقدس) کە منداڵانی پیرو سەر سپی دەکرد، قەسابخانەیەکی دڕندانەو خراپی تێدا ئەنجامدرا کە هەرگیز مێژوو شتی وای نەبینی بێ و، جگە لەوەی کە ئەوروپییەکان خۆیان گێڕاویانەوە هیچی تری لێ باس ناکەم.

مێژوونووسی فەرەنگی (میشوا) لەمبارەوە وتوویەتی[١]: بە پەلە قەسابخانەی گشتی سەریهەڵداو مسوڵمانان لەسەر ڕێگاکانو ناو ماڵەکانیاندا کوژرانو، هیچ پەناگەیەك لە (بیت المقدس)دا بۆ ژێرکەوتوەکان نەبوو، هەندێ لەوانەی لەدەستی مردن رزگاریان بوو، ئەوانەبوون بەسەر حەوشەکاندا هەڵاتن، ئەوانی تر بوونە چەند کۆمەڵێ لە کۆشكو باڵاخانەکاندا خۆیان حەشاردابوو بەتایبەتی مزگەوتەکان، بەڵام لەدەست کوژرانی خاچ هەڵگرەکان رزگاریان نەبوو، چونکە بۆ کوشتنی دابڕاوو هەڵاتووەکان چوونە ناو مزگەوتەکانیشەوە. پیادەو سوارەکان خۆیان تێخزاند، لە ناوەندی دزێوترین ژاوەژاودا، تەنیا گوێت لە ناڵەو هاواری مردن دەبوو، کاتێ خاچ هەڵگران بەسەر کۆمەڵەی لاشەکاندا دەڕۆیشتن تا ئەو کەسەی هەوڵی راکردن بدات بیکوژن.

شاهیدحاڵێ (ڕیمون داجیل)ە کە دەڵێ: (لافاوی خوێن تا چۆکی ئەسپەکان بەرز بۆوەو، دژوارترینیان لە مزگەوتدا بوو، ئەوانەی نیشانەی ماندوبوونیان هەر پێوە مابوو لەو کوشتنەدا بەدیل گیران بە تەمای ئەوەی خۆیان بکڕنەوەو رزگارانە (الفدیە) بدەن بەپارە، ئەنجا خاچ پەرستەکان ئەوانیشیان کوشت، بە شێوەیێ ناچاریان دەکردن لەسەر باڵاخانەکاندا خۆیان فڕێ بدەنە خوارەوە، دەهاتن لە تونێڵو ژێرزەمینەکان دەریاندەهێنانو لەسەر لاشەی کوژراوانی تریان ریز دەکردنو دەیانکوشتن، نەك هەر لەسەر کۆشكو مزگەوتو ڕێگاوبانەکانو شەقامەکاندا لاشە هەڵدرابوونە سەر یەك، بەڵکو لە دورترین شوێنیشدا، ئەم قەسابخانەیە تا هەفتەیەك نەبڕایەوە.

١- لە وەرگەڕاوی (د: احمد احمد بدوی) وەرگیراوە لە چەند بڕگەیەکی کتێبی (میشوا).

مێژوونووسان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە ژمارەی کوژراوان خۆی لە (٧٠) هەزار کەس دا، پاشان فەرمان بەو مسوڵمانانە کرا کە مابوونەوە لاشە شێوێنراوەکانی هاوڕێو براکانیان بنێژن، ئەوانیش بەچاوی فرمێسکەوە ئەم کارەیان کرد، هەبوو لەناویاندا هاتبوو لەناو مردواندا لە تاڵانو دەستکەوت دەگەڕا).

ئەگەر ئەوە بەجێ بێڵین کە کوژرا بۆ تاڵانکردنو زەوتکردن لە قودس دا، ئێمە ئەم قسەیەی (ابن اثیر)[1] دەگوازینەوە کە دەڵێ: (فەرەنگییەکان لە مزگەوتی ئەقسادا زیاتر لە (٧٠) هەزار کەسیان کوشت، زۆرێك لەوانە پێشەواو زاناو خواناسی ناو مسوڵمانان بوون کە لە نیشتمانی خۆیانەوە چووبوونە ئەوێ، تا لە تەك ئەم مزگەوتەدا نیشتەجێ بن، لە تەك (الصخرة)دا (٤٠)و قسور لالەی زیویان برد کە کێشی هەر لایەك (٤٠) ڕیتلی شامی بوو، لە (١٥٠) لالەی بچوکیان بردو، لالەی زێڕ (٢٠)و قسور لالە بوو، ئەو تاڵانەی بردیان بێشومار بوو). زۆر کتێب[2] لەمەڕ ئەم قەسابخانە خراپەیە نووسراوە، ئەگەر بمەوێ بیگوازمەوە ویژدانم زۆر ئازارم دەدات، بۆیە ئەوەندەی نووسیومەوە بە تەواوی دەزانم! کە ناوەڕۆکەکی تۆقێنەرو سامناکی هەیە. حەزدەکەم ئاماژە بە گومانێ بکەم کە هەندێ لەوانەی فاتیمیەکان لە هەموو چاکەیەك دادەڕنن برەوی پێدەدەن کە لە گەرمەساتی جەنگەکانی خاچ پەرستیدا پێشنیاریان کردووەو وای لێکردون ئەو گومانە بخەنە سەر ئەوان کە کاتێ خەلیفەکانی (میسر) شانو شکۆی سەلجوقیەکانیان بینی لە شامدا زیاد دەکاتو پێدەنێتە ناو سنورەکانی قوستەنتینییە، نوێنەر دەنێرنە لای فەرەنگییەکان لە (ڕۆمە)دا کە داوایان

١) (ابن اثیر): (عزالدین ابو الحسن علی) ١١٦-١٢٣٤ لە (دورگەی ابن عمر) پەیدابووەو، مێژونووسو ئەدیبو شەرحزان بووە، خاوەنی کتێبی (الكامل في التاريخ)و کتێبی ترە (المنجد) سەیر بکە. هەندێ سەرچاوەی مێژویی دەڵێن: لە دورگەی بۆتانی کوردستان پەیدابوە لە (١١٤٩)داو، لە موسڵو بەغداو دیمەشق خوێندویەتی. (مێژووی کورد/ پۆلی چوارەمی گشتی٢٠٠١/ هەولێر) ل ٣١ سەیر بکە. دیسان پیاوەکی کتێبی (مشاهير الكرد/ محمد امين زەکی بەگ)، (وەرگێر).

٢) الكامل لابن الاثير١٠/ ١١٧. (نووسەر)

لـێدەکەن دەست بەسەر (بیت المقدس) دابگرن، ئەمەش گومانێکـە هـیچ کـام لـە مێژوونووسانی ئەوروپا، لەگەڵ نووسینی زۆرێ لە شیتەڵـێ هۆیەکانی جەنگی خاچ پەرستیدا ئاماژەیان بۆ نەکردووە. دکتـۆر (ئـەلبیلی) بـۆ بەدرۆخـستنەوەی ئەمـە دەنووسـێ[1]: (چۆن ئـەمە ڕێکدەکەوێ کە فاتیمییـەکان بـانگی فەرەنگییـەکانیان کردبێ بۆ جەنگکردن لەگەڵ مسوڵمانانـدا، کەچی خۆشـیان بـە جـەنگی فـەرەنگی هەڵساون‌و، تا دواساتی هێزی جەنگییان بەرگرییان لە عەسقەلان کردووە).

لە بەشی یەکەمی (خطط الشام/الاستاذ محمد کـرد علـی)دا گێڕانـەوەو باسـی پچرپچڕ هاتووە لەمەڕ کارە جەنگییـەکان کـە فاتیمیـەکان پێـوەی هەڵـساون بـۆ شکاندنی سوپای نەسـرانی داگیرکـەر، بـەڵکو کاتـێ فاتیمیـەکان داوای پاڵپـشتی کردنیان کرد لە سەرۆکی دیمەشق کـرد ئـەوان هـیچ وەڵامێکیـان نـەبینی، ئەگـەر ئەوەکرابوایە، بەرەیەکی تر رزگار دەکرا کە تەقەللای خـاچ پەرسـتەکان پەرتـەوازە بکات‌و، دەتوانرا سەرکەوتن بەدەست بهێنرێت. مامۆستا (محمد کرد علـی) دەڵـێ: ﴿شای میـسر سـاڵی (٤٩٦ ك) سـوپایەکی بـە سـەرکردایەتی کوڕەکـەی (شـرف المعالي) ئامادەباش کرد کەشتیگەلەکی لە دەریاوە ڕەوانەکرد، ئەو سەربازانەی کـە لە ساڵی (٩٥ ك) دەرچوون لە کەناری (الرملـة) ئۆردویـان کـردو، لەگـەڵ سـوپای فەرەنگیدا تێکهەڵـچون‌و ئـەوانیان بەزانـدو (شـرف‌المعـالي) کۆشـکی (ئیفـشین)ی گەمارۆدا، فەرەنگیەکانی ناوی کوشـت‌و، ئـەنجا چـەند کاروانـێ بـۆ فریاکـەوتنی فەرەنگییـەکان ئامـادەبوون‌و تـۆقی (عەسـقەلانیان)دا و، (شـرف المعـالي) لـە عەسقەلانەوە بۆ ڕملە ڕۆیشت‌و نامەی بۆ (شمس الملوك)ی سەرداری دیمەشق نووسی داوای یارمەتی کرد لە دژی فەرەنگدا، ئەویش پاساوی بۆ ئەمە هێنایەوە. خۆزگـە دەمزانی ئایا سوپای خاچ پەرستەکان کە هەموو ناوچەکانی خۆرهەڵات‌و خۆرئاوایی

---

١) (صلاح الدین/ ل ٤٢) نووسەر (٤) (محمد کورد عەلی): لـە (مـشاهیر الکـرد/ محمـد امـین زکـی بـگ)دا: زانایەکی ناوداری شامەو، خاوەنی کتێبی (خطـط الشام)ەو، باپیرەی خەڵکی سولەیانی بووەو، لەوێ جـێگیر بووە....

ئەورووپاوە هاتبوون، ئایا بەدەنگ داخوازییەكى خەلیفەى فاتیمیەوە چون[1]، ئەوان وەلامى هیچ ملكەچییەكى ئیمراتۆرییەتى قوستەنتینییەیان نەدایەوە، تەنیا پاش ئەوە نەبێ كە پاپاى ڕۆما هەلى بۆ هەلكەوت‌و لێبوردنى گشتى دەركرد بۆ هەركەسێ بۆ (بيت المقدس) بڕوات! ئێمە ئێستا لە حالەتى لە بێژەنگدان‌و تاوتوێكردنى ورددایین، هەلبەستراوى مەزهەبى كە لەژێر دەسەلاتى هەواو ئارەزووە ڕق‌و بووغزەكانیدایە قەت بە ماددەیەك لە ماددەكانى لێكۆلێنەوەى زانستى دانانرێ‌و، كۆكردنەوەى كە لە گێڕانەوەیەكى دژ بە یەكتریش بە ڕێگایەك دانانرێ بۆ گێڕانەوەیەكى ڕووداوەكانى مێژوو.

بێگومان ڕەشەباى پەتا هەلیكرد، خۆرهەلات لە گورزى یەكەمدا مسولمانانى وریا نەكردەوە، بەلام دواى پەرت‌وبلاوییان لەژێر نسێى چوند سەركردەكى دلسۆزدا كۆبونەوەو، بە دلێرانەیەكى ڕاست كەوتنە مەیدانى بەرەو ڕووبەڕووبوونەوە، ئاینده بەشێ لە تێكۆشانى پاكى ئەوان دەبینین كە واقیعى ڕوون ئاشكراى دەكات.

---

١) لە (المنجد في الاعلام)دا (لويس معلوف)دا هاتووە: (فاتیمیەكان بەرەبابێكن دەدرێنە پالپشتى عەلى كوڕى ئەبو طالیب‌فاتیمە زەهراى -خوا لێیان ڕازى بێ- كچى پێغەمبەر ﷺ لە (٩٠٩- ١١٧١)دا دەولەتیان لە تونس دامەزراند، لە سەردەمى (المعز لدين الله)دا باكورى ئەفریقیاو میسر كەوتە ژێردەستیان‌و، سنورى دەولەتیان بۆ كەنارەكانى ئەتلەسى درێژبوویەوە، سەركردەكەى (جەوهەر)ى نارد لە (٩٦٩)دا میسریان داگیركردو، بەناوى ئەوەوە قاهیرەى دروست كردو، دەسەلاتى خۆى بەسەر سوریاو فەلەستین‌ولوبناندا گرت. لە سەردەمى ئەو، ڕۆشنبیرى ئیسلامى گەیشتە چلە پۆپەو، هانى زانست‌و ئەدەب‌و فەلسەفەیداو، بانگێشەى زانایانى كرد بۆ میسر، كە لەوێ تەنیا خەریكى زانست بن. (وەرگێڕ)

# بەر لــە سـەلاحـەددین

هەندێ لەوانەی باسی کەڵەپیاوێ لە کەڵەپیاوەکانی دەکەن هەوڵ دەدەن لە شانو شکۆی هاوشانەکانی کەم بکەنەوە، چونکە پیا هەڵگوتنیان واتە کەمکردنــەوە لــە شــکۆی ئــەم کەڵەپیاوەیــە، هەنــدێکی تــر لــە باســکردنی پاڵەوانێکــدا شــێوازی خۆبەزلزانیو زۆرزانی بەدەردەخەنو دێن ڕەخنەو هەڵە دەگرنو بەرجەستەیان دەکەن وەك ئەوەی پاڵەوانەکە قوتابیو شاگردێ بێ لە بەرامبەر مامۆستایەکەداو ڕێنوێنی دەکات، ئەمانو ئــەوانیش لــەوەی دەینووســن ســنوری حــەق دەبــەزێنن، چــونکە ڕێگایەکە لای مرۆڤی بەویژدان وون نابێ، ڕێگای تەرازووی وردە بۆ هەر کارێ، بــۆ هەر کارکەرێك بێ شانازی کردن بەیەك تاکە کەس.

سەلاحەددین کە لەمەڕیەوە قسە دەکەین، زۆر قەرزداری چاکەی کەسانێکە، کە لە باوەشیان گرتووەو چاودێرییان کردووە، ئــەویش لــە تونــدترین کاتەکانیــدا، کــە پێویــست بــوو چــاوی تێــدا بنوقێنــێ، جــا چــاودێریکردنی ئــەو مافانــەی لــەیاد نەکردووەو، لە قوڵایی دڵیەوە هەستی بەوە دەکــرد، پیاوەتیەکــەی ڕێگــای ئــەوەی لــێدەگرێ ئاستی هاوشانەکانی پشتگوێ بخاتو، هــەبووە لەناویانــدا بەشــێوەیەکی تایبەتی چاوی لێی بووەو ئاوڕی لــێداوەتەوە. تای تەرازووی مەیــدانی جــەنگ لــە شامدا لایە قورسەکەی بەر فەرەنگییەکان کەوتو، ڕۆژبەڕۆژ هیوایــەکانیان زۆرتــر دەبوو، چونکە کاتێ دەیانڕوانی لێرەو لەوێ ئەوەی دەیان بینی تەنیا ئەوە بوو، کــە هەر پەلامارێ بە خێرایی سەر هەڵدەدات بە خێرایی سەرکوت دەبــێو، نــەخوازەلا کە دەبینرا لە لایەن خۆرئاواوە بــەردەوام نەفــەر ڕەوانــە دەکــران، تــا شــوێنی ئــەو کەسانە بگرنەوە کە لە گۆڕەپانی تێك هەڵچوونەکاندا دەکوژرێن، ئەگەر هەندێ لــە

فەرمانڕەوا مسوڵمانەكانیش ڕێككەوتن‌و ئاگربەستێكی ستەمانەشیان كردبێ بۆ ئەوەبو خۆیان لە پەلامارێكی بە پەلە بپارێزن، بۆیە بە پەلـەناوی دەبـەم، چـونكە دەستدرێژییەكە هەر ڕوودەدات‌و مەحاڵ نییە، ئامانجەكانی ئەوانـەی ئاگربەستیان ڕاگەیاندبو تەنیا ئەوەبو كە ڕۆژەكان دوا دەخەن هەتا ئـەو ڕۆژەی كـە هەناسـەكان تێك هەڵدەچن.

بەڵێ تایەی فەرهەنگی قورسترو جێگیرتر بووە تا ڕۆژگار بوواری بـە دەركـەوتنی پاڵەوانی ئازا (عمادالدین زنكـی)دا دەربكـەوێ‌و، پـاش ئـەو كـوڕە پاڵەوانەكـەی (نورالدین زنكی) هات، خەڵكەكە هەستیان بەوە كرد مەترسییەك دێتە ئـاراوە، وا نیشانەكانی خەریكن سەرهەڵدەدەن‌و، لە مەیـدانی جیاجیـادا هـەوڵی بـەرەنگاری بوونەوەیاندا، هیوا دوورەكانی ئەوانی كەمكردەوە، پاشان (سەلاحەددین) هات كـە دەرگاوان هەژێنەكی گەورە بوو كۆتـایی بـەو ئاواتانـە هێنـاو، دەسـتدرێژیكارانی لەسەر لێواری چاڵێكدا ڕاگرت‌و، هۆشیاری پێدان بەو چاڵەی لەژێر پێیاندا تەقیوەتەوە ئەوانیش پەرێشان‌و سەرسام مان[1]. (عمادالدین زنكی)[2] فـەرمانڕەوای موسـڵ،

---

١) لە كتێبی (سەرهەڵدانی نەوەی سەلاحەددین‌و گەڕانەوەی قـودس، د. ماجـد عرسـان الكیلانـی و: صـادق عوسمان عارف/ ٢٠٠١ هەولێر)دا ئەوە دەردەكەوێ كە سەلاحەددین بەرهەمی بزاڤـی زۆرێـك لـە قوتابخانـە ئیسلاحخوازەكانە، وەكو قوتابخانەی غەزالی‌و گەیلانی‌و زانایانی تری ئەم بزاڤە كە گـەرم‌وگوڕی‌و نوێخـوازی بە نەوەی نوێ داوە وەرچەرخانەكی تازەی بە جیهانی ئیسلامییداو، مرۆڤی مسوڵمانی لە ستەم‌و خراپكـاری ناوخۆو دەرەكی‌و وشیاركردەوەو، فێری چاو نەقاندن‌و، لێپرسینەوەو فیداكاری‌و، وڵات پارێزی كردن.

٢) عمادالدین كوڕی (ئاق سـنقرة) لە (٤٨٧ك)دا مردووە، (عماد الدین) دێتە شوێنی ئەو سیاسـەتەكانی ئـەو ڕەچاو دەكات، (ئاق سنقره) واتە: داڵی سپی‌و حاكمی حەلەب بووە١٠٨٧ سلجوقی بووە، لە كتێبی (اربیـل بین الماضي والحاضر، ١٩٨٧م، ل٤٠)دا هاتووە: (عمادالدین زنكی) پەلاماری میرنـشینی كـوردی بـە نـاوی (هەزەبانیەكان) دەدات كە پایتەختیان لە هەولێر بووەو كە هـەر لـە سـەدەی (١١) زانییـەوە لـەوێ بـوون، ئەوكاتە تیرەیەكی‌تری كورد هـەبووە بـە نـاوی حەمیدییـە هـەردەم كێـشەیان لەسـەر دەسـەڵات هـەبووە، ناودارترین میری هەزەبانییە عیسای كوڕی موساو براكەی سەلار كوڕی موسا بووە، ئـەنجا (ابـو الحسن بـن موسك – موسا)و (ابو علی بن موسك) كە ناویان لە ڕووداوی (٤٤٠ ك)دا هاتووە، بەڵام میر ئەبو هیجای هەزەبانی (حسین كوڕی حەسەنی كوڕی موسا) لە سەردەمی سلجوقیدا ناوبانگ دەردەكـات‌و، (ابـن الاثیر) باس لە چالاكی‌و هاوپەیمانـەتی‌و بەشـداریكردنی لەگـەڵ ئـەو كێـشانەدا كـردووە كـە لـە نێـوان خولـەفای عەبباسی‌و سەڵتەنەتی سەلجوقیدا یان ئەوان‌و حاكمانی موسـڵدا ڕویـداوە لـە مـاوەی (٥٠٠–٥٢٠ ك)داو،

یەکەم کاربەدەستی مسوڵمانان بوو، سەیری مەترسییەکانی خاچ پەرستەکانی کرد وەکو سەیرکردنی کەسێکی نەفەری لێکوژراونو تالانکراوە، لەبەر توڕەیی‌و ڕق ئاگری لێ هەڵدەستا، داناو زانا بوو کە هانی دەدا بۆ ڕامان لەوەی دێت‌و لەوەی دەڕوات، چاوی بە تەواوی میرنشینە عەرەبیە لاوازو بێهێزەکانی دەوری خۆیدا گێڕا کە شەواوشەو چاوەڕوانی لەناوچوونی دەکردن‌و، لە حاڵەتێکی بەزین‌و کۆڵدان‌و پلانگێڕی دابوون‌و پارویەکی سوك بوون بەزوویی قوت دەدران، بڕیاری داو سووربوو کە دەبێ بە خۆشی بێ یان بە زۆری بێ ئەو میرنشینانە لەژێر فەرمانی خۆیدا یەك بخاتەوەو، موسڵی لەگەڵ گەورەترین وڵاتی دورگەدا یەك خستەوە، پاشان بەسەر فوراتدا پەڕیەوەو دەستی بەسەر (حەلەب)و دراوسێکانی داگرت لە وڵاتی شامدا.
لەو هێزە دڵنیا بوو لە کە لەژێر دەسەڵاتی ئەودا کۆبۆتەوەو، ئەنجا ڕاست نەچووە مەیدانی جەنگ کردنەوە هەتا بە بزاڤەکی ئاوەدانکردنەوەی گشتی لاگرەوە هەڵنەستاو، کشتوکاڵی برەو پێنەداو، ڕێگاو بانەکانی بێترس نەکردن‌و جۆگەلەی ڕانەکێشان‌و ڕێگای بۆ بووژانەوەی ئابووری خۆش نەکرد.

ئەنجا داوای لە فەقیهەکان کرد کە بە ڕۆڵی خۆیان هەڵبستن لە ڕوونکردنەوەی خەبات‌و تێکۆشانداو بانگێشە بۆ فیداکاری‌و خۆبەختکردن‌و شەهیدی بکەن، بە گەنجان‌و لاوان دەستی پێکرد کە لە لقەکانی مەشق‌و ڕاهێناندا بەشداری بکەن‌و بەردەوام بن لەسەری، هەتا دڵنیابوو لەوەی کە دەتوانێ دەست بە جەنگ بکات‌و بڕواشی بە سەرکەوتن هەیە.

فەڕەنگیەکان لە نێوان (حەلەب)و (ئەنتاکیا)دا کۆبوونەوە لە شوێنەکدا کە قەڵاکانی (ئەسارب) دەکەونە نێوەڕاستیانەوەو دەستیان کردە تاڵان‌و کوشتن، بێئەوەی بەرگرییەك هەبێ لە دژیاندا تێهەڵچێتەوە، پاشان ئەوان لە ڕۆژانی

دوای ئەمە دەنگی ونبووە، ئیمارەتەکەی کەوتە بەردەستی (عمادالدین زنکی) لە (٥٢٢ ك)داوە لە ڕەمەزانی ئەو ساڵدا گرتوویەتی هێشتاش لە هەولێر شوێنەك ماوە بە ناوی گردعازەبان کە لە (هەزبان)وە هاتووە، پەندی کوردیش لەسەر ئەسپ سوارانی هەزبانی هاتووە. (بە کورتکردنەوەو دەستکاری) وەرگێردراوە بێ لادان لە ناوەڕۆك. (وەرگێڕ)

ترسناکدا پەنایان دەبردە بەر ئەو قەڵا سەختە پارێزەرانەو، مەترسیان لە حەوشە قایەکەی نەدەکرد، (عماد) سیخوڕو هەواڵگری خۆی نارد تا بزانێ هەر لە بەیانییەوە تا شەو دادێ چی دەکەن‌و، لە ماوەیەکی وردی دیاریکراودا بۆ هێرشێکی گەورە هات کتوپڕ پەلاماری ئەو خەڵکەیدا کە هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکردو، ئەو تریشقانەی مردن کە دەهاتە سەریان شانی قورس کردن‌و، بۆ یەکەم جار ئەو جۆرە خەباتەیان کەوتە بەرچاو کە قەت نەیانبینیبوو، کاتێ دەیانبینی لاشەکانیان لە مەیداندا دەکەونە ژێرسمی ئەسپەکانەوە ترس‌و تۆقینیان لێ‌نیشت‌و، لەبەردەم قەڵاکەشدا کەسانێ دانرابوون تا ڕاکردووەکان بگێڕنەوە بۆ ناو ئاگردانەکە لە مەیداناو، ئەو قەڵایانە کەوتنە ژێردەست‌و، ناچار دوژمنەکان بۆ قەڵای سەخت ڕایانکردو، (عمادالدین)یش لە دوایانەوە بوو، ئەنجا ناچاربوون ئاگربەستێکی ئاشتیانە ببەستن‌و، (عمادالدین)یش پەسەندی کرد، بەڵام نەك بۆ واز لە شەڕ هێنان، بەڵکو بۆئەوەی کاتەکی تری گونجاوی بۆ هەڵکەوێتەوە بۆ جەنگێکی تازە.

جەنگی قەڵا یەکەم سەرکەوتن بوو، دوژمنانی شکاندو، متمانەو بڕوای زۆریان کە بە خۆیان هەبوو لە دڵیانیدا شلۆق کردن، ئەمەش لەکاتێکدا بوو بە چاوی خۆیان هێزەکی نوێیان بینی کە لەمەوپێش بەرچاویان نەکەوتبوو، بەڵکو لەوکاتەدا متمانەو ورە بۆ گەلە سەربازەکەی ئیسلام گەڕایەوە، گەر بینیان دوژمن لە ترسان ڕادەکات‌و، دڵنیابوون کە سەرکەوتن بۆوانەو، دوورنییە!

هەر چوار دەوڵەتە لاتینییەکان کۆبوونەوەکیان کردو، لەمەڕ (عمادالدین)دا ڕاوێژیان کردو لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە جەنگێکی نوێ بەرپابکەن‌و ئەو ڕیسوایەی لە جەنگی (قەڵای ئەثارب) توشیان هات بسڕێتەوەو، ئەنجا سووربون لەسەر پەلاماردانی (حەلەب)و (عمادالدین)یش پەی بەمە برد، بۆیە بە سوپاکەی تۆقی سەرکردایەتی ئەوێداو، بیری لەوە کردەوە کە نابێ هەل بەوان بدات خۆیان کۆبکەنەوە، بۆیە بە سوپاکەیەوە هەڵیکوتایە سەر (لازقییە)و، جەنگێکی خوێناوی

تێدا كراو، خاچ پەرستەكان چاكترینى گەنجەكانیان لەناویدا لەدەستداو، زیاتر لە (٧) هەزار بەدیل گیرانو، ڕاكردووەكانیش زەخیرەو تالانەكى زۆریان بەجێهێشت كە بووە كۆمەك بۆ سوپای ئیسلامی.

ئالێرەدا دوژمن پێی داگرت لەسەر ئەوە كە داوای فریاڕەسی لە پادشای قوستەنتینییە بكاتو، لە دڵی خۆشیاندا لە خراپەی تەماعو چاوتێبڕینەكانی دەترسانو، ڕویان بەمە خۆش نەبوو، بەڵكو لە نێوان دەسەڵاتی (عمادالدین)و دەسەڵاتی ئەودا بەراوردیان كردو بینییان ئەویش وەكو ئەوان هەڵگرى خاچە، پاشاكەشی ئەمەی بە بووار زانی تا هەندێ وڵات بخاتە سەر وڵاتی خۆیو، بۆیە هێرشی كردە سەر (حەلەب)و سوپای دەورەكەی، بەڵام بۆی نەگیرا، بۆیە ڕوی كردە (شیزر) كە میرشینەكی بچووك بوو، زۆر خۆماندووكردنی نەدەویستو ویستی بە سەركەوتن بەسەریاندا ئەوە بسەلمێنێ بەوانەی داوای فریاكەوتنیان لێكردبوو كە ئەو خاوەن شانو شكۆیە!

(عمادالدین) بەهۆی دووربینی خۆی لە جەنگدا حاڵی بوو كە دوژمن دەیەوێ داهاتوو بە زویی سەركەوتنەكی بە پەلەی بەسەردا بەدەستبێنێ كە زۆری تێنەچێت، زۆری نەبرد مەسەلەكەی بەلاوە ئاسان بوو، بەهۆی دانایيو زیرەكی خۆی پلانەكەی فێڵاوی داڕشت، تا بتوانێ ئەوەی لە جەنگە گەرمەكاندا بەدەستدێ ئەویش بەدەستی بهێنێت، هەڵسا كابرایەكی دانای ناسراوی ناردە لای شای ڕۆمەكان كە لەدەست فەڕەنگەكان بیترسێنێ، چونكە بە تەنیا ئەویان لە (حەلەب) بەجێ هێشتبوو، لەكاتی تێكهەڵچونیدا لەگەڵ (عمادالدین)دا ئەوان قەت فریای ناكەونو، ئەو سوپا زۆرو ئازایەی ئەویش لە توانای ئەو نییە، پادشاش بیری لەو هاتنەناوەی خۆی كردەوە كە خۆی بۆ ئامادە نەكردبوو، سەرشۆڕبونی فەڕەنگییەكانیش لەبەرچاوی خۆیدا بینی، ئەمەش وای لێ كرد كە پادشای ڕۆمەكان لەو شوێنەدا سوپاكەی بكێشێتەوە، ئا لەو كاتەشدا (عمادالدین) پەلاماریدا تابیترسێنێو، چاو ترسێنی بكات، ئەویش ڕادەكاتو هەزاران زەخیرەو

تالآن‌و تفاق لە دواى خۆى بەجێ دەهێڵێت! ئەم سەركەوتنە دەنگ‌و سەدايەكى زۆرى دايەوە لە هەردوو جيهانى ئيسلامى‌و مەسيحى داو، كۆمەڵێ پێى دڵخۆش بوون‌و، كۆمەڵەكەى تر ترسيان لێ نيشت، پاشان چى؟

(عمادالدين) هەر لە ئێستاوە شوێنى پاشماوەكان دەكەوێ لە چەند جەنگێكدا كە دوورين لە چوار ميرنشينەكانيان، هەموو ئەوانەش تيمارى سينەى ناكەن هەر چەندەش سەربكەوێت، پياوێكى ئاوا تەنيا بە بەرگريكردن لە ولآتانى ئيسلامى ناگيرسێتەوە، بەڵكو دەبێ پايتەختى خاچ هەڵگرەكانيش بڕوخێنێ كە لە هەموويان نزيكتر (الرها)يە! بەڵام ئايا كاتێ پەلامارى بدات كە سەرۆكەكەى ئامادەى پەلاماردانە!! ئەو پەناى بردە بەر پلانێ كە پێشوش فرياى كەوتبوو. سوپايەكەى بۆ دەورى (ديار بەكر)و (ئامێدى)و (حمص) برد، هەر ئەوەش هاتە پێش‌و، بە دڵنياييەوە لە ويلايەتەكەى دوركەوتەوەو بۆ سوپاكەى بەجێهێشت‌و، (عمادالدين) بۆ ئەمە لە بۆسە دابوو، هەر كە زانى ڕۆيشتووە بە پەلە هەڵيكوتايە سەر (الرها)و كەس ئاگاى لێ نەبوو، هێرشەكە ڕامالەرو گەرم‌وگوڕ بوو، (الرها— ئەڕڕەها) كەوتەوە ژێر ڕكێفى مسوڵمانانەوە، (عمادالدين) بەخشندەو پياوانە بوو، بێ سزادان شەڕنەكەرەكانى ئازاد كردو، ڕێگاى بە ژن‌و منداڵ‌و پيرەكاندا ڕەو بكەن بێ تۆڵە! هەرچەندە تەراژيدياو ناسۆرەى (بيت المقدس)ى هێشتا لە دڵيدا مابوو، بەڵام چاپۆشى‌و لێبوردەيى هەڵبژاردو لە تۆڵە خۆش بوو!!

ڕووخانى(الرها) يەكەم هۆشياريدان بوو بە نەمانى دەوڵەتى خاچ پەرستى (خاچ هەڵگرى — سەليبى)و، چونكە مسوڵمانانى هاندا بۆ بەردەوامى ئازادكردن‌و، ئاخ‌و داخى لە دڵى ڕاكردواندا هەڵگيرساند، بە زمانى تەشەنەو سەر نيشتەكردن ڕويان لە يەكترى دەكرد، بەڵام چ سودەكى هەيە! چاوەڕوان دەكرا پاڵەوانەكە ئەركى خۆى تەواو بكات‌و، هەنگاوى يەكەمى بە سەركەوتن بەڵكو بە ڕامالەڕ دەست پێكرد، بەڵام دەستەكى تاوانبارى بۆ كەوتە بۆسەوە بۆ تيرۆركردنى، بەڵام بزاڤى ئازادكردنى نەكوشت‌و، دواى ئەو (نورالدين)ى كوڕى پاڵەوانى نموونەيى بۆى دانيشتن.

(نورالدين) پێویستی بە یەك كتێب دەكات، چونكە ئەو كەسەی باسی دەكات تەنیا باس لە پاڵەوانی‌و ئازایەتی ئەو ناكات، لەمەدا ئەویش پاڵەوان‌و مەردێكی وەك پاڵەوان‌و مەردەكانی ترە كە نموونەیان لە مێژوودا دەگمەن بووە! بەڵكو ئەوانەی زۆریان باسكردووە، وتوویانە: دوای چوار خەلیفەكان كەس وەكو (عمر كوڕی عبدالعزیز)و (نورالدین) نەهاتووەو، لەوەشدا زیادەڕۆییان نەكردووە، چونكە ئاكارە جوانە دەگمەن‌و بێوێنەكانی دەبنە بەڵگە بۆ ئەوە!!

خاچ هەڵگرەكان زەندەقیان لە دەست (نورالدین) چوو بوو، كاتێ گەڕایەوە لای سۆزی پەروەردگاری، ئەوان كەوتنەخۆ بۆ بەدەستهێنانەوەی ئەوەی ڕابردوو لە دەستیان دابوو، وایانزانی بریكارەكەی ئەو ناگاتە ئاستی ئەو، پۆلی سەربازەكان هات بە گەلە كەشتییەكانیانەوە تا پاڵپشتی ئەوانە بكەن كە داوای تۆڵەكردنەوە دەكەن.

یەكێ لە كارە بێئابڕوویەكانی ژیان ئەوە بوو كە هەندێ لە فەرمانڕەواكانی ئیسلام وەكو فەڕەنگەكان وایاندەزانی (نورالدین) بێهێزو توانایە، بۆیە ڕویان كردە پەیمان گرێدان لەگەڵ خاچ هەڵگرانداو، بەوە ڕازی بوون كە سەرانە بدەن‌و ملكەچ بن بۆیان!! وە لەكاتی تەنگانەدا لەگەڵ پاڵەوانی تازەدا یارمەتییان بدەن، هەموو ترسنۆكێ كەوتە مەراییكردن بۆ دوژمن‌و، لەمەدا پێشبڕكێیان دەكرد، ئەگەر (عمادالدین) زیندوبوایە سوپای خۆی بادەدایەوە بە ڕووی ئەوان بە توورەییەوە بۆ تۆڵە لێسەندنیان، بەڵام بیروڕای (نورالدین) كاتێ كارەكەی پێ سپێدرا ئەوەبوو كە قەت كێشە لەگەڵ هیچ مسوڵمانێكدا نەكات كە یەكێ لەوانەش هەڵەشە بوو پێویستە ڕقی خۆی لەبەرامبەردا قوت بداتەوەو هەوڵ بدات بە هەموو توانای خۆی سەرنجی بۆ لای خۆی ڕابكێشێتەوە، تا دەگێڕێتەوە ناو كۆمەڵی مسوڵمانان، ئەمەش بیروبڕوایەكی نمونەیی بوو، ئەم پیاوە ئەركەكی قورسی گرتۆتە سەرشان‌و كۆمەڵێ لە پیاوانی كەوتنە ڕەخنە بەرزكردنەوە، بەڵام ئەو متمانەی بە یارمەتی خودا هەبوو، ئاوای وەڵامی ڕەخنەگرەكان دەدایەوە كە خودا قەت پشتگوێی ناخات.

وەختێکی نەیهێشت سوپاکەی لەگەڵ ئەوانە دابەزن کە دەیزانی ئەوان لە پیشەو کاری کاربەدەستەکانیان ڕازی نین. بەڵکو ناچار کراون کە بە گوێیان بکەن‌و، چونکە ئەوان پێش هەموو شتێ مسوڵمانن.

کەتیبەی تازە لە فەڕەنساو ئینگلتراو ئەڵمانیاو ئیتاڵیاوە کەوتنە ڕێگاوەو کەشتیەکان بە فەرمانی کلێسا پێشیان کەوتبوون پیرۆزباییان لێ دەکردو، مێژوونووسانی فەڕەنگی گێڕاویانەوە کە سوپای پەلاماردەر گەیشتبوو بە (١,٠٠٠,٠٠٠) سوارو پیادەو، یەکەمجار نیازیان (بیت المقدس) بوو، لەوێ نوێژی مردنیان کردو، بڕوایان وابوو کە ئەو پۆلە سوارانەو بارۆنییەکان‌و گەورە پیاوان‌و شارەزایانی سەربازی ئەوەی سوپای بێ مەشق کەوتبوونە ناوییەوی یەو ئەرڕەهایان (الرها) لەدەست دەرهێنرابوو دەشکێنن. پەلامارەکە بەرەو (دیمەشق) کەوتە ڕێگاوە بەو بڕوایەی والی‌یەکەی ئەوێ توانای (نورالدین)ی نییەو، داوای خەباتی چەکداری کردو، داوای لە سەرداری موسڵ کرد بێتە یارمەتی کە ناوی (سیف الدین) بوو ئەویش پیاوانە وەڵامی دایەوە، چونکە هەواڵی دڵتەزێنی دیمەشقییەکان ئازایەتی‌و کەڵە مێردایەتی ئیسلامەتی لە دڵدا هەڵگیرساند، (نورالدین) زانی کە پیرەمێردو منداڵەکان‌و ژنان چڕژاونە ناو مزگەوتی ئومەوی‌یەوە، لە دەوری قورئانی خەتی عوسمانیدا هاوار دەکەن‌و، بە هێمنایەتییەکی پڕ بڕواوە وتی: تکای قورئان ڕەت کردنەوەی نییەو، ئەمەش نیشانەی سەرکەوتنە، وەك بڵێی ئازایەتی‌و غیرەتی ئەوانەی لەگەڵیدا بوون دەجوڵاند.

شای دیمەشق یەکێ بوو لەوانەی هاوپەیمانی ئاشتی لەگەڵ خاچ پەرستەکاندا مۆرکرد بوو لە دژی (نورالدین)داو، لە هیکرا هاوپەیمانەکان ناپاکییان لەگەڵدا کردو پەلاماریانداو دڵنیابوو تازە تێکدەشکێ، بەڵام زانینی ئەو هاتنە گەورەیە لە هیکرایەی (نورالدین) بۆ یارمەتیدانی بە تەواوی دەروونی هەژاند، هات بە گریانەوە داوای لێبوردنی لە (نورالدین) کردو، ئەویش بە خەندەو ڕەزامەندییەوە چووە پێشی‌و، ئاگری جەنگی لە دەوری دیمەشقدا هەڵکردو باروتەکانی بە

سەرۆکایەتی شای ئەڵمانیا شکاند کە چاوەڕێیان نەدەکرد، بەڵام لەسەرخۆ کۆبوونەوەو بڕیاریاندا ڕوو بکەنە (حەلەب) بارەگای (نورالدین) کە وایاندەزانی هەموو کەلوپەلو تفاقی خۆی لەوێدا کۆکردۆتەوەو، وایان لێکدایەوە ئەگەر ئەو لەوێ نەبێو قەڵاکانی داگیر بکەن، ئەوان هەر تۆزیشیان ناشکێنن، بەڵام ئەو لە ئەوان هەنگاوی گەورەتری هەڵهێناو برایەکی (سیف الدین) کە باشترین پاڵپشتی بوو لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکی تر بە ڕەسەنایەتی (نورالدین) ئاشنابوون، سەرکۆنەی خۆیان کرد کە ڕابردوو یارمەتییان نەدابوو، بۆیە ئەوجارە بە گوێڕایەڵییەوە هاتن.

بۆیە دەڵێم لەگەڵ کۆمەڵە کەسێك، چونکە (مجیرالدین) شای دیمەشق کە سەرکەوتنەکی بۆ هێنایەدی چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد، پێی ناخۆش بوو کە (نورالدین) پاڵەوانی هەڵوێستەکەی بێ، بۆیە وای بە باشزانی پەیمانی تازە لەگەڵ (فەرەنگ) ببەستێتەوە، لەبەرئەوە نامەی بۆ (نورالدین) نووسی کە ڕازی نابێ هەندێ لە سوپای ئەو لەلای بمێنێتەوەو، لە نێوان ئەموئەودا لە شمشێر زیاتر هیچی تر نییە، لەگەڵ شمشێری هاوپەیمانەکانی فەرەنگی دایە!! ئەمە هەڵوێستەك بوو وەڵامی ئاسایی ئەوەبو کە (نورالدین) پەلەی لێ بکات، دوای ئەوەی بەرگری لە (حەلەب) کردو لە پەرچدانەوەی شەڕفرۆشاندا سەرکەوتو هیوای گەشی ناو دڵیانی ڕووخاندو، بینی کۆمەڵێ زاناو کۆمەڵە گەنجێکی مسوڵمان لە دیمەشقەوە بەرەو لای ئەو بە پەلە دەڕۆنو پێی ڕادەگەێنن کە ئەوان لەگەڵ ئەوان دانە لە دژی ئەم ناپاکە لادەرەدا، ئەگەر کارەکە بەڕاستی هاتە پێش کەس لە مسوڵمانانو فەرەنگییەکان پشتی ناگرێ، وەك ئەوەی شانسەکە یاریدەی (نورالدین) بدات، چونکە هاوپەیمانە بەدکارەکانی ڕویان تێکردو داوای کۆمەکی شەڕیان لێی کرد، لەگەڵ سەرانەی سامانداا بەرلەوەی کە وڵاتەکەی وێران بکەن، ئەمەش کارەساتێکی گەورە بوو هات بەسەریداو ڕابردوو بیری لەمە نەدەکردەوەو، وایزانی بەو هاوپەیمانییە لە شەڕانگێزی ئەوان پارێزراو دەبێ، بۆیە بە سەرشۆڕییەوە لە تاریکایی شەودا خۆی گەیاندا (نورالدین) بە گریانەوە پەشیمان بۆوە! داوای لێبووردنی لێکرد، لە دەوری

ئەم کەڵە پیاوەدا گروپەکی خەڵکی دیمەشق لە دەور بوو، کە نەفرینیان لە (مجیرالدین) دەکردو، داوایان لە (نورالدین) کرد بە توندی لە ناپاکیەکەی بپرسێتەوە، بەڵام بە بەزەییەوە گوێی بۆ گرتن‌و، دڵنیای کردن کە ئەم پیاوە بەتەواوی داماوو سەرشۆڕە پێویستە چاوی لێ بپۆشرێت‌و شەڕ لەگەڵ بریندار ژێردەستەدا نییە، نەخوازەڵا ئەوەتا گەڕاوەتەوە، دوربینی (نورالدین) ڕاستی پێکاو، چونکە فەرەنگییەکان نەیاندەزانی کە (مجیرالدین) لە ساتەکانی لێ‌قەومان‌و کارەساتدا دەچێتە لایەوە، دوای ئەوەی دوژمن پەیمانی شکاند، ئەنجا لە دیمەشق گەڕان، هەتا هەلی تازەو یارمەتی‌و کۆمەکییەکی تری تازەی ئەوروپی دێت. لەو کارەساتە تاریکەدا (سیف الدین)ی برای مرد کە پادشای موسڵ بوو، موسڵیەکان هاتنە لای کە بیکەن بە فەرمانڕەوا لە دوای برایەکەیدا، ئەگەر ئەو دنیاویست بووایەو مەبەستی دەسەڵات بووایە بە پەلە بەدەنگ ئەم ئارەزووەوە دەچوو، لەکاتێکدا کەس نەبوو بەرهەڵستکارو نەیاری بێ، موسڵ لەژێر دەسەڵاتی باوکیدا بوو، ئەو نامۆ نەبوو، بەڵکو ئەو ویستی داوای لێبوردنیان لێ بکات‌و، بە سوپاسەوە وتی: واز لە پاڵپشتیتان ناهێنم لەکاتی هەوڵ تەقەلاندا، بەڵام شوێن بۆ برای بچوکم چۆڵ دەکەم لە موسڵدا، با ئەو لە شوێنی براکەم دابنیشێت، چونکە ئەرکی تێکۆشان‌و خەبات بووارم ناداتێ موسڵ بەڕێوە ببەم. ئەمەش وەڵامەکی جوان بوو، ئەو لە توانای دابوو فەرمانڕەوایی هەڵبژێرێ‌و دیاری بکات لەژێر فەرمانی خۆیداو لە حەلەب بێ‌و، دەسەڵاتی تا لایەکانی بەغداد فراوان بێت. زۆر لە ڕاوێژکارانی ئەو لەگەڵ قسەی ئەودا نەبوون، بەڵام ئەو حاڵیکردن ئەگەر خۆی جڵەوی کارەکان هەڵسوڕێنێ ئەوە بەهێزترە، ئەنجا کەوتە ئاخاوتن لەگەڵیاندا تا قەناعەتی پێ‌هێنان، موسڵی‌یەکان گەڕانەوەو ئەو زوهدەی پادشایان زۆر بەلاوە سەرەنج ڕاکێش بوو، ئەمەش بوواری بوو بۆ هاوسەنگی کردن لە نێوان ڕێگای خۆی‌و (عمادالدین)ی باوکیدا کە باوکی وای دەبینی دانانی وڵات لەژێر مشتی یەك کاربەدەستدا باشترە بۆ یەك پێ گرتن‌و سەرکەوتن، کەچی (نورالدین)ی کوڕی

وای دەروانی کە داگیرکردنی دڵەکان باشترە لە داگیرکردنی خاکەکان[١].

هەواڵ بە (نورالدین) گەیشت کە سەرکردەی خاچ پەرست (جوسلین)ی نەسلمێن پاڵەوانی یەکەمی فەرەنگی سوپای فەرەنگی بۆ هێرشی لە داهاتوودا کۆدەکاتەوە. لە رابردودا ئەو شەخسەیە بە دیل گیرابوو و(نورالدین) دوای پارانەوە پاساو هێنانەوەو سوێند خواردن کە قەت رکابەری لەگەڵ سوپای (نورالدین)دا نەکاتەوە بە چاکی زانی ئازادی بکات!! نیازی بوولسین بە (نورالدین) گەیشت کە بە بێباکی بە ئاشکرا بەڵێنی شکاندووەو، ئەو هەواڵگری هەبوو لە سوپاکەدا بەر لە بڕیاردان لەسەر شەڕ بە نهێنی هەواڵەکەی بۆ دەگوازرایەوەو، زانی تورەیی تۆڵەسەندنەوە لە ناخی ئەو پەیمان شکێنەدا پاڵی دەدا لەناو هەموو میرنشینەکانەوە سوپای بۆ کۆبکرێتەوە، تا سەربڵند بێ بەهێزو توانایە رامالەرەکەیەوە، بۆ ئەم مەسەلەیە نامەکانی رەوانە کرد، وەك هەواڵ لە هەواڵگرانی (نورالدین)ەوە هاتووە، هەڵسا نوێژی کردو پەنای بردە بەر خودای خۆیو، داوای لێکرد لەو بەڵایەی چاوەڕێی دەکات پشتی بگرێتو، بە بیریدا هات کە بەرلەوەی (جوسلین) خۆی کۆبکاتەوە هەڵی بکوتێتە سەرو، ئەمەش دژوارنییە، چونکە بڕوای بەخۆیەو لەگەڵ دەستەیەك سوپای خۆی چووە ڕاوو شکار وەك گەشتو وازییەكو خۆڕاهێنان لەسەر ئاژەڵان بۆ جەنگی داهاتوو، وا چاکە کە دەستەیەکی سەربازی لەم چەشنەی لەگەڵدابێ لە گەشتی ڕاودا مەیدانبازی لەگەڵدا بکەنو، نەتوانن هەڵبێن. (نورالدین) بیری لەمە

---

١) لێرەدا نووسەر سیاسەتی (نورالدین) بەڕاستر دادەنێ لە سیاسەتی (عمادالدین)ی باوکی، لە (الکرد في دائرة المعارف الاسلامية، ترجمة حميد ريبوار)دا، ل ٥٤، ١٩٩٩)دا هاتووە: ((ئەتابەکە لە کوردستانی مەرکەزیدا (ناوەڕاستی کوردساتندا) دراوسێی کورد بوونو، لەو ناوچەدا ڕۆڵی بالآیان هەبووەو، (عمادالدین) چەند جاران هەوڵی داوە هێرش بکاتە سەر کورد، (١١٣٤م) ئانزای گرتووە کە دەکەوێتە لای چەپی ڕیاری بوختانێ، لەکاتی جێگیربوونی خەلیفەدا ئامێدی پشتگیریان لێکردووە، (عمادالدین زنکی) پەلاماریان دەداتو ئاکرێو شوشو شوێنی تر دەگرێو (ئەبولهەیجاو عەشسیب)و هەندێ کەسانی تر پەیوەندی پێوە دەکەنو، دوای مردنی (ئەبولهەیجاء) کێشە دەکەوێتە ناو ئەوانەی دوای خۆیو (زەنگی) ناوبژییان دەکاتو (عەشیب)دادەنێ.(قەڵاکانی چیاکانی بەناوی (عمادالدین) ناونا عیمادی (ئامێدی)... هتد. بۆ زانیاری پتر بڕوانە ئەم کتێبەو شەرەف نامە)). (وەرگێڕ)

کردەوەو، دوای نوێژ لە خوا پاڕایەوە کە ڕێگای ڕاستی پیشان بداتو لەو پلانەی ڕێنومای بوو دڵنیابوو بۆ لابردنی شەڕو، تیپەکی سەربازی هێرشبەری ئامادەکردو، کاتی بە یەککەیشتنی دیاری کرد، وەك چارەنووسی مەسەلەکە لە دوورەوە بزانێ، هەموو شتێکیش بەم شێوەیە هاتەدی کە خۆی بۆ کێشابوو، (جولسین) کەوتە داوودیلەوە، تا بە چارەنووسی خۆی بگات!! هەندێ لە ناشارەزاکان لێبوردەیی (نورالدين)یان بە بێئاگایی دەزانی لە تۆڵەیەکی یەکلایی کەرەوە، وایانزانی ئەو ڕواڵەت بینە نەك ناوسك بین، بەلاّم کاتێ بینیان چۆن توانی پاڵەوانی خاچ هەلگری بێ خۆ ماندوکردن زوو بخاتە داوی دیلییەوە، زانییان پاڵەوانێکی دووربینەو دانایە، بەلاّم بەرزی ئەو بەکارهێنانی شمشێری لەو دوورخستەوە. سیاسەتی هەر لەگەلّ (جولسين)دا ئاوا نەبوو، بەڵکو کاتێ پاشای (ئەرمەن) بەناوی (مەليح کوڕی ليون) کە دوژمنێکی تر بوو لەگەلّیدا دەبەرێکرا چوو، ئەو لەناو قەلاّ سەختەکاندا خۆی قایم کردبوو، بێ لەو قەلاّیانە چەند ڕێگای تری سەختو دژوار هەبوو بۆ بڕینیان ماندووبوونی زۆری دەویست، بۆ ئەوە تێکۆشا کە مسولّمانانی خولیای جەنگ خێرا بکات، پاشان بێترس ڕو لە قەلاّکانیان بکات، ئەنجا زەوی یە پڕ لە کۆسپەکانو سەختەکان یارمەتی سەرکەوتنی ئەو دەدەن، ئەو لەو شەڕانەدا پێویستی بە ئارامییەکی درێژ هەیە، (نورالدين) زانی ئەو دەتوانێ بەسەر سەرکردەی فەڕەنگیدا سەرکەوێ لە دوو ویلایەتی هاوسنوردا کە ئەوان لە بۆسە دابوون بۆ شەڕێکی پێکەوەیی و، ئەنجا ئەو سیخوڕی خۆی نارد بۆ زانینی ئەو هەواڵە. (مەليح کوڕی ليون) لەو تەنگاوییەی کۆڵییەوە کە لە لایەکەوە بۆی دادەڕێژێتو ئەو بە بێترسی دەزانێ، پاشان هەواڵی بۆ هات کە داوای زەخیرەو تفاقی دەکرد بۆ سوپای خاچ هەلگران کە خۆی بۆ جەنگ ئامادە کردووە، ئەو دەیزانی ئەمە پلانەو دەيانەوێ بە فێڵ ئەوەی هەیەتی لە دەستی بکەنەوە، بۆیە بە چاکی زانی پەیمان لەگەلّ (نورالدين) ببەستێ بۆ زالّ بوون بەسەریاندا، (نورالدين) پێشوازی لە پەیامنێرەکەی کردو پەيانی دایە ئەگەر ئەو بە تەواوی بێلایەن بێ ئەو خۆی تێناگەینێ،

(نورالدین) بەمە گرەوی خۆی بردەوەو جەنگەکەی بێ خوێنڕێژتن کـردو فـەرەنگی زوو زانیان کە (مەلیح کوڕی لیون) پەنای بردۆتە بەر (نورالـدین)و تـازە بۆتـە لای ئەوانو پێی نـاوێرنو نـاتوانن زەفـەری پـێ ببـەن! ئـەم پاڵەوانـە بێوێنەیـە کـارە جەنگیەکانی بە شکانی چاکسازی ناو خۆی لەیاد نەبردووە، چونکە ئەم چاکسازیە پاڵپشتی یەکەمی خەباتی دەرەوەیـە، بۆیـە پـردی هەڵبەسـتنو بـە دروسـتکردنی قەڵاکانی کۆتری نامەبەر هەڵسا لەسـەر ڕێگـاو بانەکانـداو، تـا ئەگـەر لـە هـەر وڵاتەکی ئیسلامیدا مەترسی سەری هەڵدا ئەو کۆترانە ڕۆڵی خۆ دەبینن تا ئەوانەی دورن یارمەتی ئەوانە بدەن کە کەوتونە ناو تەنگانەو کارەساتەوە، دیـسان بایـەخی بە کشتوکاڵو بازرگانی داو پارەی بارمتەو فیدیەی وەردەگرت، تـا بەشـێکی زۆری بۆ ڕۆڵی نەخۆشخانەکانو پەناگەکانو قوتابخانەکانو مزگەوتـەکان خـەرج بکـاتو، هەمویان لە بایەخ پێداندا لە یەك ئاستدا دادەنان. (ابن الاثیر)[١]

باسیکردووە کە هەندێ لە برادەرانی خـۆی وتیـان خەرجەکـەی بـۆ قوتابیـانو خوێندکارانو قورئان خوێنەکانو فەقیهەکان زۆرە بە وردی وتی وەڵڵاهی تکام وایـە من بەهۆی ئەوانەوە سەربکەوم، ئێوە بـە لاوازەکانتـان سـەردەکەونو، ئەوانـە بـە سـکاڵاو نزاکانیـان لـە نوێژەکانـدا جـەنگ دەکـەنو بـڕوای قایـمی ئـەوان لـە گۆڕەپانەکانی جەنگدا کە مردن لەوێیە هانییان دەدا بۆ خۆڕاگری کـردن، سـوپای خاچ پەرست هەڵیکوتایە سەر کە چەند قاتی ژمارەی ئەوان بوو، جەنگەکە ئەوەندە گەرم بوو سوپاکەی زۆریان ناچاردەبن پاشەکشە بکەن، بـەڵام (نورالـدین) پێـی لـە زەوی هەڵنەگرتو لەگەڵ کۆمەڵەکی زۆر کەم سەقامگیر بوو دەستی شل نـەدەکرد، کاتێ خاچ هەڵگرەکان ئەوەیان بینی، کـە (نورالـدین) بـەم ژمـارە کەمـە جـەنگ دەکاتو نابەزێ وتیان: ئەوە پلانو فێڵە ڕەنگە مەبەستیان پـەلاماری تـر بـێ کـە

---

١) مع الابطال، محمد رجب البیومی، ل ١٠١) بە پوختکردنەوە لە قسەکانی (ابن الاثیر) کـە لـە (الکامـل)دا وتونی. (نووسەر)

ئەوان ئاگایان لێنەبێ. ئەوان وتیان با خۆ رزگارکردن هەڵبژێرین‌و، بە پەلە رایانکردو کشانەوە، (نورالدین) بەم هۆیانە سەری سوڕما، بەڵام ئەم سەرسوڕمانیەی بە نوێژی سوپاسگوزاری بۆ خودا پچڕاند.

خاچ پەرستەکان (دمیاط)یان داگیرکردو، هەواڵی ئەمەی پێگەیی‌و، ئەویش ترسا[1] چووە مزگەوت نوێژو دوعای دەکرد، پاشان لە مزگەوت دانیشت بۆ گوێ گرتن لە وتارو وتەی زانایەکی ئایینی لە مزگەوتداو، ئەنجا باسێکی گێڕایەوە کە گوێگران بخاتە بزەو خەندەوە، بەڵام (نورالدین) هیچ خۆی سڵ نەکرد، بۆیە ئەو کەسەی لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو لێی پرسی بۆچی تۆ پێ نەکەنیت؟ پاڵەوانەکە لە دۆڵەکی‌تردا بوو، بە گوێکرەکانی ڕاگەیاند وەڵڵاهی من شەرم لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەکەم کە لێوەکانم پێبکەنن‌و مسوڵمانانیش لە (دمیاط)دا گەمارۆ درابن!

وتم (نورالدین) پێویستی بە نووسینەکی سەربەخۆ هەیە، بەڕاستی چەند کتێبی تایبەتی لە بارەوە نووسراوە، بەڵام زۆربەیان گێڕانەوەی بەسەر هات‌و سەرگوزشتەی مێژوویی یە، بێئەوەی چووبنە ناو بنج‌و بناوانی قوڵاییەکەیەوە، پەندو ئامۆژگاری لێوەرگرتن‌و پێشکەشی خوێنەرانی بکات بۆ بەرگریکردن لە پیاوەتی ئەو بەرزکردنەوەی پلەی ڕەوشتی ئەو، قسەکان ناوەڕۆکیان پێویستییان بە راڤە نییە،

---

١) (دمیاط) شارەکە لە میسر لەسەر ڕوباری نیلەو، پارێزگایەکەو، (٧٢٠٠٠) کەسەو، خاچ هەلگرەکان گەمارۆیان داو لە (١٢١٩– ١٢٢٠ ز) ڕزگاریان کرد. بە کورت کردنەوە لە (المنجد في الاعلام) وەرگیراوە. (مصر)یش ئێستا بە دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی ناوزەد دەکرێت‌و، دەکەوێتە باکوری خۆرهەڵاتی ئەفریقیاوەو (١٢٥) پارێزگایە (٦٦٠٥٠٠٠) کەسە، بەر لە ئیسلام وەکو لە سورەتی (یوسف)و (القصص)دا هاتووە قیبتییەکان‌و بەنو ئیسرائیلییەکانی تێدا نیشتەجێ بووە. ئەم ناوچەیە لەگەڵ سوریاو فەلەستین دا وەکو لە قورئان‌و کیتابی موقەددەسدا هاتووە پڕبوون لە باخچەو باغات‌و گەنم‌و جۆی لێکراوەو، ڕەزو مێوی هەبووو، خاوەن سامانەکەی سروشتی ئەوەبوون. بەڵام ئیمڕۆ بە پێچەوانەوە ئەم ڕویە سروشتی یەیان نەماوە، بڕوا وایە سوریا فارسەکان دوای داگیرکردنی وێرانیان کردبێت. ئەوانی تریش خاکیان توشی داماڵین‌و ڕوتانەوە بووە ناتوانرێ چاك بكرێتەوە. (بڕوانە الجیولوجیة البیئة، ادوارد کیلر، ت: د. غسان محمد السبتي، ل ٦٣). (وەرگێڕ)

بەڵام مێژوو بۆ سەرمەشقی‌و پەند دەخوێنرێتەوە، نەك هەر بۆ زانینـــی ئـەوەی کـە رویداوەو بەس! قەت پلان تەواو نابێ هەتا لە مــاوەی رووداوەکــی نایابــدا بــەڕێوە نەبرێ‌و شیتەڵی هزری لەگەڵدا نەبێت، نەك بە خوێن گــەرمی‌و کــارایی وتاربێــژی، ئەمەش لە نووسراوی پیاوچاکاندا لەکاتێکدا دەیانخوێنیتەوە کەمە.

(عمادالدين زنكى)و (نورالدين)ی کوڕی پێشەکییەکی جوان بــوون بــۆ (صــلاح الدين)، بە رۆیشتنمان بە شــوێن هەڵوێــستەکانی جــوانی ئــەم دوانــەدا لــە چــەند زنجیرەیەکدا کە تەواوکەری یەکتری بن بە دوای هەڵوێستی (صلاح الدين)دا دەچین‌و، بێ پچڕاندن خوێنەری بەڕێز لە چەند زنجیرەیەکدا دەیبینێ!

من ناڵێم نووسەر هەرچی ڕوویداوە باسی دەکات، بەڵکو ئەوە هەڵدەبژێرم لــەناو رووداوەکاندا کە هۆیەکی قایــمیان لە رووداني رووداوەکانداو، چاوگی هێز بوون لە دیاریکردنی چارەنووسدا.

# خێزانێکى دلێرو نەبەز

لادێ نشینو کوردو بەربەر⁽¹⁾ کە چەند گەلێکن لەسەر ئازادىو هێزو بازو سروشت بوونو ئەوپەڕى ئازایەتىو دلێرىو چاکەکارى کە هەیانە دەیبەخشن بێگەڕانەوە، چونکە سروشتى سەرەتاییان بەردەوام زاڵە لەسەر گیانیانو، ئەوان بێ درۆو فێڵ وەلامێکى ڕاستت دەدەنێ لەوەى دەتەوێت، مەگەر وابەستە بوون بە پیاوانى ڕامیارییەوە، ئەوکاتە بەشێوازى دبلۆماسى چاویان دەبێتەوەو لە شێوەکانى فرتوفێڵ تێدەگەن، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستو ڕەوانو بێ پێچوپەنان، بۆیە ئەوە دەڵێم تا ئاشنایەتى لەگەڵ ژینگەى کوردیدا پەیدا بکەین، کە خێزانى سەلاحەددین لەناو بازنەکەیدابوو، بەرلەوەى بێتە ژیانەوە دەورویەرێك بوو لە ژینگەى عەرەبى لادێیى دەچوو لە ئازایەتىو پیاوەتىو شکۆییو نازینو ناودارى بە بەخشەندەییو سەخاوەتو لادان لە کارى سوکەڵەیى، ئەگەر سروشتى یان شێوازەکانى جەنگى تازەیان زانیبایەو، ئامێرە لەناوبەرەکانى ئەوانیان هەبوایە هیچ گەلێك نەیدەتوانى خۆیان لە بەرامبەردا رابگرێتو، ئەوان پیاوو گیانفیداو دلێرو چاونەترس، بەلام هێزى جەستەیى لە مەیدانەکانى جەنگدا هەموو شتێك نییە.

ئافرەتانى کورد وەکو پیاوەکانیان بە ئازایەتى ناوبانگیان پەیدا کردووەو، ئافرەت شانبەشانى پیاو دەجەنگێ، هۆزەکە وانەى سوار چاکى فێردەبێ بۆ هێرشو بەرگرى بۆ چاوەڕوانکردنى هێرشێکى کتوپڕ، یان چاوەڕێکردنى یارمەتى، دانەکى

---

1) بەربەر: وەکو لە (المنجد في الاعلام)دا هاتووەو ئێمە کورتى دەکەینەوە: بە دانیشتوانى ئەفریقیاى باکور دەوترێ لە (بەرقە) وە بۆ (زەریا) کە بەر لە بە عەرەب بوونیان بە زمانى تر دواوون، بەلکو هەتا ئێستا هەروایە.

بەڕێزانەی هاوپەیمانێ کاتێك داوایـان لێـدەكات، بۆیـە فـەرمانڕەوایی دەكـات لـە دەوریاندا پەیوەندیان پێوە دەكردن تا پیاوانێ لە ئەوان وەربگرن بە بەشێ لە سوپای ئەوان لە جەنگدا. ئەوان بە کەسانی بێ پێچو پەناو وەفـادارو بـە سـفەتو دڵسۆز ناسراونو، ئەوان زیاتر جێگای دڵنیاییو بێترسی بوون لەو خزمو کەسوکارانەیان کە هەسـتی بەربـەرەکانییان تێـدابوو کـە سەردەکێـشێ بـۆ دووبـەرەکی، لەکاتێکـدا (فارسەکان) ویستیان کورد بخەنە ژێر گوێڕایەڵی خۆیانەوە.[1]

بینیان یاخیو سەختو پیاو ئازان، بۆیە پەنایان بـردە بـەر ڕێگـای ئاشـتیانە، چونکە ئەوکاتە نەیاندەتوانی بەسەر گەلێکدا سەربکەون کە شەوانە رامـاڵ ببـەنو، لە ڕۆژدا پشت بدەنە چیاکانو، ئەم سەرکەوتنەیان ماوەیەکی درێژ بۆمایەوە لـەناو هۆزە کوردەکاندا سەرۆکی هۆزەکە (شادی) دەرکەوت کە باوکی ئەم دوو پاڵەوانەیە (ئەییوب)و (شێرکۆ)و باپیرەی (سـەلاحەددین)ی کـوڕی ئەییوبـە کـە پاڵـەوانێکی ئازابوو فارسەکان ویستیان بیکەنە پیاوی خۆیان، بەڵام ئەو قایل نەبوو، بەڵکو ئەو تەنیا بۆ قسەیەك گوێڕایـەڵ دەبـێ کـە ئەوبـە راسـتی بزانێـت، بۆیـە ئـەوانی بـە جێهێشت چووە ناو ژیانی خێڵەکەیەوە لە (دووین)و، پاشان پەیوەنـدی دۆسـتایەتی لە نێوان ئەوو (مجاهد الدين بەهرۆز)دا دروست بـوو کـە پیـاوێکی بـە هیممـەتو چالاك بوو، ناوی (شادی) بیستبوو، ئەویش هەڵیبـژاردو کـردی بـە یارمەتیـدەری خۆی لە کاروباری سیاسی خۆیدا لە عێراقداو، ئەو سەر بە دەسـەڵاتی (مەسـعودی سلجوقی) بوو، لەو هەرێمەدا بە ئەمیندار دانرابوو کاری ئەوە بوو کە لـەناو هـۆزە

---

١) یەکەم ئیمپراتۆریەتی گەورەی کورد کە فارسەکان بە سەرکردایەتی کورش ڕوخانیـان دەوڵـەتی میدییـەکان بوو لە (٥٥٠ پ ز)دا کە دەستوری زەردەشت پێغەمبەریان پیادە کردووە. وەکو لە کتێبـی {زەردەشـتو زەردەشتیەکان}دا کە بە ویستی خوا بەمزوانە چاپ دەکرێ ڕوونمانکردۆتە وە. (مەسعود محمد) لە کتێبـی (لسان كرد/ ل: ١٩)دا دەنوسێ: {مادیەکان یان میدیەکان باپیرەی سەرەتای کوردەکـانن کـە لـە ئێرانـدا نیشتەجێ بوون}. لە (كتاب المقدس/ سفر التكوين/١٠/ ٣)دا میـدی کوڕێکی یافثی کوڕی نوحە. هۆکاری سەرەکی ڕووخانی ئەم دەوڵەتەش وەکو لە کتێبی مێژووی کوردو کوردستانی/ شكرالله بابان دا هاتووە بـۆ ئاستیاکی پادشای مادی دەگەڕێتەوە کە دەستی دایە ستەمو بەردانی جڵـەوی حـوکم. وە بـڕوا وایـە ئـەم ئەژدیهاك بۆ بێت. (وەرگێڕ).

ئاوارەكانـدا بـە شـوێن مرۆڤـى ئـازادا بگـەرێ، تـا بـۆ جێگیركردنـى ئاسـایش یارمەتیدەریان بـن بێگوێـدان بـە مەبەسـتى ناكەسـایەتى، چـونكە ئـەو كەسـەى هاونیشتمانى (بەغداد)بێ خاوەن هۆزێكى ناسراوە لایەنى ئەو هۆزە دەگرێو ڕەنگە ئەو كەسەى نەیارى ئەو هۆزەبێ بیخاتە ناو تۆمەتى بەتاڵەوە كە بەرەو كێـشەیەكى درێژ ڕایدەكێـشێ، بـەلام بابـاى نـامۆو میـوان لـە كوردەكـان هـیچ كامـێ لـەو مەبەستانەى نییە، جگە لە سەقامگیركردنى ئاسایش نەبێت.

(شادى) پاڵەوان چالاكىو هیممەتى بـەرزى خـۆى نوانـد بـۆ سەرەنجڕاكێـشانى خەلكى بەرەو لاى خۆى داو، (مجاهد الـدین بـەهرۆز) واى ڕووانـى كـە كارمەنـدى ئەوبێ لە (تكریت)و، لەگەڵ دەستەیەك لە گەلى كوردى خۆیدا بەكارەكەى هەڵـسێ كە سروشتو ڕەوتى ئەوانى دەزانىو، هۆكـارە ئاسایـشییەكان بپـارێزنو، كێـشەو ناكۆكییە دژوارەكان لەناو ببات و، جگـە لەمـەش هـەردوو كوڕەكـانى (ئـەییوب) و(شێركۆ) كە هەردوو گەنج بوون بە ئازاو دلێر ناویان دەركربوو هەردووكیان دەبـن بە قۆڵو بازووى ئەو، بەم چەشنە (تكریت) بوو بە مەڵبەندێكى هێورو ئاسایش بـۆ ئەو خێزانەى لە (دوین)ە وە هاتووە.

كێشەو دەبەرێكرا چوون لـەم ولاتـەدا رووەو نـەمان نـەبوو، (بەغـداد) خۆشـى سەرگەردان مابۆوە لەوەى نـەیارانو كێبەركێكـەران دەیكـەن، كاتـێ شـادى بـووە فەرمانڕەوا لەگـەڵ جووتـە كوڕەكانیـدا، كـورد هەسـتى بـەوە كـرد كـە ئەوانـەى كاربەدەستن هاو رەگەزى خۆیانن، بۆیە چـوونە ژێـر فـەرمانى ئەوانـەوەو لـە سـەر ئەوانیان دەكردەوەو لە مەترسىو رقى ئەوانیان دەپاراستن. (شادى) كۆچـى دوایـى كردوو، دوو لە رۆڵەكانى مانەوە كە سەرۆكایەتى گەلەكەیان بكەن، بێئـەوەى هـیچ برایەك لەو دوو برایانە دەستدرێژى بكاتە سەر ئەوى تریان، (ئەییوب) كە برا گەورە بوو چاودێرى مافى براكەى دەكردو چاو پۆشى لە هەڵەكانى دەكرد، وەكـو هەڵـەى پەرۆش نەبوونى بە رازیكردنى (بەغداد) كە شوێنى شەڕەقسەیە وەكو ئاینده دێتـە پێش. قەزا وابوو (عمادالدین) پادشاى (موسڵ) بە سوپایەوە پـەلامارى (بەغـداد)

یدا بۆ شەڕکردن لەگەڵ خەلافەت‌و لابردنی دا، سوڵتانی (سەلجوقی) پشتگیری لە داخوازی ئەو کرد، هەرچی خەلافەت بوو داوای یارمەتی لە (فارسەکان) کرد دژبە (تورکەکان)و، ئەوەبوو (عماد الدین) بەزی‌و بۆ (تکریت) رایکردو، پەنای بردە لای (نجم الدین ایوب)، ئەویش پیاوەتییەکەی‌و مەردایەتیەکی هانیدا یارمەتی بداتو، کەشتیگەلێکی بۆ داناو پەڕینەوەی بە دیجلەدا بۆ ئاسان کرد بۆ (موسڵ)، ئەمەش کارێکی بە پەلە بوو (نجم الدین) سەیری ئاکامەکەی نەکردبوو، وا پێویست بوو ئەو نوێنەرایەتی کاربەدەستی (بەغداد) بکاتو، وە فەرمانڕەواکەی لەوێدا، (عماد الدین زنکی) دوژمن بووەو جەنگی لەگەڵ خەلیفەدا کردووەو ویستوویەتی بیڕوخێنێت.

(مجاهد الدین بەهرۆز) لەم کارەی ئەو نکۆڵی کردو دانی پێدا نەهێنا، لێرەدا لە جیاتی ئەوەی هەڵسێ بە گرتنی‌و لەگەڵ پاسەواندا بیگوازێتەوە بۆ بارەگای خەلافەت چۆن لە تەك ئەودا دەوەستێ! هەڵوێستێك کە بۆ (بەهرۆز) زۆر دژوار بوو، چونکە دوور نیە خەلیفەو داروودەستەکەی وابزانن ئەویش پاڵپشتی کارەکەی (ئەییوب)بووەو پارێزەرو چەپاڵەدەری ئەوبووە، بۆیە (بەهرۆز) نامەیەکی بۆ (نجم الدین ئەییوب) نارد کە سەرزەنشتەو سەرکۆنەی کردبوو ئاگاداری ئاکامێکی خراپی دایە.

کاتێ (اسد الدین) پیاوەکی ماقوڵی تکریتی کوشت بەهۆی کێشەیێ کە لە نێوانیاندا روویدا تراژیدیاو گەرماساتەکە گەورەتربوو، کارەکە بۆ (بەغداد) بەرزکرایەوە، ئەمەش لەکاتێکدا بوو خۆی سازدەکرد بۆ کارێکی یەکلاکراوە لە دژی (نجم الدین ایوب)و برایەکەی (اسد الدین شێرکۆ) دا. ئاسایی بوو کە هەردووکیان هەست بەوە بکەن کە بۆیان سازدەکرێ، بۆیە سووربوون لەسەر بەجێهێشتنی (تکریت)و چوون بۆ موسڵ. (عمادالدین) هەواڵی ئەوەی پێگەیشتبوو کە بۆچی ئەوانە لەم دوانە بەرقداچوون‌و لێیان توڕەبوون‌و، گومانی باشی پێبردن، بۆیە بەخێرهاتنی گەرمی لێیان کردو، رووبەرەکی گەورەی بۆ دابڕین‌و، بوون بە

سەربازێكى ئەو، (عماد الدين) دووربناس و سەرناس بوو لەناو خەڵكيدا، بە دووربينى خۆى بنەچەى ئەو دوو پەناهێندەيەى دەزانى و پەى بە پلەى سياسەتى بەرێوەبردنى ئەوانەو دلێرييان لە جەنگدا دەبرد، بۆيە لە ريزى پێشەوەى راوێژكارانى خۆيدا داينان و، دەينياردنە ناو جەنگ و پێكدادان، بەمە سەر ناسيەكەى راست دەرچوو، ناوبانگيان لە موسڵ و ئەو ناوچانەى سەر بە ئەوێ بوون دەركردبوو، بەم گەشتە پيرۆزە زەمينە بۆ ئەو خێزانە خۆش بوو كە بە زوويى بگەنە پلەى سەركردايەتى و دەسەڵات.

مێژوونووسان باس دەكەن كە (صلاح الدين) لەو شەوەدا لەدايك بوو كە (نجم الدين ئەييوب) بارى كردووە بۆ (موسڵ)و، بە سوارى ولاخ هەڵيگرتووە بەدواى چارەنووسى نادياردا گەڕاوە، چونكە نەيدەزانى (عماد الدين) چۆن سەيرى دەكات، تا وتراوە لەو كاتەيدا وتوويەتى: خۆزگە قەت لەمبارە ناهەموارەدا منداڵم پەيدا نەبوايە، نەيدەزانى خوداوەند ئامادەى كردووە تا ببێ بە سەركردەيێ بۆ سەرجەم ميللەت، تا بەرەو دەشتايى رزگارييان ببات!

ئەم جوتە برايە لەوە بێئاگا نەبوون (واتە شێركۆو ئەييوب) كە ئەوان لەبن سێبەرى پاڵەوانێكى جەنگاوەردان و شوێنى ئەزموون و تاقيكردنەوەى ئەون و پێويستە ئەوەى پێ بسەلمێنن كە ئەو پێويستى بە ئەوانە بەر لەوەى ئەوان پێويستييان بە ئەو هەبێت. ئەو ئازايەتييەكى بۆماوەييان بۆ ماوەتەوە كە هانياندەدات بچنە ناو جەنگ و كارەساتەوە، لە جەنگە سەرەتاكاندا (عماد الدين) خۆشى لەگەڵياندا بوو پياوەتى و گەورەيى ئەوانى بينى و سەيرى كرد ئاستى شياوييان زۆرەو ئەوانيش زانييان كە سەرۆكەكە متمانەى بە كەسانێكە لەكاتى ئاشتيدا خۆيان بە دڵسۆزى پيشان دەدەن، كەچى لەكاتى جەنگ و كارەساتدا ئەوپەڕى توانايان و ئەركيان خەرج ناكەن و، ئەوان نەچوون ئەو خاوى و سستييە بە (عماد الدين) ڕابگەيەنن، بەڵكو ويستيان لە ڕێگاى ئامۆژگارييەوە كە لەسەر هەموو سەربازو پێشمەرگەيەكى مەيدانى جەنگ پێويستە جۆش و خرۆش بخەنە

دڵیانەوەو بیان وورووژێنن.

(عماد الدین) لە ڕێگای ترەوە بێ لەو ڕێگایەی خۆیان پیشانیان دەدا دڵسۆزی ناودڵی ئەوانی زانیو، بۆیە پیاوی پلەیەك بوون لەلای ئەو، شایەد هەر لە تکریت لەلایەن (عمادالدین)و ئەو دوانە لە نێوان ژیانیانو فرە چالاکیاندا هەڵسەنگێنرا بن، ئەو دوانە بینییان ئەوان وەکو ئەوکەسەی وان لە گوندێکی دوورەوە دەڕواتە ناو پایتەختێکی پێشکەوتووەوە، دیسان لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەڵدەستنو دادەنیشتن کە لەلای (عماد الدین) بوون لە فەقیهو قازیو زانایان، سا ڕووداوەکانی ڕابردوو واقیعی ئەم سەردەمە تێگەیشتنو بە شێوەیێ ڕۆشنبیر بوون کە ڕابردوو لێی بێئاگابوون، بە شێوەیێ هیوایان بەوان زۆر بوو کە قەت چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکردو، منداڵەکەش لەسەر بێشکەو (لانکە)کەیدا نەرمو نۆڵ بچوك بوو نەیاندەزانی چ ڕۆژەکی ڕووناکی دەبێت لە داهاتودا.

دوای ئەوەی (عماد الدین) کارەساتەکەی (نجم الدین ئەییوب)ی بینی وای بە باش زانی بیکات بە دەسەڵاتدار بەسەر (بەعلەبەك)دا دوای ئەوەی خاچ هەڵگرەکانی تێدا کردە دەرەوەو کارامەیی جەنگیو بەڕێوەبردنی هەر دووی تێدا بینی، بەعلەبەکیش مەڵبەندێکی ترسناکی خاچ هەڵگرەکان بوو، هێزی خۆیان لەوێدا کۆکردبۆوە بۆ پەلاماردانی (حەلەب)و (دیمەشق)و، ڕوخانی ئەوانە بەدەستی (عماد الدین) واتە هەرەسهێنانی پاڵپشتێکی بەهێز کە کۆمەکی دوژمن دەکات بە ئازوقەو سوپا لەکاتێکدا هێرش دەکەنە سەر یەکێ لەو دوو شارەیە، (نجم الدین) ئەوەی چاوەڕێ دەکردو شەوو ڕۆژی تێکدەکردەوە بۆ ئامادەکردنی گیانی گشتی گەل بەمەبەستی ئامادەکردنی تفاقو ئازوقە بۆ سوپا، داواشی لە (عمادالدین) کرد بۆ ئەم مەبەستە یارمەتی بداتو، ئەویش چی پێویست بایە بۆی ڕەوانە دەکرد.

(نجم الدین) تاڕاددەیەکی باش ماوەیەکی زۆر لەم شارەدا مایەوەو، (سەلاحەددین) لەوێدا گەورە بوو فێری وانەکانی جەنگو هونەرەکانی بوو کە ئەمە

بۆ (نجم الدین ئەییوب)ی باوکی نەڕەخسابو، چونکە ئەم دوانە هەردوکیان لە لادێدا گەورە بووبوون[1] کە لەوێدا بۆ جەنگ کردن پشت بە زیرەکی سروشتی دەبەسترێت، بەبێ وەرگرتنی هیچ وانەیەکی ڕێك وپێك، دیسان ئەوەی بۆ سەلاحەددین ڕەخسا بۆ فێربونی زانستو مێژوو لەسەر دەستی گەورەزانایـان هەر لـە تـافی منداڵیـدا بـۆ باب‌و مـامی نەڕەخـسابوو، ئەمـەش شـارەزایی جـەنگی زیـاتری پێـدا، چـونکە خوێندنی مێژووی ئیسلامی سەربڵندی بە دەروونی بـڕوادار دەدات، کاتـێ قوتـابی تازە پێگەیشتوو دەزانێ کە سوپای ئیسلام دوو وڵاتی گەورەی ڕزگار کـردووە، یـان دوو ئیمپڕاتۆریەتی گەورە لە سەردەمی یـەك خەلیفـەدا بـە چـەكداریو بڕوایـەكی چەسپیوەوە.

(اسد الدین) هەرلەناو دەستو پەیوەندی (عمادالدین)دا مایەوە لە موسـڵداو، لە هەموو کارو بارێکدا ڕاوێژو پرسی پێدەکردو، بە قاسیدو پەیامنێری دەنـارد بـۆ شوێنکەوتوانیو دوژمنانی، ئەمەش مانای متمانە پێبون بووە، بـەڵام وەکـو (نجم الدین)ی برای میرنیشنێکی تایبەتی سـەربەخۆی نـەبووە، ڕەنگـە (عمـاد الـدین) پشتگیریو پشوودرێژی (نجم الدین)ی تێبینـی کردبـێو بـە شـایەنتری زانیبـێ بـۆ حوکمکردن لە میرنیشنێکی تایبەتیدا،و لە (اسدالدین)دا گیانی بەرگریو پەلامارو تۆڵەی پەی پێ بردبێ کە لەناو یەك ڕیزدا لـەناو دوژمنـدا پەرتـەوازەییو نـاکۆکی پەیدادەکات، بۆیە وای بە چاکزانی لە ژێر فەرمانی خۆیابێ نەك سەربەخۆ بێت.

کاتێ (عمادالدین) ماڵئاوایی لە دنیا کرد، کوڕە پاڵەوانەکەی (نورالدین) هـات کە ئەو زۆر لە باوکی ڕازیبوون خوشنودی خۆی لـە بەرامبـەر ئـەم دوو پاڵەوانـەدا دەخستە ڕوو، چونکە لێبوردەو کراوە بـوو، شـتی بـە گومـان وەرنـەدەگرت، چـی

---

١) لە کتێبی (الكرد في دائرة المعارف الاسلامية/ جماعة من المستشرقين/ ت: حميد ريبوار/ ل:٥٥)دا هـاتووە: {سەلاحەددین} لە تکریت لەدایك بووە، بابو باپیری فێری دابو نەریتی کوردییان کردووە. لـە مێـژووی گەلی کورد/ صالح قەفتان دا (ل ١٧٦)دا هاتووە کە باوکی مامۆستای تایبـەتی بـۆ ڕاگرتبـوو، قورئـانو، صەرفو، نەحوو، عیلمی حدیثو مێژوو نینشای پێ فێرکراوەو زانینی فەقێتێتی خوێندووە هەرەتی لاوەتی لە شاما ڕابواردووە. (وەرگێڕ) .

بۆخۆی دەویست لە سوڵتەو دەسەڵات بۆ سەربازەکانیشی دەویست، بەبێ خۆ بەگەورە زانینو فیز، ئەم شێوە گیانە پاکەش وا لە مرۆڤی چوستو بە توانا دەکات بە ئاسانی لە مەیداندا دەربکەوێ، چونکە خراپترین کار لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا ئەوەیە کە سەرکردە ڕقی لەو کەسانە بێتەوە کە خۆی کردونی بە کاربەدەستو هۆشیارنو بە هەوڵی دڵسۆزی خۆیان لە ژێر بەیداخی ئەودا ئاستی بەرز بەدەست دێنن، لەکاتێکدا شکۆی جەنگاوەری دەستەبەر دەکەن لە ڕووی لۆژیکەوە پێویستە شوێنی ئەوانە لای فەرمانڕەوا بڵندتر بێت، بەڵام ئێرەیی لە دەرکەوتنی لە هیکرا کتو پڕ تەرازووە کە ئاڵوگۆڕ دەکاتو تۆمەتو تاوان دەدرێتە پاڵ کارمەندی دڵسۆز، هەموو شکۆیەکی لێدەسەنرێتەوە، ئەمەش ئەگەر هاتو نەکوژرا یان لە تاریکایی زیندانییەکاندا فڕێ نەدرێت.

ئەمە لەسەردەمی (نورالدین)دا ئەم کارانە نەبووەو هیچ ڕێگایەك نیە بۆ ئەم گومان بردنە، چونکە خەمی گەورەی یان هەموو خەمی ئەوە بوو کە خاچ پەرستەکان بکاتە دەرەوە، بێئەوەی گوێ بەوە بدات کە کێن ئەوانەی دەریان دەکەنو کێن ملوانکەی ستایش بەدەست دێنن (نجم الدین) بەرەوڕووی گرەفتێکی سیاسی بۆوە کە بووە هۆی نەمانی حوکمی لە بەعەلبەکدا، ئەمەش لەکاتێکدا بوو (معین الدین) فەرمانڕەوای دیمەشق بۆی لە بۆسەدا بوو، سوپای ناردە سەر بەعلەبەك تا ئەوانیش بخاتە سەر دەسەڵاتی خۆیو دوور لە دەسەڵاتی (نورالدین) بێ، هێزی (معین الدین) لە دیمەشقدا لە شارێکی بچوکی وەکو بەعلەبەکدا ژمارەی هێزو تفاقی پتر بوو لە هێزی (نجم الدین)، ئەو کەسێکی ناردبوو بۆلای (نورالدین)داوای کۆمەکی بکات، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێ کۆمەکییەکە دواخرا.

هەندێ مێژوو نووس هۆکارەکەی بۆئەوە دەگێڕنەوە کە (نورالدین) لە سەرەتای حوکمیدا سەرقاڵی هێورکردنەوەی شۆڕشگێڕەکان بووە لە موسڵدا لە دژی ئەودا، یان خەریکی هێرشێکی کتو پڕ بووە بۆ سەر سوپای خاچ پەرستی کە لە شامدا لە نزیك (حەلەب)دا زێدی حوکمی ئەودا خۆی مەڵاس دابوو، هەرکەس ژیاننامەی

(نورالدین) بخوێنێتەوە دەبینێ بە پەلە ناترسێو، بە بەختەوەر نابینرێ گەر لەگەڵ سوپای مسوڵمانانیدا بجەنگێ، چونکە بە پارچەبوونی هێزی جەنگی دادەنا، بەڵکو وای بەباش دەزانی مادام بەرژەوەندی یەکێکە روو بکاتە دوژمنی داگیرکەر، ئەو پەلاماری سوپای مسوڵمانان نادات، مەگەر ئارامی نەمێنێو گیانی بگاتە گەرو. لە بەرامبەر دواکەوتنی فریاگوزاری لە (نورالدین)دا (نجم الدین) وای روانی کە پێویستە خوێنی مسوڵمانان بەبێ کە ڕشتنی پێویست بکات بپارێزێتو، بە چاکی زانی (بەعلەبەك) بە (معین الدین) بسپێرێ لەبەرامبەر چەند گوندێ لە شاری دیمەشقدا کە ئەو بەکاریان هەڵبستێ! هەندێ لە نووسەران ئەمە بە دەست هەلگرتنی دەزانن لە مافی (نورالدین)، هەتا لە مافی (نجم الدین) خۆشیدا. ئەوەی ڕاستی بێ پەلامارداني جەنگیش لەکاتی ئامادەنەبوونی هۆکانیدا نەبێو گەر گرتنی سەرکەوتن بە ئەگەرێکی گەورەوە بە خاوەنەکەی نەدات پاڵەوانی نیە، بەڵام ئاشتی پارێزی لەکاتی بەدەست نەهێنانی سەرکەوتندا پاڵەوانەتییەکی ئاشتییانەیەو کەسێ هەڵی دەسەنگێنێ کە کاروبارەکان بە ترازوویەکی ڕاست دەکێشێت! (نورالدین) ئاوا لێی حاڵی بوو بوو، رقی لە (نجم الدین) نەبووە، (شێرکۆ)ی برای لە (حەلەب)دا بینیو (نورالدین) (حمص)و دەورو دراوسێکانی بۆ ئەودا شکاندو، بووە سەرلەشکری سەربازی ئەو، ئەو قەت ئەوەی بە خەیاڵدا نەدەهات گەر پەیمان لە (نجم الدین)و (اسدالدین)ی برای وەرگرێ ئەوانیش لە گوێڕایەڵی ئەو بڕۆنە دەرەوەو بە قسەی نەکەن. لەمەڕ ئەم نادیاریە تەواوەی بەسەر مامەڵەی (نجم الدین)دا هاتووە، هەندێ لە لێکۆڵەران بۆئەوە چوون کە مەسەلەی سپاردنی (بەعلەبەك) لەسەر ڕێکەوتنی ئەوو (نورالدین)ی فەرمانڕەوای بووە تا خۆیان لە جەنگی ناوخۆ بپارێزنو حیساب بۆ جەنگێکی نزیك بکەن لەگەڵ خاچ پەرستەکان دا،لە پڕدا هەواڵ هات کە خاچ پەرستەکان بە هەڵمەتی دووەم هەڵساون لە ئەورووپاوە بەرەو خۆرهەڵات، جگە لە (نورالدین) کەس نەبوو بەرایی لێبگرێ، بەڵام ئەم هەڵمەتە بە سەرۆکایەتی (لویسی نۆیەم)ی فەرەنسیو (کەنرادی سێیەم)ی ئەڵمانی بوو،

ئەوانیش کەوتنە بەر مەترسی سەلجوقییەکانو بەشێکی زۆریان لەناوبردن.

من وا دەڕوانم کە هەوڵی (سەلجوقییەکان) بۆ بەرەنگار بوونەوەی داگیرکەری خاچ پەرستی (صەلیبی) پێویستی بە باسێکی سەربەخۆ هەیە، چونکە زۆرینەی مێژوونووسان لەگەڵ گرنگییەکەشیدا چاوی لێدەپۆشن، ئێمە لە هەڵمەتی یەکەمدا بینیمان کە (بەترۆس ناسك) پێشرەوی دەکردو چۆن تیپێ لە سەلجوقیەکان هێرشێکی تێکشکێنەریان کردە سەریانو سەرکەوتنو تەنیا سێ یەکیان دەرباز بوون، خودا دەزانێ چی ئەگەر هەمویان بە ساغی گەیشتبان چی رووی دابایە، چونکە سەردەمێ بوو مسوڵمانان ناکۆك بوون بە شێوەیێ کە گریانو شینێ دەخوازی، هێشتا کە (عمادالدین) هەنگاوی غیرەتو ئازایەتی خۆی دەست پێنەکردبوو، ئەوەتا هەڵمەتی دووەم بە سەرۆکایەتی دوو پادشا دەست پێدەکاتەوە کە شای ئەڵمانیو فەرەنسایەو ئەوانیش بەشی خۆیان لە شمشێرەکانی سەلجوقییەکان ئەشکەنجە دەبینن، بە شێوەیێ پادشای فەرەنسا ناچار دەکەن پاشەکەشە بۆ وڵاتی خۆی بکات بە بێ گەیشتن بە خۆرهەڵات، (کنراد)ی ئەڵمانی سور بوو لەسەر هێرش بردن بەڵام، نەك بۆ (الرها) تا لە جەنگی (نورالدین) رزگاری بکات وەکو پێشدا وا خەملێنرا بوو، بەڵکو بەرەو دیمەشق کە دوورە لە دەسەڵاتی (نورالدین).

(نورالدین)و (غازی) برایەکەی بۆ یارمەتیدانی دیمەشق ڕاپەڕین، ئەگەر (معین الدین) چوبایە گەڵیانو ئەم سێ هێزانە بە یەکگرتوویی لە مەیداندا بجەنگابان بەزین ڕووینەدەداو سەردەکەوتن، بەڵام (معین الدین) پادشای (دیمەشق) لەوە نەترسا دوای شەڕ دەسەڵاتی بکەوێتەو مەترسیەوەو، بکەوێتە جەنگی (نورالدین)ەوە، بۆیە وای بە باشزانی پەیمانێ لەگەڵ فەرەنگیان دابەستێ کە هەندێ قەڵای گرنگیان بداتە دەستو ماڵێکی زۆریان بە بارمتە پێبدات! ئەمەش دزێوترین ڕووداو بوو بۆ مسوڵمانان کە بینییان (معین الدین) ناپاکی دەکاتو نمونەیەکی ناشیرن لە سەرشۆڕیو ڕیسوایی شکان دەبەخشێت.

(نورالدين) و(غازى) ئەمەيان لە دەروونـى خۆيانـدا هـەڵگرتو، گەڕانـەوە بـۆ دانانى نەخشەيەكى جەنگ كردن لەگەڵ فەڕەنگييە پەلاماردەرەكانـدا. ئەوانـە لـە زەبرو زەنگى ئەم دوانە ترسان بۆيە بەرەو ڕووى (الرها) نەچوون، بەڵكو دور لە تێك هەڵچوونيان هەڵبژاردو وايان بەباش زانى لە دوورەوە بمێننەوە، (نجـم الـدين) بـيرى كردەوە كە خۆدانە پاڵ (معين الدين) پاش ئەم ناپاكييە قەت شتى وانابێ، بەڵام بە لەسەرخۆيى دەتوانێ لەناو دوژمنانيدا خزمەت بە (نورالدين) بكات، لێـرەوە هـەر دوو برايـەكان گەڕانـەوە بـۆ خـۆ كۆكردنـەوە لـەژێر سـەركردايەتى پاڵـەوانێكى ئەميندارردا يەكەميان (اسدالدين) بوو بە ئاشكرا لە (حەلەب)دا خزمـەتى دەكـردو ئەوەى تريان (نجم الدين)ە كە بە پـەنهانى لـە ديمەشـقدا خزمـەتى دەكـرد، پاشـان ڕووداو ڕووداوى دەگرت لە شێوەى لەنەكاو كتو پڕ دا، دوايى شـا (غـازى) بـراى (نورالدين)و سەردارى (موسڵ) مرد. بێگومان هەرچەندە ئەو دەيتـوانى (موصـل) بخاتە ژێر فەرمانى خۆيەوە، چونكە ئەو هيچ ميراتگرێكى نەبوو وەك باسمانكرد لـە ڕابردودا، ديسان ئەو گەورەى خێزانەكەيـەو پيـاوى يەكەمـە، بـەڵام ئـەو ويـستى برابچوكەكەى (قطب الـدين) ڕازى بكات، بۆيە لە شوێنى شـا غـازى دا داينـا لـە موصـڵداو سـەربەخۆى كـردو ميرنـشينى ئـەوى لـە (شـامدا) لـە ژێـر حـوكمى (نورالدين)دا لێوەرگرتەوە، تا هەرێمە مسوڵمانەكان هەمووى كۆنترۆڵى خـۆى بـن، مەگەر ئەوانەى ياخى بوون وەكو شاى (ديمەشق).

سوپاى خاچ پەرست دواى نائومێدبوونيان لـە گێڕانـەوەى (الرهـا)دا دەسـتييان گرت بەسەر (عەسقەڵان)دا كە زۆرينەى ميسريەكاندا لەوێدا گيرابـوون لـە شـامدا كاتێ ئەوێيان بە تەواوى گرت بەتەماى ئەوە بوون دەست بەسەر (ديمەشق)دا بگرن، تا سوڵتان (نورالدين) لە بۆشاييەكدا تۆق بدەنو پاش ماوەيێ بتوانن بەسـەريدا زاڵ بن، خاچ پەرستەكان دوايزانينى مردنى (معين الـدين)و دانـانى (مجـير الـدين) لـە جێگايدا چاو تێبڕينيان لە (ديمەشق) پتربوو كە كەسێك بوو هيچ ڕابردوويەكى نەبوو لە بەڕێوەبردندا نە لەكاتى شێنەيىو ئاشتيداو نە لەكاتى شەڕو هەرادا.

لێرەدا (نورالدين) خۆى لەبەرامبەر كارێكى مسۆگەردا بينييەوە ناچارى دەكات كە دەبێ ديمەشق لەو بەڵايەى چاوەڕوانى دەكات رزگار بكات، بۆيە كۆنگرەى جەنگەكەى بەستو (اسدالدين) گەورەترين سەركردە بوو لەناوياندا و لە هەموو رويەكەوە هەڵوێستى خۆى دەخستە ڕوو، نەخوازەڵا كە دەيزانى خاچ پەرستەكان خۆيان ئامادە باش كردووە بۆ داگيركردنى شارەكە، بڕيار لەسەر ئەمەدرا سوپاى (نورالدين) بە سەركردايەتى (اسد الدين) پەلامارى خۆى بەرەو ديمەشق بخاتەڕێو (نجم الدين ئەييوب)ى براى ئەو كارە ڕاپەڕێنێ لەناوى دا كە خۆى لەسەرى ڕێك كەوتبوو بۆ پشتگيريكردن لە (سوڵتان نورالدين)، كاتێ كاربەدەستى تازە لاو (مجيرالدين) نەيتوانى هيچ كارێ بكاتو سەركردەكەى (ئەييوب) واى بە چاك دەزانى يارمەتى سوپاى ئيسلامى بدات لە ژێر سەركردايەتى براكەيداو هيچ بووارێكى بۆ دوودڵى نەهێشتەوە، بەڵكو بە پێشوازييەوە چووە پێش سوپاى پەلاماردەرو ديمەشقى بە (اسدالدين) سپاردو وەڵامى سۆزێكى ئيسلامى دايەوە، كەلەسەر ڕووى هەموو مەبەستێكى خۆيىو لايەنگرايەتييەكى سياسييەوەيە.

ئەگەر ئەمڕۆ ديمەشق گەورەترين شارى شامەو لە هەموويان ئيدارى ترو ڕێكترەو لە دووژمن نزيك ترە، (نورالدين) واى بە باش زانى بارەگاى دەسەڵاتى لە (حەلەب)وە بۆ ئەوێ بگوازێتەوەو سەيرى پياوەكانى خۆى كرد بينى كە (نجم الدين ئەييوب)و (اسد الدين شێركۆ)و (سەلاحەددين) كوڕى (ئەييوب)و لە هەموويان ئازاترو بەتواناترو چاونەترسترنو بۆيە بڕيارى دا لە بەڕێوەوبردنى حوكمى دا لە جێگايە لە پێشينەكاندا دايان بمەزرێنێ، تەقەڵاى داو (ئەييوب)ى كرد بە فەرمانڕەواى گشتىو (شێركۆ)ى براكەشى بە جێگرى ئەو داناو (سەلاحەددين)ى بە سەرۆكى ئاسايشى ناوخۆ (الشحنة) دانا، بەو ڕێگايە زەمينە بۆ ئەم خێزانە كوردييە خۆش بوو كە شوێنى خۆى بگرێ لە سەركردايەتيكردنى ئيسلاميدا.

ئەگەر قسەو باسمان لەمەڕ ئەییوب‌و شێرکۆ لەم چەند لاپەڕەیەدا هیچ ئازارێکی بە خوێنەر گەیاندبێ‌و، دوان لەمەڕ (سەلاحەددین)و گواستنەوەی بۆ چەقێکی گرنگی سەرکردایەتی — لەگەڵ تەمەنی منداڵیشیدا — لەسەر وەلاّمدانەوەی کەسایەتی باوك‌و مامی ئەو نەبووە، (نورالدین) خۆی سورتر بوو لەسەر ئەمە کە نابێ هەواو ئارەزووەکان هۆکارێ بن بۆ گەیشتن بە پلەو پایە بەرزەکان، بەڵکو ئەم پیاوە گەورەیە هەستی بە بەهرەوەری ئەم گەنجە سەربڵندە کردووەو هەڵوێستی باش‌و پۆزەتیفی ئەوی ناسیوە ئامادەی بکات بۆ گرتنی شوێنی بەرزی خۆی لە دەسەلاّتدا.(سەلاحەددین) پاڵەوانەتی (نورالدین)ی زۆر بەدڵ بوو، لە ڕەفتاری مرۆڤانەو هۆشیاری جەنگی دا شوێن پێی ئەو دەکەوت، توانی ئەو چالاکییەی پێشکەش بکات کە بە دڵی (نورالدین)دا ببێ بە شایانی وەرگرتنی ئەم شوێنە بەرزەیە، گەورەبوون‌و هەراش بوونی لەناو زانایان‌و فەقیهانی گەورەدا یاریدەی ئەوەی دا کە فەرمانڕەوایێکەی ئەم ئاستە گەورەیەی بە قابیل ببینێت، هەمو ڕۆژێ کۆڕی زانستی لە کۆشکی (نورالدین)دا دەگێڕا مەگەر کاروبارەکانی شەڕ سەرقاڵی کردبایە.

لە کۆڕی زانستیدا لەم کۆشکەداو لە جەنگ‌و پێکداداندا لە مەیداندا ئەم گەنجە هۆشیارە ئەوەی پێشاندا کە بۆ ئایندەیەکی بەختەوەر ئامادەی کردووە. (نجم الدین)ی باوکی سووربوو لە سەر ئەوە کە کوڕەکەی لەسەر خۆشویستنی (نورالدین)و فێربوونی هەڵوێستەکانی ئەو پەروەردە ببێ‌و لە (نجم الدین)دا خۆ بەکەم زانینێ هەبوو کە لە هاوتاکانی ئەودا نەبووە، ئەو بۆ هیچ شانسێ خۆی هەڵنەدەبژارد، ئەوەندەی بەس بوو کە ڕۆژان یارمەتی دەدەن بەو شکۆیانەی خودا بۆی بڕیارداون کەم بێ یان زۆربێت. ئەم سێ کوچکە هەڵکەوتووە (نجم الدین ئەییوب)و (اسد الدين شێرکۆ)و (سەلاحەددین یوسف کوڕی ئەییوب) ئومێدی چاوەڕێ کراوبوون بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی نزیك.

# بــەرەو مـيســـر

يەكێ لەو هەڵانەى نووسينى مێژوويى تێيدەكەوێ ئەوەيە كاتێ بيرۆكەيەكى هەڵە لەمەڕ كەسێ يان گروپو كۆمەڵێ بڵاودەبێتەوە، لێكۆڵەرێ خولياى دەبێ بـە پێـى توێژينەوە، ئەگەر بيەوێ لەو بارەوە شتێ بنووسێ دێ لـە جۆرەهـا سەرگوزەشـتەى جياجيا دەكۆڵێتەوە تا ئەوەى خۆى لە ڕابردوودا بڕيـارى لەسـەر دابـوو لەناويانـدا گوڵبژێرى بكات، ڕەنگە ئەو زۆرى لەمەڕ تێڕوانينەكانى نەياران خوێندبێتەوە، بەڵام ئەوەى دەيخوێنيتەوە خۆى لـێ گێل دەكات، بەڵگە بۆ لايەنەكەى خـۆى دێنێتـەوەو ئەو هەواڵانەى حەزى لێيەتى ئەنجا هەڵەبن يان ڕاست بن ڕاويان دەكات.

يەكێ لەو مەسەلانە ئەو بۆ چوونەيە كە يەكێ لـە لێكۆڵـەرە ناودارەكـان بـۆى چـووەو (فاتيمييـەكان)ى بـە (العبيـد) نـاوزەد كـردونو بـە دوژمنـى زۆرينـەى مسوڵمانانى داناون، گوايە بە هێرشى خاچ پەرستەكان بۆسـەر وڵاتـانى ئيـسلامى دڵخۆش بوونو نموونەى وەكو (شاوەر)و (ضرغام)ى بە ناپـاك نـاو بـردوون كـە لـە بۆچوونى خەليفەكانيان دەردەچون بۆ هاوپەيمانەتى بەستن لەگـەڵ خـاچ پەرسـتانداو خۆشحاڵ بوون بە مانەوەيان لە خۆرهەڵاتداو تفاقو سامانيان بۆ بردون تا بـەردەوام لە شامدا بمێننەوە! نازانم چۆن عەقڵ ئەمە دەگرێ لەگەڵ ئەو تاڵىو سەر شـۆڕييەى فاتيمييەكان چەشـتويانەوەو ئـەو پـلانو نەخـشانەى بـۆ تيرۆركردنيـان كێـشراوەو جۆرەها شێوەى سوكايەتى كردن بە كەسانى وەكو (شاور)و (ضرغام) كراوە!! پاشان چۆن ئەوانە بەردەوام ناپاكييان ئەنجامداوە، كەچى ئـەو نازنـاوە گەورەيەشـيان بـۆ خۆيان هەڵگرتبوو لە هەڵسوڕاندنى كارەكانيشاندا بەقەد خاڵى ناو نێوە خورمايـەك دەسەڵاتيان نەبووبێت؟!

ئەو کەسەی لە مێژووی گەشاوەی دەوڵەتەکانی (فاتیمی)یەکان بڕوانێ لە سەرەتاکانیدا سوربوونەکی زیادی بەرچاو دەکەوێ لەپێناو سەر بلندی ئیسلامدا خەباتی نەپساوە بۆ ڕاپەڕین دژ بەو دوژمنانەی پلانو فێڵیان دژ بە ئیسلام کێشاوە، ئەم گەلەیە لەکاتێکدا خەلیفەکان سەرچاوەی فەرماندانو قەدەغەکردن بوون لەکاتێکدا وەزیرەکانیان ناوداریێ بوونو خاوەن ڕۆشنبیرییەکی فراوان بوونو بەڕێوەبردنێکی قایمیان هەبووەو زۆر دڵسۆز بوون سەربلند بوون. لەگەڵ بوونی جیاوازی بنەڕەتدا لە نێوان دەوڵەتی عەبباسیو فاتیمییدا، بەلام لەکاتێکدا بەغداد توشی پەلاماری خاچ پەرستی بۆتەوە خۆیان لە یارمەتیدانی ئەوان نەکێشاوەتەوە، (بەغدا)یش لە یارمەتیدانی (میسر) یارمەتی خۆی نەگرتۆتەوە، ئەوکاتە جیاوازییەکان لەیاد کراونو، کینەکان لەناو چوون، تا هەموویان یەك ڕیزی قایم بن بۆ وەستان لەبەردەم دوژمنی بەدکاردا.

نموونە بەم ڕووداوە ناوداره دەهێنمەوە کە ڕووداوی پەلاماری ڕۆمە بۆ سەر (حمص)و (حماة) و(حلب) لە ساڵی (٣٦٥ هـ)دا کە ئەوکاتە لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی فاتیمی دابوون، کاتێ ئەوانەی بێترس بوون بە کوژرانو تالانکرانو بەدیلگیران تۆقێنرانو هەواڵەکە لە (بەغداد) بلاوبۆوە (معز الدولە) نامەی بۆ (العزیز باللە) کە خەلیفەی فاتیمی بوو نووسیو، وەلائی خۆیو دڵسۆزی خۆی بۆ تەواوی میللەتی ئیسلام دەرخستو، نمایشی دەکات کە بەغداد هاوبەشە لەگەڵ (میسر)دا بۆ لابردنی دوژمنی هەردوو لایان. (العزیز باللە) سوپاسی ئەو گیان سوکییەی کردو سوپاسنامەیەکی بۆ نووسیو ووتی: سوپای (میسر)ی توانای خۆی هەیە بۆ ڕووخاندنی دوژمنان. بە خێرایی تیپەکانی مسوڵمانان دەستو بردیان کرد بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە فەرزەیەو، لە ئاکامدا (ڕۆم) ڕایکرد بۆ دواوەی ڕوباری (مەقلوب)و وایانزانی ئاوەکە دەبێتە ئاستەنگو پێکپڕژان دروست نابێت، بەلام تیپە تێکۆشەرەکان بە مەلە ڕوباریان بڕی، لەدوای ئەمەوە تیرهاوێژەکان لە هەردوو تیپدا کەوتنە تیربارانی یەکتری، هەتا تیپی مەلەوانی کەناری گەیشت، یارمەتی

دروستکردنی پردێکی بەپەلەی دان کە هەردوو کەنار بەیەکتری دەگەیەنێ‌و، جەنگ ڕوویداو بۆئەوەی مسولمانان تۆڵەی تێکشکێنەریان وەربگرن‌و بە ساغی‌و سەرکەوتویی بگەڕێنەوە!! ئەگەرچی خەلیفەکانی (فاتیمی) لەدوای سەردەمی یەکەمیندا ڕۆشناییان وون بوو لە گەشەکردنیاندا زۆر وەزیری گەورەیان بەدەست هێناو مناری خەلافەتیان بڵند کرد، ئەوەتا (یازوری) وەزیرەکی چاکساز بوو، بەرلەوەی بگاتە ئاستی سیاسی خۆی بەشی خۆی زۆر زانست فێر بوو، بە خۆماندوکردنی ئەو ئاسایش بڵاوبۆوەو خەڵکەکە بەختەوەربوو، بەدوای ئەودا کەسی ترهات کە کارەکانی چاك هەڵنەدەسوڕاند، ماوەیێ وڵاتی هەژاند، تا (بدرالدین الجمالی) میری سوپا هات‌و ئاسایش‌و ئاشتی‌و خۆشگوزەرانی گێڕایەوە، ئەم (بدرالدین)ە بەرلەوەی وەزیرێکی دانا بێ، زانایەکی گەورە بووەو زانستە زۆرەکەی گەیاندیە ئەو ئاستەی کە ببێتە بانگەوازکەری بانگەوازکەران‌و قازی قازییەکان کە دوو پایەی زانستین لەگەڵ پلەی وەزارەتی داو زۆر شوێنی کۆبونەوەو مزگەوت‌و قوتابخانەی دروستکرد، چونکە خۆشگوزەرانی لە سەردەمی ئەو بڵاوبۆوەو گەشەی کرد، هەتا وتراوە سەردەمی ئەو هاتنی خێرو سەربڵندی بوو، ئەوکاتە زۆر وەزیری هۆشیاری تێدا هات‌و، دوا کەسیان (طولائیع ڕوززیك) بوو کە لە ئەدەب‌و زانست دا بێ وێنە بوو، هەمیسان لە هەڵوێستی سیاسیشی دا نموونەی نەبوو.

لەکاتی سۆراغکردنی هەواڵەکانی پاڵەوانەتی (نورالدین زنکی)دا زۆر ئەوی بە دڵ بوو. کاتێ زانی پەیمانێکی ئاگربەستی لەگەڵ دوژمنانیدا مۆرکردووە سەرزەنشتی کردو ئاماژەی دایێ کە ئاگربەستەکە بشکێنێ‌و لەلای خۆرهەڵاتەوە ئەو ئەم ئاگربەستە بشکێنێ، کاتێ (طلایع) خۆشی بە ڕەوانەکردنی سوپای خۆی هەڵسا بۆ دەوروبەری باشورەکەی تا دوژمن بکەوێتە ناو دوو بەرەی بەهێزەوەو نەتوانێ قوتاری ببێ، بێگومان سوپای(میسر)ی خەباتەکی پاڵەوانانەی کردو، کەشتیگەلی (کەنانە) لە کەنارەکانی (شامدا) دەهاتن‌و دەچوون‌و زەبرەکی کوشەندەیان لە فەڕەنگ وەشاند، لە هەڵبەستی (عامرە)دا (طلایع) کوڕی (روز

زیك) قسە لەگەڵ (نورالدین) دەکات کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکاتو دەڵێ:

سارت سرایانا لقصد الشام تعتسف الرمالا
حتى لقد رام الاعادى عن ديارهم ارتحـــلا
نزجي الى الاعداو جرد الخيل اتباعا توالى
فلوا ان نورالدين يجعل فعلنا فيهم مثـــالا
ويسير الاجناد جهدا كى ننازلهم نـــــزالا
لرايت لافرنج طرا فى معاقلها اعتقـــالا
وتجهر للسير نحو الغرب لو قصد والشـــمس

لە هەڵبەستەکی تردا هاتووە لەگەڵ (نورالدین) دەدوێت:

فدع عنك ميلا للفرنج وهدنة بها ابدا ايخطى سواهم ولم يخطـــوا
تأمل فكم شرط شرطت عليهم قديما، وكم غدر به نقص الشـرط
وشمر فانا قداعنا بكل ما سألت وجهزنا الجيوش ولن يبطــــوا

لەم هەڵبەستەی دواییدا ئاشکرایە کە (نورالدین) داوای لە میسر کردووە بۆ هاوبەشی کردن لە چەرخی (کوڕی ڕوززیك) داو ئەویش یەکسەر وەڵامی داوەتەوە، بەڵام بێ شانسی بوو دوژمنێك پەلاماری وەزیرەکەی داو تیرۆری کرد، بە کۆتای هاتنی ئەو لاپەڕەیەکی سەروەریو ڕێز پێچرایەوە. دوای ئەو (عادل)ی کوڕی (روز زیك) هاتە سەرکار لە شوێنی باوکیداو، ئەویش زۆری نەخایاندو چاخی ئەو کەسانە هات کە تەماعکاری سوڵتەیان هەبوو قین لەدڵ بوونو، بە چونی (شاور) بۆ قاهیرە دەستی پێکردو، وەزارەتی ئەو بە تیرۆر کردنی (عادل) هاتە سەرکارو شەرەفو ئاینو نیشتمانی خۆی قوربانی خۆپەرستی خۆی کرد.

لێرەوە لاپەڕە ڕەشەکان لە مێژووی میسردا سەرهەڵدەدات، چونکە ئەم تاوانبارە زەوتکەرە ڕێزی بۆ هیچ خەلیفەیەك یان سەرکردەیەك یان قازییەك دانەدەنا، تەنیا

ئەوانە نەبێدەست بە کلکی ئەوەوە دەگرن، ئەو چۆن تاوان لەمەڕ خەلیفەیەکی لابراوی بچوك دەکات کە هیچ توانایەکی لەکارەکانی ئەودا نییەو دەوترا: ئەوە هۆیەکی جێبەجێکردنە بۆ نەوەی خەلیفەکان لە (عەبیدیەکان)!! شاور ویستی دەسەڵات بگرێتە دەست بەبێ هەبوونی هیچ نەیارو دژێ لەبەرامبەریدا، لە (الصعید)ەوە بە سوپایەکی چڕوپڕ هات تا حوکم لە (عادل کوڕی ڕوز زیك) داگیر بکاتو ئاواتەکەشی هاتەدی، بۆ ئەمەش پشتی بەو هێزە قایمە بەزەبرە بەست کە لە (ئەسوان)ەوە لەگەڵیدا هات[1] هەندێ لە مێژوونووسان لەکاتی پێناسەکردنی پیاواندا لە شوێنی ڕاستی خۆیاندا دایاننانێن، چونکە وا لەبارەی (شاور)ە وە دەدوێن کە لە داگیرکردنی دەسەڵاتدا خاوەن ماف بووەو، لەمەڕ ئەوکەسە کێشەی لەگەڵدا کردووە هەتا پەنای بردۆتە بەر سوپای دەرەکی بۆ پەرچدانەوەی ئەویان هەر بە خاوەن ماف سەیر کردووە، بەڵام باشتر وایە هەڵوێستەکانو کارەکانو پیاوەکان بەڕاستیو دروستی دیاری بکرێن با گوناهی دەرەکیو نامۆکان نەکەوێتە سەر میللەتەکی هەژار کە هیچی لە دەست نایەت. (شاور) خۆی چەتەو ڕێگربووە لە سەرەتاداو، (طلائع بن رزيك) وایزانی کە ئەو بە زەبرو هێزی زۆری خۆی دەتوانێ شۆڕشەکانی (الصعید) دامرکێنێتەوە کە دوو ڕەگەزی دەرەکین بەرەنگاری یەکتری دەبنەوەو یەکێکیان ئەوی تر لەناو دەبات.

کاتێ سەرکەوتنی بەدەست هێنا کردی بە والیو فەرمانڕەوا لەوێدا کە هەتا ئەو ڕۆژەی (ابن رزيك) مرد لەم کارەی خۆی پەشیمان بوو، منداڵەکەی خۆی لە خراپکاریو زیانی ئەو هۆشیار کردەوەو ئامۆژگاری کردن بەرەوڕوی ببێتەوە بۆ لابردنی. بەڵام خوێنگەرمی لاوێتی کوڕەکەی هانیدا کە فەرمانی لەسەر کار لابردنی بدات، ئەوەش کارێکی ئاسایی بوو کە ئەو خراپکارە لە شوێنی خۆی

---

١) (الصعید) ناوچەیەکە لە میسرو دەکەوێتە باشوری قاهیرەو تاڤگەکانی ئەسوان درێژی (٩٠٠کم)و (٨) پارێزگایە: (الجيزه- بنى- سويف الفيوم - المانيا- اسيوط- سوهاج - قنا - اسوان). اسوان: دەکەوێتە سەر نیل. (المنجد في الاعلام) سەیر بکە. (وەرگێڕ).

دابمەزرێنێ، بەڵکو ئاساییە بە هەستیاری بەهێزی خۆی پێشبینی کارەکانی بکاتو بزانێ کە وەزیری نوێ وەکو باوکی نییەو ئەو دەتوانێ پەلاماری (قاهیرە) بداتو داگیری بکاتو ببێتە دەمڕاستی ئەوێو خەلیفەش بێدەسەڵاتەو پەکی کەوتووەو هێزی نییە، گەلیش چەکی بەرگری نییەو ناتوانێ ناڕازی خۆی دەرببڕێت.

هەموو شتێ بۆ ئەم داگیرکەرە چەکدارە مسۆگەر بوو، جڵەوی کارەکانی کەوتە دەستەوەو کەوتە ڕاوەدونانی پشتگیریکەرانی (عادل) بە کوشتنو دەربەدەرکردن، تا ئەم دەستدرێژییە ماڵی خەلیفەشی نەپاراستو هەڵسا هەرکەسێکی لە خزمانی زانی هەندێ توانای تێدا هەیەو خەڵکی لە خۆی خڕ دەکاتەوە ڕیشەکێشی کرد، تەماعکارێکی تری لە توخمی خۆی کە ئەویش ڕێگربوو ویستی کە وەزارەت بۆ خۆی قۆرخ بکاتو، لای زۆر لە زلهێزانو چەکداران پایەی هەبوو، هەمووشیان ڕقیان لەم کابرایە دەبۆوە کە لە هیکڕا دەرکەوتو هات ولاتەکەی داگیر کرد، خەلیفە خۆشی بەم کارەی (شاور) دڵتەنگو پەست بوو، لەبەرئەوە سۆزی خۆی بۆ (ضرغام) پیشاندا، بۆیە هەر دوو تورەکان شانبەشانی یەکتر ڕاوەستانو هەریەکەیان دەیویست بە دوژمن لەناو ببات.

پاشان سوكو چروکی (ضرغام) خستیە دڵییەوە کە پەیوەندی بە پادشای فەرنگەوە بکات لە (بیت المقدس)دا تا بۆ سەر دوژمنەکەی پشتی بگرێت، (ئەمور)یش لە هەل دەگەڕا بۆ ڕووخاندنی (میسر)و لەوە دەترسا لە بەرامبەریدا ڕاست ببێتەوەو لە جەنگێکەوە بگلا کە ئاکامە یەکالاکراوەکەی نەبینێت، کاتێ هەوالێ (ضرغام)ی پێگەیشت بینی بەرەکەی لەسەر درەختەکە پێگەیشتووەو هەراش بووەو خەریکە لەخۆوە بکەوێتە خوارەوە، سەرکەوتنەکانی (نورالدین)یش وەکو پاروێ لە گەرویدا ماوەتەوە، سوپاکەی هەستیان بەوە کردووە کە ئەو لە بەرامبەر پادشایەکی بەهێزو قایمدا دەستەو وەستانە، بۆیە ویستی سەرنجەکان بۆ دەسکەوتێکی بە پەلە ڕابکێشێ کە لە (میسر)دا دەستی دەخات!.

بەم شێوەیە ئەم ناپاکە ڕێگای بەخۆیدا کە دەست بخاتە دەستی داگیرکەری نامۆوە! بەم چەشنە (شاور) ویستی فێڵو تەڵەبازی بە فێڵو تەڵەکە بازی لاببات، ئنجا ڕوری کردە گۆڕەپانی (نورالدین زنکی)، بەڵام نەك بۆئەوەی حەزدەکات ببێتە سەربازێ لە جەنگو شەڕی ڕێزو ئابڕودا، بەڵکو دەیویست کە (ضرغام)ی ڕکابەری ببەزێنێ، لە دڵی خۆشیدا نیازی وابو کاتێ ئەم پەیوەندییە بە (نورالدین)ە وە بکات کە گەشتێکی بڕیار لەسەر دراو دەکات. چونکە هەستی (میسر)ییەکانی لەمەڕ ئەم پاڵەوانە ئازایە دەزانیو، دەیزانێ کۆی مسوڵمانان بە دڵخۆشیو ڕوی گەشەوە پێشوازی لێدەکەن.

(نورالدین) لە هیکڕا هەواڵی هاتنی (شاور)ی پێگەیشتو، گوێ بیستی ناپاکی (ضرغام) بوو، دەستیکرد بە بیرکردنەوە لەم کارەی (ئەموری) دوای ئەوەی (میسر)ی داگیر کردووە خێرو بێرەکانی ئەوێی بە ئاسانی بۆ قوت دەچێ، ئەمەش کارەساتێکی ڕاستەقینەیە بۆ ئەرکەکانی (نورالدین)، خودا ویستی داگیرکردنەکە بۆ سوپای (نورالدین) ئاسان بکات، کاتێ کە سوپای فەڕەنگی بۆ داگیرکردنی وڵات هاتووەو، بەرەو لای (بەلبیس) چووەو، (ئەموری) بە داواکردنی سەرانەیەکی دارایی گەورە (ضرغام) بێتاقەت دەکات کە لەمەوبەر پەیمانی پێدابوو، ئێستاش ئەوەندەی بە دەستەوە نیە ئارەزوی پادشای تەماعکار تێر بکاتو لەوە ترسا (ئەموری) سوپای خۆی بنێرێتە سەر پایتەختەکەیو بیشکێنێو بیخاتە تەنگاویو کارەساتێکی گەورەترو کاریگەرترەوە، (نیل)[1] ئەوکاتە بەرز بوو (ضرغام) پردەکانی بەرەو ڕووی سوپای پەلامەردەر داپچڕاندنو وڵاتەکەی لەلای بەلبیسەوە پێدادە پۆشێ، سوپای خاچ پەرست ناچاری پاشەکشەکردن دەکات!

---

١) دوای (ئەمازۆن) دووەم ڕوبارە لە درێژیدا لە جیهانداو، گرنکترین ڕوبارە لە ئەفریقیاداو (٦٥٠٠ کم) درێژەو، ڕوبەری ئاوی (٢/٩٠٠/٠٠٠) کم٢. (المنجد في الاعلام / لويس معلوف) (وەرگێڕ)

لەوکاتە هەواڵ بۆ (ضرغام) هات کە (شاور) بەرەو (نورالدین) چووە لە دیمەشقداو گومان لەوەدا نیە کە سوپای ئیسلامی دێت، بۆیە لە گەڕانەوەی فەرەنگ پەشیمان بۆوە، بۆیە بە دوای دا ناردن کە بگەڕێنەوەو چیشیان دەوێ دەیانداتێ، ئەم هەواڵەش بە پەلە گەیشتە (نورالدین)و سەیری کرد کە ڕۆیشتنی سوپا بەرەو میسر پێویستییەکە ڕاکردنی لێناکرێتو، (اسد الدین شێرکۆ)ی کردە سەرکردەی سوپاکەو برازاکەشی (سەلاحەددین) لەگەڵ ئەودا بوو، (نورالدین) سوپایەکەی بەو پەڕی تفاقو کەرستەوە تەبیارکرد هەتا هێرشەکە لە (ئەموری) بشارێتەوە دەستیکرد بە پەلاماردانی سنورەکانی نزیك میرنشینی (المقدس)و، تا (ئەموری) وا بزانێ هەڵمەتە تایبەتە بەو مەیدانە و(نورالدین) نیازی ڕۆیشتنی بەرەو (میسر) نییە، ئەمەش تاکتیکێکی سیاسی لێزانانە بوو.

پاشان (اسدالدین) لەسەر ڕۆیشتن لەگەڵ سوپاکەیدا بەردەوام بووو، (شاور)یش ڕێگا نزیکەکانی پیشان دەدان تا هەردوو سوپاکان لە (بەلبیس) سوپای (ضرغام)و سوپای (اسدالدین) بەرانبیخی یەکتربون، هەرچی سوپای (ضرغام) بوو ڕاستگۆیانە نەدەجەنگان، چونکە بە تۆپزیو ناچارکردن دەستەویەخەی براکانیان کرابوونو بەگژ یەکترەوە نرابون کە ئەوانیش لە ئاینو ئازارو ئاواتەکاندا هاوبەشی ئەوانیان دەرکرد! ئەوەبوو بەرەو (قاهیرە) پاشەکشەیان کردو سوپای (اسد الدین)یش بەدوایانەوە بوو تا گەیشتە (الفسطاط) لەوێدا ئۆردوی سەربازییان هەڵدا.

(ضرغام) توشی کارەساتو مەترسی هاتو ماڵو دارایی وەقفی هێنا بڵاوی کردەوە تا سوپاکەی ڕازی بکات لەگەڵ ئەودا بنو ڕابوەستن، بەڵام خەڵکی بە توندی لێی هەڵسان، چونکە ئەو بە بەستنی هاوپەیانی لەگەڵ فەرەنگدا سوكو ڕیسوای بۆ سوپای پەلاماردەریش دۆستە نەك دوژمنە، خەلیفەش هەستی بەمە کرد بۆیە ڕقی خۆی ڕاگەیاند بەسەر (ضرغام)دا، بەڵام هیوای بەرنەداو هەوڵی دەدا بسوڕێتەوە خەڵکی کۆ بکاتەوە، لە ساتێ لە ساتەکانی ڕق هەڵسانیدا ئەسپی خۆی تاوداو رایکرد بە برینداری خستیە سەر تاوێرێك کە خەڵکی ئەو دیمەنەیان بینی بە

پەلە چوونە پێشیو کوشتیانو سەریان بڕیو بردیانەوە کۆشکی خەلیفە![1] ئەمەش گەستنێکی چاوەڕوانکراو بوو بۆ نموونەی خیانەتکارانی وەکو ئەو.

جەنگی ناوخۆ لەنێوان (شاور)و (ضرغام)دا بە نەمانی دژەکەی بڕایەوەو (شاور) بۆ وەزارەت گەڕایەوە، ڕوانی مسوڵمانان بە ئامادەبوونی (اسد الدین) کەیفیان خۆشە هەرچەندە لە دەرەوەی قاهیرەشە، بەڵام ویردی سەرزمانی خەڵکەو، خەڵکی هەمووی سەرقاڵکردووە، بۆیە بە چاکی زانی بە کارێکی وا هەڵسێ کە نیازی ناودڵی لە خیانەتو ناپاکی ئاشکرا بکات، بۆیە (٣٠) هەزار دیناری بۆ ناردو، پێی ڕاگەیاند ئێستا مەترسی فەڕەنگی نەماوەو (ضرغام) مردووە تۆ دەتوانی ئێرە بەجێ بێڵیت، ئەم هەواڵە ناکاوەش بۆنی ناپاکی بە ئاشکرایی پێوە بوو، چونکە گرێبەستی نێوان (شاور)و (نورالدین) لە سەر ئەوە نەبوو، بەڵکو لەسەر ئەوەبوو کە سوپای (نورالدین) لە (میسر)دا بمێنێتەوە تا هەڵوێستی داری فەڕەنگی مەترسی لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا کە پشتی یەکیان گرتووە لە یەك جەنگدا بێت. (اسدالدین) بە ئاشکرایی وەڵامێکی بە تووڕەیی دایەوەو وتی تا (نورالدین) فەرمانی پێنەکات ئەوێ بەجێ ناهێڵێت، لێرەدا (شاور) بە ئاشکرایی پەنای بردە بەر ناپاکیو نامەی بۆ شای فەڕەنگ (ئەموری) نووسیو تکای لێکرد بگەڕێتەوە!! تا دوێنێ لە زیانی فەڕەنگی دەترسا نەك لەبەر ئەوەی وڵاتیان داگیر کردووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەبنە یارمەتیدەرێ بۆ (ضرغام)! ئەوەتا ئیمرۆ دەگەڕێتەوە بۆ دوژمنانی دوێنێ کە تا ببنە هاوپەیمانی ئیمرۆ، تا لەگەڵ ئەودا بووەستن کە لەکاتێ ترسو بیمدا پەنای بردوونەبەرو سەری پێ بردنو لە شامدا بە ترسەوە چووەتە لایان! (اسد الدین)

---

١) بێگومان ئەگەر کوشتنی (ضرغام) تۆڵەی خیانەت بوویێ، سەر بڕینو بردنی بۆ کۆشکی خەلافەت دوورە لە ڕەوشتی سزادانی ئیسلامی، لە فیقهی ئیسلامیدا هاتووە: {فەقیهەکان هەتککردنی کوژراوان وەکو بڕینو شێواندن بە ڕەوا نازانن. (الصنعانی) دەڵێ: کۆی زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەسکاری لاشەی مردوو حەرامە. بەیهەقی گێڕایەوە: کە پێغەمبەر ﷺ هانی دەدایـن بۆ چاکەو قەدەغەی دەکردین لە شێواندن - المثلة} . الجهاد في تصور الاسلامي/ابراهيم نعمە/ ل: ٦٦. بۆیە فیقهی جەنگ واجبە دەبێ سەرکردەو سوپا شارەزای بنو کاری پێبکەن. (وەرگێڕ)

هەڵوێستی ناخۆشی خۆی پەی پێبرد گەر زەخیرەو کەم بووەو، (شاور)یش هەوڵی تەواوی خۆیدا بۆئەوەی کە ئەو توێشوەی میسرییەکانی برایان پێشکەشی جەنگاوەرانیان دەکرد قەدەغە بکات.

(اسد الدین) ئاماژەی بۆ (سەلاحەددین)ی برازای کرد کە بە تیپێکی سوپاوە بەرەو (بلبیس) بڕواو یارمەتیو کۆمەك لەو خەڵکە وەربگرێ کە لە دەرەوەی بازنەی ڕکێفی ئەو وەزیرە پەیمان شکێنەرەدان، کت ومت ئەوەش هاتە پێشو کاتێ (سەلاحەددین) ڕوی کردە خۆرهەڵات بینی خەڵکی بە گەرمیو ڕوخۆشی پێشوازییان لێدەکەنو، میوانداریيان بە ڕاستگۆییانە دەکەن، بەڵام سوپای (ئەموری) هاتبووە (فاقوس)و (شاور)یش هاتبووە یارمەتییان بۆئەوەی لەگەڵ بەکرێگیراواندا بەشداری جەنگ بێ لەگەڵیاندا!! سوپای ئیسلامی چونکە زۆرترینی ئازووقەی نەمابوو، کەوتبووە ناو مەترسییەوە.

ئەم هەواڵە ناخۆشە بە (نورالدین) گەیشتو، ویستی بە سوپاوە بەرەو (قودس) بڕوات بۆ جەنگان لەگەڵ فەڕەنگدا کە چەند تاقمو پیرێکنو بەرگەگرتنی شەڕیان زۆر نییە، چونکە (ئەموری) لە (میسر)ەو لەوێ نییە، هەواڵ گەیشتە شای فەڕەنگی بە هێرشی (نورالدین)و مەترسی پەیدا بوو، لە دڵی خۆیدا وتی: ئەگەر میرنشینی (المقدس)م لە ژێردەست بچێتەدەرو بکەوێتە بەردەستی (نورالدین) مانەوەم لە (میسر)دا کە دوژمنە سودم نادات و لەناوم دەبەن، ئەگەر شاوریش بکوژرێ میسرییەکان لەسەر یەك بۆچوون نامێننەوە. هەواڵی بارکردنو گواستنەوە وەکو تریشقەیێ دابەزیە سەر سەری (شاور)، چونکە فەڕەنگییەکان هەر بە کشانەوە نەوەستان، بەڵکو داوای بڕە پارەیەکی زۆریان کرد کە بە خۆماندوکردنەکی زۆرنەبێ دەستی ناکەوێ، تەنیا ئەوەندەی بەدەستەوە ماوە سەری خۆی شۆڕ بکات، بەڵام (ئەم کوری) سور بوو لەسەر هێشتنەوەی ژمارەیێ لە سوپا تا ئەوکاتەی دەگەڕێتەوە، کاتێ مەسەلەی نێوان ئەوو (نورالدین) بە قازانجی ئەو کۆتایی پێدێت.

مسوڵمانە ڕاستیەقینەکان کوڕانی (شاور)[1] خۆشی لەوانە (کامل) دەستیان کردە شۆڕش بەهۆی ئەو ناپاکییەی تێوەی گلاوەو، پەیامنێرانی خۆی ناردەلای (اسدالدین) کە ئەو ئەوپەڕی هەوڵی دەدا بۆ کشانەوەی (ئەموری) و، (اسدالدین) وتی: تا یەك سەربازی فەڕەنگی مابێتەوە من ناکشێمەوەو، (ئەموری) ناچار بوو کە لە داخوازی خۆی دابەزێتە خوارەوەو، (اسد الدین) کشانەوەی بەلایەنەکی دروست دەزانی کە خۆ لێدورگرتنی ناکرێ، چونکە (شاور) لە وەزارەتدا ماوەتەوەو لەگەڵ کەمی ئازوقەو کەمی سوپاشی لە پلانی ئەو دڵنیا نییەو ئەوەندەی بەسە کە لە زیانی (ئەموری) مەترسی نەبێت.

بەڵام (سەلاحەددین) نەیاری ئەم ڕۆیشتنە بوو، مامیشی هەواڵی دایە کە گەشتەکە دەگەڕێتەوەو، هەموو شتێکیشیان لەمەڕ (میسر)ەوە زانیوە، ئەگەر جارێکیتر سوپا بگەڕێتەوە بە تواناتر دەبیو شوێنی باشتر دەگرێت. هەندێ توێژەرەوە بۆئەوەی دەچن کە هەڵمەتی (ئەسەدی)یە دوای ئەم کۆچکردنە ناچارییە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵام من وای بۆ ناڕوانم، چونکە سەرکەوتن بە پێی بارودۆخی سوپایەو بارکردنو ڕۆیشتنیش مادام کە نەزانی سەرکەوتن بەدەست دێنی دەسکەوتێکی بەرچاوە، چونکە مەترسیەك دوور دەخاتەوە کە ڕەنگە ڕوویدات. ئازا تەنیا ئەو کەسە نیە کە بزانێ چۆن هێرش دەباتو بەس، بەڵکو ئەو کەسەشە دەزانێ لەکاتی ڕەشەبادا کە هەڵدەکات چۆن بێ زیان سوپای خۆی قوتار دەکات!

ئەو ڕووداوە یەك بەدوای یەکانە بوواری بە سوپای (نورالدین) نەدا کە لە (میسر) دوور بکەوێتەوە، چونکە (شاور) پەیوەندی بە فەڕەنگەکانەوە کرد کە کۆمەڵێك بنێرێ بۆ پاسەوانی کردن کە دوای ڕۆیشتنی (اسد الدین) بمێنێتەوە تا (نورالدین) جارێکی تر چاو لە خاکی ئەو نەبڕێتەوە کە ئەمەش کارێکە ترس لە

---

١) شاور (السعدی): (ابو شجاع مجیر الدین) مردن (١١٦٩) میرەکی ویلایەتەکان بوو، لە هۆزی هەوازن بووە، وەزیری (عاضد) بووە ..... (المنجد فی الاعلام) (وەرگێڕ).

دڵی (شاور)دا دروست ئەکات، نەك تەنیا لە (نورالدین) بەڵکو لەو (میسر)یانەش کە ڕقیان لێی دەبێتەوەو چاوەڕێی ڕۆژی نزیکی دەکەن، بەڵکو دوای ئەوەی لە بەرامبەر (اسد الدین)دا لە ڕابردوودا پەیمانی لەگەڵ فەرەنگەکانی بەست، بۆیە داواکردنی فریاگوزاری بۆ دووەم جار لە سوپای (ئەموری) بۆ پاراستنی گیانی ئەو لەو شۆڕشانەیە کە ڕوودانیان مسۆگەرە، داواکردنی ئەو فریاگوزارییە بۆ خۆشی هۆکارێکی بەهێز بوو بۆ (نورالدین) کە دوای ئەوەی فەرەنگەکان (میسر) داگیر دەکەن تەکبیرێ لە کارەکە بکات، ئەوان ڕابردوو بەجێیان هێشتبوو، کەچی ئیمرۆ (شاور) ڕێگای گەڕانەوەی بۆ خۆش کردنەوە! (اسدالدین) هۆشیار بوو بە شێوەیێ ڕێگای باشی گرتەبەر لە دوای ڕوخسەت دانێ لەلایەن (نورالدین)وە کە بە پەلە فەرەنگییەکان لە دۆڵی (نیل)دا نەهێڵێتو، ئەوەی مەبەستیەتی بیهێنێتەدی، هەڵمەتی دووەمی بە (٢٠٠٠) سەربازەوە کە باشترین سەربازانی (نورالدین) بوون ئەنجامدا، دوای ماندووبونێکی زۆر گەیشتن بە (الجیزة)، چونکە گەردەلول لە دەشتاییدا هەڵیکردە سەریانو، لمێکی زۆری کرد بەسەریاندا، دڵەکانی ناڕەحەت کرد، ئەمانە ئاستەنگێکن پێویستییان بە ئارامییەکی جوان هەیە، هەڵوێستەکە ترسناك بوو، سوپای (ئەموری) لەسەر کەناری چەپی ڕوبارەکە وەستا بوو، لەلای بەرامبەریشەوە سوپای (اسدالدین) دەجووڵاو ئامادە دەبوون، چەند ڕۆژی خایاند (ئەموری) خۆی بۆ پەڕینەوە سڵنەکردو بایەخی پێنەدا، چونکە نەخشەی کێشابوو کە شەوێکی تاریك کاتێکی بێترسەو سوپای (نورالدین) خەوتوون وبێئاگان هەڵیان کوتێتە سەرو پەلاماریان بدات. (اسدالدین) کە شتی زۆری بەرچاو دەکەوت بۆلای سەربازگەی خاچ پەرستی دەچوونو، دەیزانیێ نیازیان هەیە بپەڕنەوەو ژمارەیان ئەوەندە زۆرە کە دەتوانن سوپای ئەو ببەزێنن، بۆیە فەرمانی دا کە بۆ (الصعید) بکشێنەوە، فەرەنگی وایانزانی کشانەوە مانای زەبوونیو کزییە، بۆیە شوێنیان کەوتنو (اسد الدین) سەرکردایەتی لە نێوان خۆیو براکەیدا دابەشکردو دەستوری پێدا کە خۆیو تیپێکی گەورە لە سوپایەکی لە پشتەوەی کشتوکاڵو کێڵگەکاندا

حەشار بدەن بە شێوەیێ کە خاچ پەرستەکان پەی بە هیچ شتێ نەبەن، کاتێ جەنگ لە نێوان ئەوو خاچ پەرستەکاندا دەستی پێکرد دڵنیـا بـوو کـە دوژمـن لـە دواوە پەلاماری نیە، (سەلاحەددین)و تیپەکەی لە پشتەوە بە شمشێر هێرشی بردنە سەرو، بەم نەخشەو پلانـە لێزانییـە سـوپای ئیـسلامی تـوانی گـرەوی جـەنگ بباتـەوەو (ئەموری)و ئەو سەربازانەی بە ساغی رزگار بووبـوون بـەرەو (قـاهیرە) کـشانەوە، ژمارەیان ئەوەندە زۆر بوو کە شکانیان جێگای ناڕەزایی بوو!

لە هەمبەر زۆری سوپای خاچ پەرستیو کەمی سـوپای (اسـدالدین)دا، لەگـەڵ کۆمەکی بەردەوامدا کە (شاور) پێشکەشی سوپای فەڕەنگی دەکات کـە توێـشووو خواردنەوەیان بە زیادەوە هەبووە هەڵوێستەکە ورد بـوو، ئەگـەر بـەراوردی بکـەین لەگەڵ ئەو تەنگانەیەی لەشکری ئیسلام لەناویدا بووە کە جگە لە کۆمەکی بـەدزی هاولاتیان نەبێ هیچ دەروی لێنەدەکردەوە! ئەمەش (اسدالدین)ی هانـدا کـە سـوپا بکات بە دوو بەشـەوەو لـە (الـصعید) بمێنێتـەوەو چاوەڕوانی بـووار بکـات بـۆ هێرشکردنێکی تر بۆسەر (قاهیرە) لەکاتی توانینیدا، هەرچی (سـەلاحەددین) بـوو چووە (ئەسکەندرییە) بۆ داگیرکردنیو بەرگری لێکردنی لە هـەر مەترسـییەك کـە چـاوەڕوان بکـرێ، چـونکە کەشـتیگەلی فـەڕەنگی لـەکاتی پێویـستیدا بـۆ کۆمەکیکردنی جەنگی بۆ (ئەموری) ڕووی لەوێ دەکـرد! (سـەلاحەددین) لـەپێناو بەرگریکردنیدا لەو شارەیە زۆر تەنگانەی بینـی، شـارەزاییو کارامەییـەکی زۆری پیشاندا لە ئازایەتیداو دڵی خەڵکی وا لێکرد کە لەناو قەڵاکاندا (الثغـر) لـەدەوری ئەودا کۆببنەوە، بە ئازووقەو تفاقو پێداویستی هەرچی هەیەتی کۆمـەکی کـردن!! بەڕاستی (سەلاحەددین) لە تەنگو چەڵەمەیەکی توندا بـوو، ئەمـەش لەکاتێکـدا بوو کە پێشبینی (اسد الدین) لەمەڕ هاتنی کەشتیگەلی فەڕەنگی دابووی هاتەدی کە تریشقەی وێرانکـەریان هـەڵگرتبووە، بـەڵام تـا (٧٠) ڕۆژ لـە بەرامبـەر ئـەم کارەساتە ترسـناکەدا خـۆی ڕاگـرت کـە خـۆڕاگرتن لەبەرامبەریانـدا ئەسـتەمەو ناتوانرێ، هـەواڵی تەنگـەتاویو بێـزاری خـۆی گەیانـدە (اسـد الـدین)و ئـەویش

سوپایەكی بە پەلەی نارده سەر (الجيزة) بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ فەرەنگەكاندا تاسەریان قاڵ بكات لە دابەزین لەگەڵ (سەلاحەددین)دا لە (الثغر)دا، ئەمەش كارێكی سەركەوتوانە بوو، كاتێ (ئەموری) زانی سوپای ئەو لە مەترسی دایە فەرمانی بە گەڕانەوەیان دا بەرەو (قاهیره) و، جەنگ شەكەتی كردبوو پێشنیاری كرد بۆ (اسدالدين) كە هەردوولایان بۆ قاهیره بكشێنەوە ئەمەش ڕێكەوتێك بوو جێگای حەزو ئارەزووی هەردوولا بوو، دەشێ بووترێ ئاگربەستێكی كاتی بوو، تا ماندووەكانی هەردوولا پشویەك بدەن‌و بحەسێنەوە.

(ئەموری) باری كردو، دڵیشی وەكو ئاگر بڵێسەی دەگرت‌و بۆ (میسر) دەسوتاو تەماعی تێكردبوو، چونكە ئەگەر لەگەڵ (قودس)دا بەراوردی دەكرد ئەوێ خاكێكی كشتوكاڵی‌و بە میوەجات‌و بە بەرهەم بوو، كەمترین لەیەكترچوون نابینێت، ئەو پەیامنێرو قاسیدانەی ڕەوانەی كردبون بۆ مۆركردنی پەیمانەكە لە كۆشكی خەلافەتدا بەر لەباركردنی دا گوێیانی بردبوو هەندەی باسی خۆشی ناو كۆشكەكە بكەن وەكو سەقفی زێڕین‌و زیوینەكەی‌و قەنەفەو كورسی ئاوریشم‌و كۆشكی میوانداری‌و چێشتخانە، بە خەڵكی وت: (بەغداد) لەگەڵ بوونی (مەككە)و (مەدینە)شدا پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامییە، حەج لە مەكەدا دەكرێ‌و مەدینەش گۆڕی پێغەمبەری ئیسلامی لێیە، ئەی بۆچی منیش لە (قاهیره) دانەنیشم‌و سود لە خێرو بێرەكانی وەرنەگرم‌و، (قودسیش) پایتەختێكی ئایینییە، وەكو (مەككە) لە چاخی عەبباسیەكاندا؟ لەمەش پتر هەوڵی دا ویستی پاشای (قوستەنتینییە) ڕازی بكات كە بیكات بە زاوای خۆی كچەكەی خۆی لێ مارە ببڕێت، هەتا یارمەتی بدات بۆ گرتنی (میسر) و، ئایندەش هیچكەس نەبینێ ململانێی بكات بۆئەوە شای (بێزەنتی) دوای ئەوەی بووە زاوای ئەو گفتەی پێدا.

(ئەموری) چاوەڕوانی ئەوەی نەكرد هەتا سوپای (قوستەنتینیە) دێتە هاریكاری بۆ ئەو داگیركردنەی چاوەڕوانی دەكات، بەڵكو بەئاشكرایی پەلاماریداو خۆی تێكرد، كاتێك گەیشتە (بەلبیس) كەوتە كوشتن‌و تاڵان‌و ڕوخاندنی خانوی هاوڵاتییان، وەك

بلێی بیرەوەری پڕ لە ئێش‌و ژانـی قودسـیان بخاتـەوە یـاد، کاتـێ چـوونە ناویـەوە خاپوورو وێرانیان کرد، ئەو جۆرە ترسە سامناکەش هیچ هاوڕێیەکی بۆ ناهێڵێتەوە پەیمان‌و گفتی لەگەڵدا ببەستێت. (شاور) بەزانینی ئەم کوشتن‌و تـاڵان‌و بنەبڕکردنـە بێ هۆیە سەری سوڕما، لەکاتێکدا کەس شمشێری لە دژی ئەوانـدا هەڵنەکێـشاوە! نامەی بۆ نووسی‌و پرسیاری لەم مەبەستەی ئەو کـرد، ئـەو پاسـاوەی هێنـاوە کـە (شاور) ئەو بڕەپارەیەی لەسەری ڕێك کەوتبون کە بە کۆمەکی ڕەوانەی بکات دوای خستووە کە ئێستا زۆر پێویستی پێی هەیـە، ئـەنجا هێرشـەکەی بـەرەو (قـاهیرە) دەست پێکردو (شاور) لەوە ترسا بنکەی سەرەکی ئەو لە قاهیرەدا کـە (فـسطاط)ە داگیر بکات، بۆیە فەرمانی بە سوتاندنی دا لە تراژیدیاو گەرمەساتێکی ترسـناکی وادا کە هەرگیز مێژووی (میسر) بەخۆیەوە نـەبینیوە، ئەمـەش گومـانی تێدانیـە کارێکی شێتانە بوو، چونکە هەر چەندە فەڕەنگییەکان لەناویدا بمێننەوەو خراپـەی تێدا بکەن نایگەیەننە ئاستی سوتاندنێکی وێرانکەرو قڕتێ خەڕی ئاوا. لەکاتی ئەم ئاگر کەوتنەوەیەدا کەبە نەوت کرابۆوە دانیشتوانی ئـەو شـوێنە بـە پەلـە خۆیـان کۆکردنەوەو پێویستییەکانیان ئامادەکرد. بەمنداڵ‌و ژن پیاو پیرەوە بەسەرگەردانی‌و وێڵـی دەڕۆیـشتن، تـا پەناگەیـەك بـۆ خۆیـان لـە مزگەوتـەکان‌و حوجرەکـان‌و نەخۆشخانەکاندا بدۆزنەوە، بەڵکو تاسەر شەقام‌و ڕێگایەکان کە شوێنی ترس بـوون جێگای لێکەوتبوون‌و بەسەریەکدا کەڵەکە بووبوون کە نە خواردن نە جل‌و بەرگ نە پێخەفیان پێنەبوو، تەنیا ئەوەندەنەبێ کە خەڵکی قاهیرەی برایـان بـە خێـر بۆیـان بهێنن، لـەو بەلایـە زۆر بـێ ئـارام‌و نائومێـد بـوون وخەلیفـەو ڕاوێـژکارانی لـەو داگیرکردنە دەرەکیەو سوتاندنە ناوەکییە پەرێشان بوون، (العاضد) پەیامنێری خۆی بە گریانەوە نارد بـۆ داواکردنـی یارمـەتی لـە (نورالـدین). هەنـدێ مێـژوونووس نووسیویانە ئەو کەسەی داوای فریادڕەسی دەکات (شاور) بووە، ئەمـە بەڕێتێـچوو نازانم، چونکە ئەو لێك تووڕەبوون‌و لێك سوربوونەوەیەی لە نێوان (نورالدین)و ئـەو وەزیرە ناپاکە ڕوویدا هیچ ڕێگایەکی بۆ نادۆزێتەوە پەنای بباتەبەر. (اسدالدین) ئەم

هەڵوێستە خراپە باش هەڵدەسەنگێنێو (نورالدین) هاندەدات بۆ جەنگ کردن. ئەوکەسانە هەڵوێستەکان تەنیا بە هەلپەرستی ڕاڤەدەکەن دەڵێن: (اسد الدین) بەتەما بووە ببێ بە گەورەی میسرو لە (نورالدین) دابببڕێو سەروەرییەکی سەربەخۆ بۆ خێزانی کوردی بگێڕێتەوە کە هاوشانی خێزانی نورالدین بێ لە شامدا.

ئەمەش دوورە، چونکە ئەگەر سەربەخۆیی مەبەست بووایە (اسدالدین) لەم بارەوە قسەی خۆی لەگەڵ (نجم الدین)ی برای دەکرد، هەم لەگەڵ (سەلاحەددین)ی برازاکەیدا، (سەلاحەددین) لە هەمووکەس زۆرتر بە دەنگییەوە دەچوو، کەچی پێناخۆش بوونی خۆی دەرخست کە بۆ جاری سێیەم بڕواتەوە بۆ جەنگ، بەڵکو ئەوەی بیری مامی خستەوە کە چەندە کارەساتی لە (ئەسکەندەریە) تووش هاتووە لەکاتی ئەو تۆقکردنە درێژخایەنەدا تا لە هەندێ حاڵەتی دژواردا ئەگەر خودا پەنای نەدابایەو خۆراگری پێ نەدانایە خەریك بووە لەناو بچێت! ئەو نارەحەتییەی دوێنێ دیبوی بۆ سبەش لەهەمان نارەحەتی دەترسا، بەڵام (اسدالدین) زۆر داوای لێکرد تا وەڵامی دایەوەو قایل بوو. (ابن اثیر) لە مێژوی خۆیدا باس لەوە دەکات کە ئەو کەسەی داوای فریاکەوتنی لە (نورالدین) کردووە خەلیفە (عاضد)بووە، هەستی خێزانو ژنەکانی وەکو پەنابردنو پاڕانەوەیەك بۆ ڕەوانەکرد کە ئەو ناتوانێ پارێز لە ژنو منداڵی خۆی بکات نەخوازەی خێزانو ژنی مسوڵمانان؟ ئەمەوای لە (نورالدین) کرد بۆ جاری سێیەم داگیرکردنەوە دەست پێ بکاتەوە، بەڵام (ئەموری) وێڕای پەنا بردنو سکاڵانامەکانی (شاور) سوربوو لەسەر چوونە ناو (قاهیرە)وەو دەیوت: ئەگەر میسریەکان چاویان پێ بکەوێ ئەو برە ماڵەی ئەو دەیەوێ ئەوان دەستی لێهەڵدەگرنو دەیدەنێ، پاشا زۆر بەتەماع بوو، خەونی بە دەوڵەمەندی زۆرەوە دەبینی تا سامانێ پێکەوە بنێ بتوانێ سەربازی زۆرتر لە ئەوروپا بێنێ بۆ نەهیشتنی توانای مسوڵمانان، بەڵکو بۆئەوەی میسر بکات بە هی خۆیو دەست بەسەر سامانی کوڕەکانی دا بگرێت.

(نورالدین) دوای ئەوەی بینی کە خەلیفەو وەزیرو سەرکردەکان سەریان بۆ دوژمنان شوڕکردووە ئەو کارە بێ ئابڕوویەیان کرد لەوەی نائومێد بوو کە تازە چاك بنو لەناو دڵی خۆیدا وای دانابوو کە (اسدالدین) وا لێ بکات لەو وڵاتەدا بمێنێتەوە بێ گەڕانەوە، تا (میسر)و (شام) لەکاتی جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنی داگیرکەردا یەك دەوڵەت بن، (اسدالدین) لەوە حاڵی ببوو، بێ نکۆڵی کردن دەیویست ئەنجامی بدات، ڕەحمەتی خوا وابو کاتێ ئەموری زانی بە سوپایەکی زۆرەوە هاتووەوەو گەیشتووە ترسی لێ نیشتو هەستی بە کزیو لاوازی (شاور) کرد کە یارمەتی مەبەستی ئەو بدات، چونکە گەل لەگەڵ ئەودا نییە! پاشان (شاور) بە هاتنی (اسدالدین)ی زانیو دورخستنەوەی خۆی لە (ئەموری) دەرخستو ئاگاداری کردەوە کە پێویستە وڵات بەجێ بێڵێ بەبێ داواکردنی هیچ پارەیەك. هەواڵی پێگەیشت کە سوپای (اسدالدین) چەکی تازەی پێدراوە کە لە جەنگی داهاتوودا یەکلایی دەبێت و، (ئەموری) بە چاکی زانی کە بەدەستخەڕۆیی بگەڕێتەوەو شەڕ لە نێوان سوپاکاندا ڕوو نەدات.

پێشوازی کردنی هاوڵاتیان لە (اسدالدین) گەیشتبووە ئاستی بەخێرهێنانو بە دڵا چوون دا، خەلیفە لە کۆشکەکەیەوە بە چادرەکەیەوە چووە پێش ئەو بۆ دیمانەو ژوانی ئەوو، قەتیش شتی ئاوای بۆ کەسی تر نەکردبوو، (شاور) بینی خەلیفەو (اسدالدین) نێوانیان زۆر خۆشەوە وەکو خۆشەویستی نێوان دوو هاوپەیمانە، بینی (اسدالدین) سەرکردەی سوپایەو خۆشەویستی گەلی (میسر)ییەو خەڵکی تێکڕا بەیانیو ئێواران بە ناوی ئەوەوە هاوار دەکەن، هەبوو لەوانەی سەردانیان دەکرد بە چاوی بێ هیوایی سەیریان دەکرد، وەك ئەوەی خۆری لەسەر سوێ بێ بۆ ئاوابوونو ڕۆژیان بۆ دەژماردن، ئەنجا کەوتە فێڵ کردن لە دڵیداو بە دڵیدا هات کە ئاهەنگێ بۆ سوپای (ئەسەد) لە کۆشکەکەیدا بکات، (اسدالدین)و پیاوەماقوڵانیو ڕاوێژکارانی بێ ترسو بێ خوست بۆ ئەوێ بێن، پاشان لە هێکڕا هێرشێکی خوێناوییان بۆ بکاتو بنەبڕیان بکات، وەکو چۆن هەمان بۆسەی بۆ هەردوو

کێبەرکێکەرەکانی نایەوەو، بەباشی زانی (الکامل شجاع)ی کوڕی دەستی ئەو بێ لەو پلانە ستەمکارانەیەدا.

(کامل) پیاوەتیو دڵسۆزی مەردایەتی تێدابوو، بە دەم باوکیەوە هاواری کرد ئەگەر لەسەر ئەم ستەمە سوربێ خۆم دەچمەلای (شێرکۆ) نیازی تۆی لای بەیان دەکەم، باوکیشی بە سۆزەوە ووتی: بە خودا کوڕم ئەگەر ئەم کارە نەکەم تۆ بەر لەمن بە شمشێری (سیف الدین) دەکوژرێی، کوڕە گەورەکەی بەڕووی باوکیەوە دەنگی بەرزکردەو ڕاست دەکەی ئەگەر کوژراین ئێمە مسوڵمانینو ئەمە وڵاتی مسوڵمانانە باشترە لەوەی ئێمە لەکاتێکدا بکوژرێین کە فەرەنگ داگیری کردووە، ئەگەر ئەوان هەواڵی کوژرانی شێرکۆ بزانن هێرشمان دەکەنە سەرو، دوای ئەوەش قەت (نورالدین) دوای ئەم ڕووداوە یارمەتیمان نادات!!.

ڕەنگە ئەم هەواڵەی تایبەت بە پلانەکە دەنگودۆی بۆ (اسد الدین) گوازرابێتەوەو، ئەو دەیزانی (شاور) ستەمکارو فێڵاوییەو وازی لێ نەهێناونو ئەم هەواڵەی ئەم بەدکارە ستەمکارەی بە گوێی (سەلاحەددین)دا چرپاند وبەباشی زانی پرسو ڕاوێژ بە خەلیفە بکات، ئەویش ئەم تاوانەی وەکو بووڕکانێ لە سنگییەوە داگیرساو سوربوو لەسەر ئەوەی زەبرەکی لێ بووەشێنێ، ئەم کارەشی بە (سەلاحەددین)ی برازاکەی سپارد.

(اسد الدین) دەیزانی (شاور) فێڵاوییەو دەیزانی کە هەست بەوە دەکات کە ئەو سەرکردانەی بەسەرکەوتویی گەڕاونەوە چییان لە دڵدا هەڵگرتووە لەبەرامبەری دا، ئەو ئاگای لە خۆیەتیو کە لەکاتێکدا دەڕویشتن کۆمەڵێ پاسەوان لە پێشیەوە بوونو، لە دواوە پاساوانیان دەکردو، ڕاستو چەپ ئاگادارییان دەکرد، پاشان سەربازی کرێگرتەی هەبوو لە ساتی تۆڵەدا دەهاتنە هاریکاری، بۆیە خوێن لە هەردوولا دەڕژێ بێئەوەی ئەمە پێویست بکات، لەبەر ئەوە وای بەباش زانی چەند ڕۆژێ لە شوێنی خۆی بمێنێتەوەو بڵاوی بکاتەوە کە ئەو نەخۆشەو پزیشک

دێنەسەری بۆ چارەکردن، (شاور)یش ناچار دەبێ بێتە سەردانکردنیو بێپاسەوان لەگەڵیدا دادەنیشێو، ئەوکاتە (سەلاحەددین) بێ ترس بە ڕۆڵی خۆی هەڵدەستێ، ئەم بۆچونەش لە هەموو بۆچونەکان لە ڕاستییەوە نزیکە، چونکە گێڕانەوەی تر هەیە دەڵێ: شاور لە ڕێگای گشتی دا کوژراوەو (سەلاحەددین) لەگەڵیدا بووەو، پاشان هەلی بۆ هەڵسوڕاوە کوشتویەتی ئەوەش لە ڕاستییەوە دوورە، چونکە ئەی کوان پاسەوانەکانی وکوان پیاوانی تایبەتی خۆی کە وەڵامی ئاماژەی بدەنەوە! هەر چۆنێ بێ ئەم ناپاکە لەناوبراو گورج (اسد الدین) چووە سەردانی (عاضد)و بەرگی وەزارەتی کردە بەریەوە بە شای سەرکەوتوو ناوی برد. سەردەمێ ڕۆیشتو سەردەمەکی ترهاتو خودا ئیسلامو ئەهلی ئیسلامی سەر بلند کردو، دووڕوییو ناپاکیو ئەهلەکەشی سەر شۆڕو ڕیسواکرد.

# وەزارەتى سەلاحەددين [1]

ماوەى وەزارەتى (اسد الدين) لە وەزارەتەكەيدا درێژەى نەكێشا، دواى دوو مانگ كتوپڕ بێ نەخۆشى مرد، ئەو دەسەڵاتێكى تەواوى دەشكا بەسەر دەوڵەتداو، سوپايەكەى لە شامدا ڕەچاوى ئاستى ئەويان دەكردو بە خاوەن زێدە چاكەى يەكەمينيان دەزانى لە لێخوڕينى كەشتيەكەداو دوژمنەكانى ئەو لە پاشماوە لەناوچووە جۆراوجۆرەكانى لە زەبرو زەنگى ئەو دەترسان، دەيانزانى ئەگەر فەڕەنگو كۆشكيشيان لەگەڵدابێ ناتوانن زۆرانبازى ئەو بكەن، چۆن ئەوە دەبێ ئێستا خاوەن دەوڵەتەو، خەليفە گوێڕايەڵى دەكات؟!

بەڵام ئەوكەسەى دەركەوتنى ئەوى بەمەترسيدار دەزانى خۆى لێدوور دەگرتو پەناى دەدا!

---

١) وشەى وەزير وەكو لە (مفردات الراغب)دا هاتووە بە واتاى (المعاونة) دێ واتە هاريكارى كردن، (وزرت فلانا) واتە يارمەتى فيسارم دا. خودا دەفەرموێ: (وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي) (طه-٢٩). لە زاراوەى هاوچەرخدا وەكو لە (المنجد فى اللغه / لويس معلوف)دا هاتووە (وەزير/ كۆيەكەى وەزيرانە، پلەى وەزيرو دەسەڵاتەكەيەتى. كە ئەو كەسەيە پادشا يان دەسەڵاتى باڵا لە وڵاتدا دەستنيشانى دەكات تا كارەكان بەڕێوە ببات لە دەوڵەتداو، ڕاوو بۆچونى ئەو وەردەگرێت. لە دەوڵەتى تازەدا وەزير زۆرن وەكو: وەزيرى دادو وەزيرى ناوخۆ و، وەزيرى دەرەوە) بەو پێيە وزير لە سياسەتى ئيمرۆدا بووە بە زاراوە كە زاراوەيەكى قورئانييەو لە فەرهەنگى ئينگليزيدا بە (Ministry) هاتووە. وشەى پەرلەمان (شورا) لە قورئان وەرگيراوە: (وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ)، واتە: كارى ئەوان ڕاوێژە لەناو خۆياندا. وشەى (السياسة) وشەيەكى ئاينييە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {كانت بنو اسرائيل تسوسهم الانبياء}. رواه البخاري. واتە: (بەنو ئيسرائيلەكان) پێغەمبەرانيان سياسەتى ئەوانيان بەڕێوەدەبرد. لە (لسان العرب)دا هاتووە: (السياسة: القيام على شيء بما يصلحه). زاناى يۆنانى سوكرات دەڵێ: (سياسەت هونەرى حوكمە) / النظام السياسة / د: ثروة بدوي. لە فەرمودەدا هاتووە: {ان اصحاب رسول الله ﷺ وزراءه}. رواه احمد. واتە: يارانى پێغەمبەرى خوا ﷺ وەزيرى ئەوبوون. (وەرگێڕ).

(اسد الدين) پیاوەكی بە هەڵوێست بوو بێئەوەی كەس ڕكابەری بێ، بەڵام پارویەكی چەور لە قورگیدا گیربوو نەیتوانی قوتی بدات وخنكا، لەكاتێكی دژواردا مردنی ئەو ڕاگەیەندرا كە هەواو ئارەزووكان لەمەڕ ئەودا وەكو یەك نەبوون، كەسانێ لە سەربازانی شام هەبون بە تەمای شوێنی ئەو بوون، نەك هەركەسێ تەماشای ئەوەبكات، بەڵكو ڕكابەری هەبوون كە بەهۆی‌و ناكۆكییان جیاوازی ئەوانی دەبیست. لە كۆشكی خەلافەتدا هەبوو لەو بڕوایەی دابو دەسەڵات‌و پایەو شوێنی ئەو تازەنەما، چونكە خۆری (اسد الدين) هەموو ئەستێرەیەكی درەوشاوەی داپۆشی‌و بە شێوەیێ سەیری مردنی ئەوی دەكرد كە هەناسەدانێ بێ بۆ ڕق‌و كینە كپبووەكانی‌و، بەسەرەتایەكی دادەنا بۆ كارێكی نهێنی كە بێگومان ئەوەی مەبەستیەتی لە نەخۆشی دەیهێنێتەدی‌و دەتوانێ پەیوەندی بە فەڕەنگەوە بكاتەوە تا جارێكی تر تراژیدیای (شاور)و (ضرغام) بگێڕێتەوە! ئەگەر تراژیدیاو كاولكارییەكانی (شاور)و (ضرغام)یش جارێكی تر بگەڕێتەوەو كەس نەمێنێ‌و، جەنگی ناوخۆو ئەهلی بقەومێ‌و خوێن برژێ چ زیانێ بەو دەگات مادام ئەو بە دەسەڵاتی بگەیەنێت!

فەڕەنگیش لە ڕق‌و قینەكی ترسێنەردابون، چونكە دەسەڵات لەبەردەستی سوپای (نورالدين) دابوو سەركردەیەكی لێزان بەڕێوەی دەبردو، بە دوای هەلێكی زێڕین دا دەگەڕان بۆ داگیركردنی (میسر)و، لە ڕابردوو بە بەهرەكانی ئەوێ ئاشنابوون‌و خەونیان بەوەوە دەبینی كە هەمیشە لەنێوان (نیل)و (مێرگوزار)و (باخچەكانی)دا بمێنێتەوە. هەموو ئەوانە ڕاستییەكی هەست پێكراو بوون بە دڵاندا دەهات‌و، پیادەڕەوەكان لەكاتی تەریكی‌و تەنیاییدا، كە بێ ترس بوون ئەو قسانەیان پێكەوە دەكرد...

بەڵام پێویستە هەڵوێستەكە بە پەلە یەكلا بكرێتەوە، لە سوپای (اسد الدين) فەقیهەكی ناودار هەبوو، هەموو سوپا گوێڕایەڵی بوون، چونكە بڕوادارەكی ڕاستەقینەو دڵسۆزبوو، دنیا نەویست‌و زاهید بوو، ئەویش (شێخ الامام عیسی)ی

هەکاری[1] بوو، هەڵوێستێکەی زیرەکانەی تاوتوێکردبوو، دەیزانی (الیاروقی) بە تەمای سەرکردایەتییەو چاوی تێبڕیوە کە سەرکردەیەکی ناسراوی سوپایەو ڕابردوو تێکۆشانی خۆی هەیە، یەکێکی تر لەوانە (الجامري)یە کە خاڵی (سەلاحەددین)ەو، برادەری (أسد الدین) بووە، وە(قطب الدین) کوڕی (تلیل)، ئەو بە ئاشکرایی کارەکانی ناکات، بەڵکو بە نهێنی کاردەکات بۆئەوەی خەڵکی ڕقیان لە (الیاروقی)و (الجارمی) ببێتەوە، مانای وایە بەروبوومەکە دەکەوێتە ناو دەستی ئەوەوە! ئەنجا (سەلاحەددین) هەیە کە لە هەمویان بچوکترە، بەڵام لە هەموویان ئازاترو دلێرترو بە پلانترە، بە تاکتیکترو بە پلانترە [2] ئەمە بابەتی بیرکردنەوەی فەقیه (عیسای هەکاری) بوو کە دەستیکرد بە هاوسەنگی کردنو بەراوردکردنو نزیكو دورخستنەوە هەتا لەوە دڵنیا بوو کە (سەلاحەددین) دیاری بکات، لە کارەکەیدا بوواری دوودڵیو چاوەڕوانی نەهێشتەوە، بەڵکو چووە لای (یاروقی)و لێی حاڵی کرد کە فەقیهەکانو گەورە سەردارانی سوپا وای بە چاك دەزانن (سەلاحەددین) نزیکترو گونجاوترە ئەگەر ئەو یاخی ببێو لابدات ناکۆکی لەناو ئەم کۆمەڵە توندو تۆڵەدا پەیدا دەکات. (یاروقی) بە پێچەوانەی فەقیهەکان وای دەبینی کە ئەمە لە توانای ئەودا نییەو بەئاشکرایی جیاوازی خۆی ڕاگەیاندو

---

١) لە داهاتوودا زیاتر ئەم زانایەتان پێ ئاشنا ئەکەین. وەرگێڕ

٢) (صلاح الدین) جگە لە قازی (عیسی)و (الجارمی) زۆر سەرکردەو پیاوی تری ئازای کوردی لەگەڵ بووە، وەکو: (سلطان مظفر الدین) کە لە (٥٨٦ ك)دا هاتە سەر کورسی دەسەڵات لە ئیمارەتی (بەکتینی دا) (٥٢٢ — ٦٣٠)داو هاتە شوێنی (زین الدین یوسف)و کە ئەویش شانبەشانی (سەلاحەددین) بووە. وە (عزالدین موسك) باوکی (ابن حاجب الکردی)و قازی (محي الدین ابو حامد شارەزووری) کە پشتگیری (سەلاحەددین) بووە، وەکو لە (ابن الاثیر)دا هاتووە، واتە شێروانی ززاری کە یەکێ بوو لە میرە کوردەکانو، (خشترین)ی هەکاریو، (حسام الدین حسین کوڕی باریکی مەهرانی) و، (سیف الدین المثطوب)و، چەندان میری تری گەورەی کورد کە ناویان لە (مشاهیر الکرد)و (نوادر السلطانیة)و (الکامل ابن الاثیر)دا هاتووە.

سەربارەی (ابو هیماء السمین) کە ناودارێکی کوردە لە سەردەمی (سەلاحەددین)داو، خەلیفە (ناصرالدین الله) بانگی دەکات، تا سەرۆك سوپابێ بۆسەر هەمووانو ئەویش دەڕواتە بەغداد، بەڵام بەهۆی ناکۆکییەك وازلە دەسەڵات دێنێو لەکاتی گەڕانەوەی دا بۆ هەولێر لە داقوق دەمرێو لەوێش نێژراوە. نموونەی براکانی وەکو (بردی تاج الملوك)و (فەروخ شا) و، کوڕەکانی وەکو (ظاهر) ......... (وەرگێڕ)

بڕیاری دا لە تەواوی (میسر) دوور بکەوێتەوەو، پەیوەندی بە سوپای(نورالدین)ی گەورەی خۆی بکات، هەر ئەمەش هاتەدی[1] دیسان جەنابی فەقیه چووە لای (جارمی)و پێی ڕاگەیاند کە کۆی دەنگەکانی هەڵبژاردن بۆ (سەلاحەددین)ەو (یاروقی) تووڕە بووەو جیابۆتەوە، ئەگەر ئەویش دەیەوێ لە ڕای گشتی دەربچێ با ئێرە بەجێ بهێڵێت. (جارمی) لە دڵی خۆیدا وتی، ئەگەر (یاروقی) نەیتوانیبێ بەرامبەر (ڕای گشتی) ڕاوەستێ من چی بکەم؟ ئەنجا ئەو ڕایەکەی پەسەند کرد. ئاساییە کە (ابن تلیل)یش دەبێ ملکەچ بێ‌و لایەنگری نیە بیپارێزێ، بەوهۆیە (سەلاحەددین) بوو بە پیاوی جێگا.

فەقیهەکان هەموویان چونە لای (عاضد) پێیان ڕاگەیاند کە ئەوان بە ڕای گشتی هەڵیان بژاردووە و، بۆی نیە پشتگوێی بخات، هەندێ نووسەر هەیە بڕوایان وایە کە (العاضد) بۆ خۆی لەسەرەتادا (سەلاحەددین)ی هەڵبژارد، لەودەمەدا بینی لە هەموو پاڵاوتەکان بەتەمەن بچوکترە، کاتێ ئەوانەی خۆیان بە گەورەتر دەزانن خۆیان بەسەر ئەودا هەڵدەکێشن دەمەقاڵێ پەیدا دەبێ‌و ئاژاوە لەناو سوپای غەزاچی دا پەیدا دەکات، ئەمەش لە ڕاستی دوورەو عەقڵ بڕی ناکات، چونکە (عاضد) فەرماندان‌و یاساغکردنی لەژێر قەڵەمڕەویدا نەبووە، بەڵکو هەموو هیوای ئەوە بووە کێبڕکێکەران وازی لێ بێنن‌و ئیشی ئەو لە سنوری کۆشکەکەیدا بێت.

دەرچوونی دەسەڵات لەدەستی (العاضد)و نازناونانی (سەلاحەددین) بە پاشای سەرکەوتوو (الملك الناصر) دەستەو پەیوەندی شای لەپێش هەموویانەوە ئەمینداری خەلافەت کە سەرۆکی پاسەوانەکان بوو بۆ پەیمان بەستن ناچار کرد، ئەوان سور دەیانزانی (سەلاحەددین) هۆشیارەو لە تواناو دەسەڵاتیان دەخات‌و بڕیارەکان بە ناوی خەلیفەوە دەردەکات بێنەوەی کە ئیمزای ئەوی پێوە هەبێت، ئەمەش خەفەتی لە دڵدا پەیداکردن‌و، جگە لە چاوەڕوانیکردنیش هیچی تریان لە پێش نیە.

---

١) یاروق کوڕی ئەرسەلانی تورکمانییە، هۆزی یاروقی تورکمانی دەدرێتە پاڵ ئەو بە پێی (النوادر السلطانیة) لە (٥٦٤ ك)دا مردووە. یاروقی وشەکی تورکییە واتە: ڕەوەند (وەرگێڕ)

(سەلاحەددین) هەر لەوکاتەدا کە گەورە دەبێ (نورالدین) دەکات بە نموونەی بالاّی خۆیو هیوایەتی دەبێ، کە ببێ بە پاسەوانی ئیسلام لە دەستی خاچ پەرستەکانو فەرمانی ئەوو ڕێو شوێنو پلانەکانی ئەو بگرێتەبەر، کاتێ بەشانی دەسەلاّت بەختەوەر بوو هیوای بۆ دەگەڕێننەوەو پێ لەسەر ئەوەدا دادەگرێ کە شمشێرێکی بڕندەبێ لە شمشێرەکانی ئیسلامو لە دڵی خۆیدا وتی: من بۆ سێیەم جارە هاتمە ئەم وڵاتە بە ناچارییەوەو، خودا ویستی لەسەر ئەمەیەو کاری خۆی بەمە هەیە، ئەوە خەریکە تروسکە دەرەوشاوەکانی دەربکەونو هیچ بەربەستو ڕێگرێ نیە لەم مەبەستەم بگێڕێتەوە،[1] وەبانگی هاوڕێیەکەی کرد بەناوی قازی (فاضل) کە (ئەسەد الدین) خۆشی خۆشەویستیو متمانەی تایبەتی بۆ ئەو هەبوو، پێی وتیوو هەر لە ئیمرۆکەوە تۆ هاریکارو یارمەتیدەری منی: ئامانجەکان یەك شتەو، سەرکەوتنی خوا دوور نییەو، ئەو لە چاکەکارانەوە نزیکە.

سەلاحەددین وای بە باش زانی دڵی میسرییەکانو شامیەکان بەهەردوولاوە بۆ لای خۆی کەمەندکێش بکاتو بەشێکی زۆری لەو سامانە پێ بەخشین کە لە ژێر ڕکێفی (اسدالدین)دا بوو، وتی: ئەم گەلە دەکەم بە یەکڕیز لە بەرامبەر دوژمنێدا

---

١) مۆنیستکیۆ لە (ڕوحی یاساکان/ چ٢ و: ئیدریس شێخ شەرەفی دا/ هەولێر (ل: ٥٨٨)دا دەنوسێ: {بەشی چوارەم}: (دەرەنجامە ئەخلاقییەکانی مەسیحییەت ئیسلام} کاتێ سەرەنج دەدەینە سەر دەرەنجامە ئەخلاقییەکانی مەسیحییەتو ئیسلام، بێ دوودڵی ئەو بیرە بە مێشکماندا دێ کە پێویستە ئاینی مەسیحی قبوڵ بکەین، چونکە مەسیحییەت دەبێتە هۆی چاککردنی ئەخلاق بە پێچەوانەی ئیسلام کە ئەخلاق بەرەو تیژی دەبات) ئێمەش دەپرسین گەروایە ئەی چ بیرۆکەیەك وای لە خاچ پەرستەکان کرد کە ئەخلاق بەرەو توندوتیژیو داگیرکردنو کوشتن بڕینو تالاّنکردن ببات؟! کێ جەنگی جیهانی یەکەمو دووەمو ئەوانی تری دروست کرد؟! ئەگەر ئێمە سەیری قورئان بکەین دەفەرموێ: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ...﴾، واتە: بجەنگن لەپێناو خوادا لەگەڵ ئەوانەدا کە لەگەڵتاندا دەجنگنو دەستدرێژکاری مەکەن، وە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ﴾، واتە: خودا قەدەغەتان ناکات کە ئێوە لەگەڵ ئەو کەسانە کەلەگەڵتاندا ناجەنگن لە دینداو، شاربەدەرتان ناکەن لە خاکتاندا کە چاکەیان لەگەڵدا بکەنو دادوەرییان لەگەڵدا بکەن. ئایا کە ئیسلام ئەمەی هەڵوێستی بێ چۆن ئیسلام بە ناحەق تاوەنبار دەکرێت؟

کە، چاوی بڕیوەتە خاكو زێدەوە، پاشان کۆمەکی تازەی لە (نورالدین)ەوە پێگەیشت کە پشتی هەڵوێستی ئەوی قایم کرد، چونکە ئەو کۆمەکیو یارمەتییەی هاتووە دەریخست کە ملکەچی تەواو بۆ ئەوە، بێ هەبوونی ئەو ڕکابەرانەی لە ڕابردوودا هەیبوون،کە ڕەنگە هۆیەکانی لە داهاتوودادەربکەون، لەگەڵ ئەم کۆمەکیشدا(شمس الدین توران شا)ی کوڕی (ئەییوب) هەبوو کە برای (سەلاحەددین) بوو زیاتر پشتی ئەوی قایمو بەهێز کرد[1].

ناردنی (شمس الدین) بۆ لای (سەلاحەددین) ئەوە دووپات دەکاتەوە کە (نورالدین) تەنیا مەبەستی بەهێزکردنی تواناو هێزی ئیسلام بووە لە (میسر)دا، ئەگەر ئەم پیاوە تەڵەکەبازی (الدهاء) سیاسی هەبوایە لەوە دەترسا کە دووبرای پاڵەوان لە میسر پێکەوە کۆببنەوەو لەسەر یەك بۆچۆن بنو لەناو یەك سوپادابن ڕەنگە لە فەرمانی ئەو بڕۆنەدەرەوە، قەت تەڵەکەبازی سیاسی بە دڵی ئەو پاڵەوانەدا نەچو بوو، بەس بەرژەوەندی ئایینی مەبەست بوو نەك بەرژەوەندی خۆیو، بۆ بەهێزکردنی سوپای میسری خەباتی دەکرد، تا ببن بە درکێ لە بەرامبەری خاچییەکاندا، ئەمە تاکە مەبەستی بوو!

کاروباری ناوخۆی (قاهیرە) وەکو (سەلاحەددین) بیری لێدەکردەوە ئاوا هێوریو شێنەیی داینە پۆشی، چونکە ئەوانەی لە کۆشکدا دەسەڵاتیان لە دەستدا نەمابوو، پێیان دژوار بوو، کە ڕووناکییەکان بە تەنیا بخرێنە سەر وەزیرو لە فەرمانو یاساغکردنەکانی دوور بکەونەوەو، تەنیا لە چەند ئارەزویەکی شەخسیدا بە گوێی فەرمانداری بڕواداران بکەن کە لە مەسەلەی خواردنو خواردنەوە نەڕواتە دەرەوە.

(ئەمین داری خەلافەت) کە سەرۆکی پاسەوانەکانی فاتیمی بوو بڕیاری دەکرد کە نامەیێ بۆ شای فەڕەنگی ڕەوانە بکات بۆ یارمەتی خەلیفە بێت، (ئەموری) کە لە ڕقی لە دەستدانی (میسر)ی گڕی دەگرت، هیوای دەخواست بگەڕێتەوە بۆ پشتگیری ناوخۆو بە چەكو تفاقو سامان کۆمەکی بکات.

---

١) کورد دەڵێ: برا لە پشت برا بێ، مەگەر موقەدەر لەلای خوا بێت. (وەرگێڕ)

لە شانسی (سەلاحەددین) دابوو کە نامەکە بکەوێتە دەستی چاودێرو دەزگای سیخوڕی ئەوەوە بەرلەوەی بگاتە ئامانجی تاوانبارییەتی خۆیو، زانی چی بەشەوو بەدزییەوە بۆ دادەڕێژرێو، ڕاوێژی بە قازی چاکەکارکرد کە پێویستە بە پەلە چی بکاتو، وای ئاماژە بۆ کرد کە خۆی وانیشان بدات ئاگای لە هیچ نییەو قاسیدو نامەبەرەکە لە شوێنێکی تایبەتیدا زیندانی بکات، تا سەرۆکی پاسەوانەکانی خەلافەت وابزانێ نامەکەی بە ساغی گەیشتۆتە شای فەڕەنگی، پاشان بە دزییەوە بێئەوەی دوژمن پێی بزانن دیمانەیەك لەگەڵ ئەمینداری خەلافەت (سەرۆك پاسەوان) بکاتو بێ ترس بێ لەلایەنی ئەو و، دووربێ لەو پاسەوانە توندانەی لە هەموو لایەکەوە وەکو شەڵخە دەورەیان داوەو، ئەگەر بۆی هەڵکەوت بێدەنگو هاوار لەناوی ببات. (سەلاحەددین) وای بەباش زانی مۆڵەت بدات، تا ساتی چاوەڕێکراو هاتو، ئەمینداری خەلافەت بۆ هەندێ پێویستی خۆی لە کۆشکدا دادەبەزێ، ئەنجا ئەو کەسەی بۆ کوشتنی ئەوی دانابوو لەو ساتەدا هەڵی دەکوتێتە سەرو دەیکوژێ، ئەو سەرۆك پاسەوانە زیاتر لە (٥٠) هەزار سەربازی لەبەر فەرمانی ڕاوەستابوو کە هەموویان (سودانی) بوون، ئاژاوەی زۆریان لە دەوڵەتدا دەگێڕا، چونکە پشت قایم بوون بە هاندانی خەلیفەی فاتمیو سەرکردایەتی ئەمینداری دەوڵەت: کاتێ ئەوانە بەو هەواڵەیان زانیو شۆڕشی خۆیان بەرپاکردو پەلاماری سوپای (سەلاحەددین)یان دا کە زۆر بەوردی شوێنی ئەوانیان خستبۆو ژێر چاودێریەوە. جەنگێکی ترسناك ڕوویدا، لەسەرەتادا جەنابی خەلیفە لایەنی خۆی تێدا دەرخست بۆ سەرۆکی پاسەوانەکانو، ئەنجا کە شکان فەرمانی قەلاچۆکردنی دانو، خۆی بەری کرد لە گوناهەکانیانو پاشماوەکانیان، پاشماوەکانیان بۆ (جیزە) ڕایانکردو، (شمس الدین) برای (سەلاحەددین) ڕێیان کەوتو تا توانی زەفەریان پێ بباتو، ئەوەی بە ساغی دەرچوو، چووە خوارووی باشوری (الصعید)! (سەلاحەددین) زانی کە ئەو پاسەوانەی لە کۆشك ماونەوە ئەرمەنینو، هەمان نیازی پاسەوانە سودانییەکانیان هەیەو، فەرمانی دا بە پەرتەوازە کردنیانو

نەهێشتنی بنکەکانیان، ئەوەش باشتر بوو نەك چاوەڕوانی جەنگی تر بکرێت کە بێ پاساو خەڵکی تێدا بکوژرێت.

فەرەنگییەکان ئەو ڕووداوەی لە نێوان پاسەوانەکانو سەربازی (سەلاحەددین)دا قەوما پێیان زانیو بۆنیان کرد کە خەلیفەش لە سوپای (نورالدین) ڕازی نییەو ویستی ئیفلیج بووەو، لە کاروباری تایبەتی ئەودا حوکم دەکات سەرباری کاروباری دەوڵەت[1]، دیسانەوە (نورالدین) لەکاتی داگیرکردنی (میسر)دا بوو بە خاوەنی جێگاو دەسەڵاتی بەسەر تەواوی بەسەر بنکەکانی دەریاییدا گرت لە (ئیسکەندەرییە)و (دمیات)و شوێنی تردا، ئەم زاڵیەش دەسەڵاتێکی تەواوی لە بەشی خۆرهەڵاتی (حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست)دا بە مسوڵمانان‌دا، بەڵکو بەشێکی زۆری کۆمەکیش کە لە (ئەورووپاوە) دەهات بیپچڕێنێت. بۆیە (ئەموری) شای (بيت المقدس) بە پەلە باڵویزی خۆی بۆ (ئەورووپا) ڕەوانە کرد کە لە (فەرەنسا)و (ئینگلترا)و (سەقلی)یەو (ئەڵمانیا) داوای هەڵمەتێکی گەورەی دەکرد کە بتوانێ (نورالدين) ڕابماڵێ، بەڵام ناکۆکی پاپاییو ئیمپراتۆری ئەم باڵوێزییەی پشتگوێ خستو ئاکامێکی بەرچاوی نەبوو، (ئەموری) بە ناچاری داوا لە

---

١) ئاشکرایە دوای لاوازی عەبباسیەکان دەوڵەتی فاتیمی شیعی (٣٥٨-٥٦٧ ك) هات وەکو دوو دەسەڵات، ئەنجا دەوڵەتی عەسکەری گەورە پەیدابون وەکو دەوڵەتی (نورالدین زنکی)و دەوڵەتی ئەییوبییەکان و، دەوڵەتی سەلاتینی مەمالیکەکان کە خەلافەتیان داگیر کردبوو. (المقریزی) دەڵێ: سەرهەڵدانی لاوازی خەلافەتی فاتیمی دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی چەکدارانەی نێوان تورکەکانو سوپای ڕەش پێست لە ساڵی (٤٥٤ك)دا. (اتعاظ اکتفا) باخبار الائمة الفاطمیین الخلفاء/ج ٢/٢٦٥-٢٦٧)دا. وەلەوێدا باسکراوە کە تورکەکان (مستنصر)ی توشی بەڵا کردو، شکۆی خۆی لەدەست چوو. لە گێڕانەوەی تری مێژوییدا هاتووە وەکو لە (الکامل)/ ابن اثیر/ج ٨/ ل٣٣٢)دا خەلیفەی فاتیمی (الحافظ) سوڵتەکەی لەبەردەستی وەزیرەکەیدا بوو بەناوی (الافضل). هەتا (المقریزی) لەسەرچاوەی ڕابردوودا (ج٣/ ل١١)دا دەنووسێ کاتێ (المستنصر) مرد چووە ناو کۆشكو لەسەر تەخت دانیشتو خۆی ناو نا بە (المستعلی)و بانگی کوڕەکانی (المستنصر)ی کرد کە (نزارو عبدالله واسماعیل) بوون کە زەوی ماچ بکەن. وە لە کتێبەدا (ج٢/ ط١٩٧١ قاهیرة)دا (ص ٢٣٢)دا هاتووە: دوای داگیرکردنی شام لە لایەن تورکەوە فاتیمییەکان تەنیا میسریان بەدەستەوە ما). بەکورتکردنەوەو دەسکاری لە کتێبی (ماهیە الحروب الصلیبیە) وەرگیراوە نوسراوی (د: قاسم عبدە قاسم/ کویت/١٩٩٠ / ل: ٢٢٨).

ئیمپراتۆری (بێزنتــی) دەكـات كــە نــاوی (مانویــل كــومینین) بــوو، ئــەویش بــە كەشتیگەلی گەورە یارمەتیدا: (ئەموری) دڵــی پێــی خــۆش بــوو، بــە دەســپێكی سەركەوتنی دانا، چەندان پەیماننامەی لەگەڵ هاوشـانەكانی خۆیـدا لــە میرنیــشنە (لاتینی)یەكانی شامدا نووسی كە بڕێكی زۆر لە داهاتی كشـــــتوكاڵییـــــان لــە (د میاط)و (المحلە)و (قوص) لەدوای داگیركردنی (میسر)دا بۆ دابــین دەكـات، تــا ئەگەر ئەوان بە تفاقو چەكیش بەشداری نەكەن بە هەڵوێست لەگەڵیدا بن!

(میــسر) لەبەرامبــەر دوو ســوپادا ڕاوەســتا، یەكــەمیان بــە ســەركردایەتی كەشتیگەلی (الاسـطول) بێزەنتی بــوو كــە بــەرەو (دمیــاط) دەڕوات‌و، هــی دووەم بەسەركردایەتی (ئەموری) بوو كە بەرەو (الجیزة) ڕێگا دەگرێتەبەر، بەڵام لە ڕێگادا ئەموری پلانی خۆی گۆڕی‌و پێش سوپای بێزنتی كەوتەوەو بە چاكی زانــی كــە لــە جەنگی (دمیاط)دا بەشداری نەكات، چونكە بەتاقە سواری ناتوانێ جەنگی (الجیزه) بباتەوەو، لە پڕێكدا بە كەشتیگەلی بێزنتی گەمارۆی شارەكەیداو تۆقی كرد، ئەنجا سوپای (ئەموری) بە دوایدا هات‌و، ئامێرەكانی گەمارۆدانی پێ بــوو لــە دەبابــەو مەنجەنیق، خوداوەندیش ئیلهامی دڵــی دانیــشتوانی خــەڵكی شــارەكەی كــرد كــە بەدرێژایی (نیل)و (مینا) بە زنجیر كۆتی بگرن تا كەشتیگەلەكە قەدەغە بكەن.

ئەی (سەلاحەددین) ئەوكاتــە لــەكوێ بــوو؟ ئــەو چــاوەڕوانی ئــەوەی نــەدەكرد (دمیــاط) ببێتە مەڵبەندی هێرشەكان، بۆیە چوو (ئیسكەندەرونە)و (بەلبیس) قایم بكات، چونكە بەڕێڕەوی ئاسایی ســوپای خــاچ پەرســتی دادەنــان، كــاتی هــەواڵی گەمارۆدانی (دمیاط)ی پێگەیشت بە پەلە بەرەو ڕوی ئەوێ چــوو، كەلــە لوتكــەی ورەو تیژی چــالاكیدا بــوو، داوای فریاكــەوتنی بەتاڵوكــەی لــە (نورالــدین) كــرد، سروشت خۆشی یارمەتیدا بۆ پاشەكشەكردن بە سوپای خاچ پەرستی، ئــەوەبوو لــە نیلدا شەپۆڵەكانی ئاو لە باشورەوە بەرز بوونەوە، میــسریەكان لــەو شــەپۆلانە زۆر شارەزا بوون، هەڵدەستان گۆزەی گلێنیان هەڵدەگرت كە لە كەشــتییەگەلەكە نزیــك دەكەوتنەوە ئاگریان تێبەردەداو فڕێیان دەدایە ناو سوپاو تفاقەوە، بە شێوەیێ ئــەم

ئاگرە تەشەنەی دەکرد کە ئەوانەی لە کەشتییەکاندا بوون بێزاری دەکردن‌و، بەشی زۆری تفاق‌و ڕۆزی ئەوانی لەناودەبرد. ئالێرەدا ئیمپراتۆری (بیزنتی) پێشنیاری کرد کە لەگەڵ (ئەموری)دا هێرش ببات‌و چاوەڕوانی مانەوە نەکات لە ئاوەکەدا کە بە فەتارەتیان دەدات.

بەڵام (ئەموری) لە هێزی (سەلاحەددین) ترسا لە شارەکەداو هێوری‌و شێنەیی هەڵبژاردو، پاشان هەواڵی بۆ هات کە (نورالدین) لە شامدا پەلاماری میرنشینی ئەوی داوە خاچ پەرستەکان ماڵ‌و حاڵی خۆیان بەجێ هێشتووەو بۆ دەشتایی‌و بیابانەکان ڕایان کردووە، بۆیە داوای کێشانەوەی دەست‌و بردی کردو، ئیمپراتۆری بێزەنتی زانی شەڕەکە بەفەتارەت دەرەو، ئەو ناتوانێ دوای کشانەوەی هاوپەیمانەکەی بەتەنیا سەقامگیر ببێ‌و، سوپاکەشی داوای نانیان دەکردو، هیچ سەرچاوەشیان نەبو لێوەی بێنن، بۆیە پەلەی لە کشانەوە کردو، لە دواوەش سوپای مەلەوان هەبوو بە ئاگر بۆردومانی ئەوانیان دەکرد، بەمەش زۆر کەشتی نقوم بوون‌و سوپای زۆری لە دەست بۆوەو لە دەریادا خنکان.

(سەلاحەددین)یش بە تاجەگوڵینەکانی سەرکەوتنەوە بەرەو قاهیرە گەڕایەوە، (نورالدین) هۆکاری سەرکەوتنی یەکالا کەرەوە بوو لە شەڕەکانی (اسد الدین)داو، ئێستاش ڕۆڵی پاڵەوانانی خۆی دەگێڕێ لەگەڵ (سەلاحەددین)داو سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر دەکات.

(سەلاحەددین) دوای شکانی خاچ پەرستەکان گەڕایەوە (قاهیرە)و خۆشەویستی‌و ڕێزی گەلی (میسر)ی بەدەست هێنا، چونکە زاناو فەقیهەکان‌و ئەدیب‌و وێژەران دەچوون بەو سەرکەوتنەیان هەڵدەگوت کە پاڵاوانی شکۆمەند بەدەستی هێناوە، گۆڕەپانی مزگەوتەکان پڕ بووبوون لە وتاربێژ پشتگیریان لێدەکرد، چونکە بۆ یەکەمجار بوو لە مێژووی خاچ پەرستیدا (بێزنتی)یەکان تێک بشکێن بەبێئەوەی گەل بەداواکردنی ماڵ‌و دارایی زۆر شەکەت بکەن وەکو (شاور)و

(ضرغام) و، دوژمن تەماع لە خاكيان بكاتو، وە تامەزرۆى ئەوە بن جارێكى تر دووبارە بێتەوە، تا بە دەسكەوتو سەركەوتنەوە بگەڕێنەوە.

نووسەرانى فەڕەنگى لە هۆكارى ئەو سەركەوتنە سەر سوڕهێنەرە واقيان وڕمابوە كە (سەلاحەددين) بەسەر سوپاى هەردوو پاشا گەورەكەدا بەدەستى هێنا، كە نەيانتوانى ئاوەكە ببڕنو سوپاكەشيان بە كەشتيگەلێ دەورەيان قايم كرابوو، بە بۆچونى هەندێكيان ترسو لەرز دەسەلاتيان بەسەردا دەگرێ ئەمەش لەكاتێكدا بوو ئاوى لافاوەكە لەژێرەوەدا بەربەستێكى لەبەرامبەر كۆمەكى ئەواندا دروستكردبوو، ديسانەوە ئاسمان بارانى زۆرى بەسەردا باراندن كە بانوسەقفى بەسەردا دەڕووخاندن! من وام بە خەياڵدا دادێ كە نەمانى متمانەو بڕوا بەخۆبوون لەنێوان ئەو دوو سوپا هێرشبەرە گەورەيەدا، دەنگدانەوەى خۆى بەجێهێشت لە كارەكەدا بۆ كۆتايى هێنان بە هەڵمەتەكە، بێئەوەى لە زيانێكى بە ئەشكەنجە نەبێ هيچى تر بەدەست بێنن، ئەوەش يارمەتىو ويستى خودايە، چونكە هێرشبەر دوژمنێكى دەستدرێژكارەو، بەرگرى كەريش يارمەتيدەرى خۆيەتىو بە ئومێدى پاشەڕۆژى خەباتگێڕانە.[1]

---

١) جەنگى (دمياط) لە (٥٦٥ ك)دا بە يەكەم هەواڵى سە ربازى هاوبەش دادەنرێ لە نێوان (نورالدين) لە شامداو هێزى (صلاح الدين) لە (ميسر)داو، ئاكامێكى باشى هەبوو، پايەى (صلاح الدين)ە لاى (عاضدى فاتيمى) لە (ميسر)داو، (نورالدين) لە شامدا بەهێز كرد).

(صلاح الدين الايوبى/ وليد نويهض/ دار بن حزم / ل: ٧٣)

بۆ زانين لە كتێبى (موسوعە الحروب/ هيثم هلال/ ل١٩٢)دا ئاماژە دەكات كە هەڵمەتى خاچى يەكەم لە (١٠٩٥-١٠٩٩ ز)دا سەلجوقەكان لەگەڵيدا بەرەو ڕودەبنەوەو، هەڵمەتى دووەم (١١٤٧-١١٤٩ ز) عمادالدين زنكى لەگەڵياندا بەرەو ڕو دەبێتەوەو، هەلمەتى سێيەم دواى (حطين ١١٨٧ ز) كە لە (١١٨٩ – ١١٩٢ ز) ڕو دەدات (صلاح الدين) لەگەڵيدا بەرەو ڕو دەبێتەوە. وە (صلاح الدين) جگە لەمەش خاوەنى زۆر داستانى ترە لەگەڵ خاچيەكاندا وەكو جەنگى (حطين)و جەنگى (عين جالوت ١١٨٣ ز)و جەنگى (دمياط) و (عەككا)و هى تريش. (وەرگێڕ)

# (خەلافەتی) لابراو

(سەلاحەددین) لە دوای ڕۆیشتنی خاچ پەرستەکاندا دڵی ئاوی نەخواردەوەو ئاسودەنەبوو، جا چۆن ئاسودەبێ‌و دەوڵەتەکەی پێویستی بەوە هەبێ کە لەناوخۆدا پێویستی بە سەقامگیری هەبێ‌و، باترسی لە دەرەکیش نەبێ، لەناوخۆدا پەیڕەوانی فاتیمی سەیر دەکەن خەلیفە توانای ئەوەی نیە لە پارەو سامانی خۆی کۆمەکییان بکات‌و، چونکە جێگری (سەلاحەددین) لە سەر کۆشکەو لە هەموو شتێکدا بڕیاردەدات‌و، ڕێگا نادات بە هەڵگرتن‌و بردنی هەندێ شت،کە دەیانبرد، بۆیە زۆر ڕقیان هەڵسابوو، ڕۆژگاریش فێری کردبوو کە ئارامی ڕواڵەتی خۆڵە مێشێکە پشکۆی گەش دادەپۆشێت، لە دەرەوەش (ئەموری) بۆ هێرشکردن بۆ سەر (میسر) دەسوتێ‌و، ئەگەرچی لە جەنگی (دمیاط)دا دۆڕاوە، چونکە سوپای (ئەڵمانا)و (ئینگلترا)و (فەرەنسا) پەیوەندیان پێوە نەکرد، ئیمپراتۆڕی (بیزەنتی) یارمەتیداو بەشداری کردو، هەمیشە لە ئەندێشەو خەوندا کاری دەکرد، دەیویست خاوەن داراییەکی گەورەبێ لەسەر کەناری (نیل)دا، لەوانەشە سەر لەنوێ خولەکە بابداتەوەو، جارێکی تر ئاوەکە پڕ لە کەشتیگەلی (ئەوروپا) بکاتەوە کە (ئەموری) سەرکردایەتی بکات، کەواتە پێویست بەرلەوەی لەسەر ڕایەك جێگیر ببێ ترس‌و تۆقینی پیشان بدات.

ئەگەر پیاوەکی غەیری (سەلاحەددین) بووایە دوای ماندوبوون‌و شەکەتی (دمیاط) پشوی دەداو، چاوەڕوانی ڕۆژگاری دەکرد کەچی چی بەسەر دەهێنێت، بەڵام ئەو ویستی کە تەقەلاو دەستپێشخەری بەدەستی ئەوەوە بێ‌و بە سوپاوە

پەلاماری ناوچەی (البلح)ی دا کە هاوسێی (الغزة) بوو، خاچ پەرستانی ئەوێی کە پاسی ئەوێیان دەکرد شکاندو ئەنجا بەرەو جەنگی دەریایی گەڕایەوەو کەنارو لێوارەکانی (فەلەستینی) بە کەشتی جەنگی پڕ کردو هێزو بازوی خۆی دەرخست، وەك بلێی (سەلاحەددین) هۆشیاری دەدات کەچی ڕودەدات، ئەم پاڵەوانە مسوڵمانە کەشتیگەلی لە (میسر) بۆ ڕۆژێکی ئاوا ئامادەکردبوو، پاشان فەرمانی کرد کە پارچە هەڵوەشاوەکانیان لەسەر پشتی وشتران دابنرێو بە (سینا)دا بگوازرێتەوە، تا دەگەنە (دەریای سور)، ئەنجا ئەندازیاران هەڵسان بە هەڵبەستنی کەشتییەکانو، لە دەریاوە ڕووی لە شاری (ایلە) کرد کە هێزی وشکانی بۆ داگیرکردنی ئەوێ هێرشی کردبۆ سەری، سوپای ئیسلامی کاراییو شارەزاییو خۆی دەرخست کە بووە هۆی داگیرکردنی (ایلە) بەزوییو، کەوتنە دەستی (سەلاحەددین)و هەرچی پاسەوانەکانی بوو کەلەبچەکران وبە بەدیل بۆ (قاهیرە) گوازرانەوە.

خەڵکی کتوپڕ دیلی فەڕەنگەکانیان بەرچاو کەوت کەلەبچەکرابوونو، قەت ڕووداوی لەو ڕەنگەیان لەمەوبەر نەبینیبو، خەلکی زۆریان (سەلاحەددین) بەدڵدا چووو بەمەش دڵی خەڵکی بەگشتی بۆ لای خۆی ڕاکێشا کاتێ بینیان کە پاڵەوانەکانی ئازادی بەخشە و، لەولاشەوە (ئەموری) لەو کارانەی (سەلاحەددین) واقی وڕماو نیمچە نائومێدییەکی هەست پێکردو وایزانی (سەلاحەددین) دوای ناخۆشیو ژانەکانی (دمیاط) تێڕوخاوەو ماندوو بووەو چەند ساڵێکی تر دەمێنێتەوە، تا دێتەوە سەرپێیانو بە هێز دەکەوێتەوە، ئەوەتا تا ڕۆژێ نیە پشوو بداتو، کەشتیگەلە بۆ بردووە کە قەت بوونی ئەوانە وێنە بیرنەکرابوو لە ڕابردودا!! (سەلاحەددین) ڕەزامەندی گەلی دەستەبەرکرد بەکارەنیو، هیواشی بەترساندنو بێزارکردنی شای (بیت المقدس) هێنایەدی، تەنیا ئەوەی مابوو کە کاروباری سیاسیو ڕامیاری (میسر) ڕێك بخات. بەڵام ئەم کاروبارانە چین؟

(نورالدین) دەستوری پێدەداتو لەناو نامەیەکدا بۆی دەنووسێ داوای لێدەکات کە خەلافەتی فاتیمی بڕۆخێنێو خەلافەتی عەبباسی جێگیر بکات، تا میسر دوای

ئەوەی شیعە مەزهەب بووە بیگۆڕێ بە سوننی مەزهەب، (صلاح الدین) وەکو (نورالدین) سوننی مەزهەب بووەو ئەویش حەزی دەکرد لە هەلێکدا ئاواتی بێنێتە دی، بەڵام دەیزانی گۆڕینی گەل لە مەزهەبێکەوە بۆ مەزهەبێکی تر کاری ڕۆژێك نییەو دژوارە، پێویستی بە بانگەوازیکارە کە هزرەکان بۆ ئەم گۆڕانە ئامادە بکەن، خۆ ئەوانەی لەگەڵ سوپای (سەلاحەددین) دان بەشی ئەم بانگەوازیە ناکەن لە قاهیرەدا، جا چۆن بەشی هەموو وڵات دەکەن؟ یەکەم شت هات حوجرەی دروستکرد کە فیقهی سوننی بخوێنن و ئەو کتێبانە بخۆێنن کە پشتگیری لە مەزهەبی شافعی دەکەن[1]، بەڵام فەقیهەکانی شیعە هێشتا کە دەستیان لەوە بەرنەداوە کە خوێندویانەو قوتابیو سوختەیان هەیە ئەوەی فێری بوونو خوێندویانە بڵاوی دەکەنەوە، دیسانەوە دروشمەکانی بانگدانو قامەتو شتی تریش شێوازێکی شیعەییەو وتاری مینبەریو دوانگەیی تایبەت بە خەلیفەی فاتمییەوە بە نزاو پاڕانەوەشەوە، دەنگەکان بە وەڵامەکەی بڕوادارانە وەڵام دەدرێتەوە! کەواتە ئایا (سەلاحەددین) دەتوانێ دەستورێ دەربکات ئەوەی دوو سەدەیە ڕەگو ڕیشەی

---

١) وەکو لە کتێبی (اماره بهدینان الکردیه/ صدیق الملوجی/ ل ٨٦)دا هاتووە لەسەر (مەزهەبی شافعی) دەنوسێ: {مەزهەبی حەنەفی کە پشت بەڕاو پێك گرتن (القیاس) دەبەستێ لای خەلیفەکانی عەبباسی برەوی زۆر بووە، دوایی ئەو مەزهەبی شافعی، بۆیە زانایانی حەنەفی بەشداری بەڕێوەبردنی دەوڵەتیان کردووە وبووەتە مەزهەبی فتواو حوکم لە دەوڵەتدا، بەڵام زانایانی شافعی خەریکی وانە وتنەوە بوون و، قوتابی کورد چوون لە لای ئەوان خوێندویانەو ڕای ئەوانیان وەرگرتووەو دوای گەڕانەوە بۆ کوردستان بڵاویان کردۆتەوەو کورد بوونە شافعی مەزهەب).

نوسیویەتی: {لە- فقه السنه-دا هاتووە کە (صلاح الدین) پشگیری لە زانایانی شافعی کردووەو، قوتابخانەی (الناصریه)ی دروستکردوە لە تەك مزگەوتی (عمرو) ساڵی ٥٦٦ هـ-١١٧١و یەکەم قوتابخانەوو حوجرەیە لە میسردا مەزراوە، وە هاتووە: {لە سەردەمی ئەییوبییەکاندا زۆر گرنگی بەم مەزهەبە دراو هەتا ئەگەر کەسێ -الام-ی شافیعی لەبەرکردبایە بەخشینی گەورەی پێدەدرا} (بەکورتکردنەوە). وەتا ئیمرۆ کوردستان نەك هەر مەزهەبی شافعی تێدایە، بەلکو زۆر ئایینو مەزهەبی جۆراوجۆری تێدایە هەندێ مەزهەبی دوانزە ئیمامین بە تایبەتی کوردە فەیلەکانییەکانو هەندێ ئەهلی تەصەوفن وەکو تەریقەتی قادریو نەقشیو تەریقەتی هەقەیی. هەندێ مەزهەبی غەیرە مسوڵمانیشی تێدایە وەکو ئیزودیو یسانیزو عەلی خوابیەکان و، هەندێ مەسیحین، سەرباری کاکەیی وشەبەك، (وەرگێڕ).

داکوتاوە بە شەوو ڕۆژێك نەهێڵێت! بۆیە بۆ (نورالدین)ی نووسی هەتا کاتی لەناو بردن دێ مۆڵەتی بدات.[1]

بەڵام پیاوەکە توندوتیژە نیازەکەی خۆی لای خەلیفەی عەبباسی درکاندو، دڵی پێ خۆشبوو حەزی دەکرد بە پەلە بێتەدیو، وتی: گەورەترین دڵخۆشی من لەوەدایە کە خەلافەتی فاتیمی لە (میسر) لادەچێت، بۆیە دوو سێ جار نامەی بۆ (سەلاحەددین) نارد کە وتاری فاتیمی بچڕێنێو، دوعاو پاڕانەوە تەنیا بۆ خەلیفەی عەبباسی بێ، ئەگەرچی (نورالدین) ڕادەی کارتێکردنی (نجم الدین ایوب)ی باوکی (سەلاحەددین)ی دەزانی لەسەری لەگەڵیدا کۆبۆوەو فەرمانی دایە بە پەلە بڕواتە (میسر) تا ئەوەی لەگەڵ خەلیفەی عەبباسی لەسەری ڕێك کەوتون ئەنجام بدات، بە پەلە (نجم الدین) گەیشتە ئەو وڵاتەو (سەلاحەددین) بە هاتنی ئەوی زانیو ویستی بەوپەڕی شکۆو هەیبەتەوە پێشوازی لێبکات، ئەوەبوو سەرکردەو پیاوانی دەوڵەتەکەیو زانایانو مەلاکان لە ئاپۆڕەیەکی بەرجەستەدا چوونە پێشوازیو، کاتێ باوکی بینی دەستی ماچ کرد دەستی لە ملی براکانیو هەموو خێزانەکەی کردو، زۆر دڵی پێ بەو کۆبونەوە خێزانییە خۆشبوو کە قەت ڕابردو دیمەنی ئاوای بەرچاو نەکەوتبوو، بەکەمی دووبارە دەبێتەوە، خەلیفە (عاضد) ویستی پێشوازی لە باوکی (سەلاحەددین) بکاتو، کۆشکی بەجێ هێشت بە پەلە چووە پێشوازی میوانەکە بەشێوەیێ قەت خەلیفە بۆ کەس ئاوای نەکردووە هەرچەندە کەسەکە بە شکۆو گەورە بووبێت.

(عاضد) وایدەزانی بەو پێشوازییە دڵی باوكو کوڕ ڕازی دەکاتو بە ڕێڕەوی ئەودا دەڕۆن! ئەم گومانەش نەهاتەدیو ڕۆژان نائومێدی کرد، چونکە (نجم الدین ایوب) بۆ داخوازی (نورالدین) هاتۆتە (میسر) کە پێویستە ئەنجامی بدات، لەسەر

---

[1] بەپێی بۆچوونی (ئەمین مەعلوف)ی ڕۆمان نوسی: (هەر چەندە (عاضد) بیست ساڵ بوو نەخۆشییەکی توندی هەبوو، صلاح الدین کە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵدا هەبوو بیری لەوە نەدەکردەوە کە خیانەتی پێبکات). وە (صلاح الدین) چاوەڕوانی مردنی (العاضد)ی کرد تا بەڕەسمی دەوڵەتی فاتیمی بە کرداری هەڵوەشێنێتەوە). (صلاح الدین الایوبی/ ولید نویهض/ ل٨٤). (وەرگێڕ)

ئەمە دانووسانو وتووێژ لە نێوان کوڕو باوك لەسەر ئەم مەسەلەیە کراو، (سەلاحەددین)یش بە شێوەیەکی شێنەیی بۆچونی باسکرد، چونکە گەلی میسری لەسەردەمی ئەودا ترسیان نەمابوو، لەچاو سالآنی ڕابردوو کە ناخۆشترین ژیانیان بەسەر بردووە باشترین سەردەمەو، پێویستە ئەویش لەسەر ئەم خۆشەویستییە سووربێو کارێ نەکات کە شوێنی لەق بکات.

پاشان خەلیفە نینۆکەکانی کراوەو پاسەوانی تایبەتی کە (٥٠) هەزار بەدەر بوو، ئەمینداری خەلافەت بەڕێوەی دەبردن لەناو چون، (بهاالدین قەراقۆش) لەکۆشکدا بە هەموو کارێکی کۆشك زۆر بە وردی هەڵدەستاو کەس بۆی نەبوو بێتە ژووریان بڕواتە دەر بە فەرمانی ئەو نەبێت، هەر دەفرو پیاڵەی زێڕو شمشێری جوانی هەبوو هەمووی کۆکرابۆوە تا نرخە زۆرەکەیان ببێ بە ڕەسیدو پشتیوانی لە گەنجینەی دەوڵەتدا، هەندێ لەو شتە بەنرخانەی کۆکرابوونەوە، قوتابخانەو پەناگاو نەخۆشخانەی پێدروستکرابوو، قەڵای (سەلاحەددین) کە ناسراوبووە تا ئیمڕۆ گەورەترین جێگای سوپابووەو دیسانەوە حەوشەی دەرەکی لەدوای ئەوەی بەهۆی بەرد هاوێژەکانی خاچ پەرستی لە جەنگی (شاور)دا ڕماوە، ئایا وا باشتر نیە لەم ڕێبازەی بەردەوام بێ تا ئەو ڕۆژە دێ ئارەزووی (نورالدین) ئەنجام دەدات!

(نورالدین) سەرکردەیەکی گەورەیە زۆر ئاگادارە لە ڕازیکردنو ڕاکێشانی خەڵك بۆ ڕێبازی سیاسی خۆیو، هەر ئەوەشی لە مێشکدا دەبێو تێیدەدەگات، ئەنجا چۆن پەلەی لێدەکات!!.

(نجم الدین)وتی: ئەی کوڕم (نورالدین) وەکو خۆی دەیلێ گەورەمانە، بەڵامهەڵەی گەورەی ئەوەیە پەلەی کردووەو، بۆ خەلیفەی عەبباسی نامەی نووسیوە کە مژدەی ڕووخانی دەوڵەتی فاتیمی پێدەداتو، نمایندەی بەغداش هاتوون پشتیان گرتووەو داوای لێدەکەن پەلە لە کردنیدا بکاتو، ئەویش دڵنیای دەکات کە ئەوەی ئەمیری مسوڵمانان بیەوێ بیکاتو پێویستە خەلیفەی عەبباسی بڕوا بکاتو پەلە نەکات، بەڵام دووبارە پەیامنێری ناردو (نورالدین) گوفتێکی داوە نایەوێ لێی لێ بدرێت!.

(سەلاحەددین) وەڵامی قسەکانی باوکی دایەوەو وتی: جا باشە خەلیفەی عەبباسی لە بەغدادو خەلیفەی فاتیمی لە قاهیرە هیچ لەبارەی کارو باری ڕامیاری دەزانن، هەتا هیچ ئارەزووەکانیان هەبێت! وە (نورالدین) لە یەکەم بوواری هەل کەوتودا قسەی خەلیفەی عەبباسی ئەنجام بدات!

(نجم الدین) وتی: کوڕم دەزانم، بەڵام چی ڕوویداوە، وەك خۆی بۆتی دەگێڕمەوە، لەم دانیشتنە گەرمو دۆستانەدا ئەندێشەیێ بە دڵی (سەلاحەددین)دا هاتو، هات براو گەورە پیاوانی خێزانی ئامۆزاو پورزاکانی کۆکردەوە، (بێ زانینی باوکی)، تا هەواڵیان پێ بدات کە دەیەوێ واز لە دەسەڵاتی خۆی بێنێ بۆ باوکی، چونکە زاناترو لە پێش ترە لەو، بۆیەش گەرمتر لە پشکۆ چاوەڕوانی هاتنی کرد، تاوەکو بە وەرگرتنی پۆستی وەزارەت دڵی ئاسودە بکاتو، ئەو مەسەلەیەی لەگەڵ خەلیفەی فاتیمیدا باسکردو، پەسەندی کردو، ئیمڕۆش هەر لەئێستاوە خزمەتکارو دەستەی ئەوە نەك سەرۆکێك!.

(نجم الدین) کە ئەوەی لە کوڕەکەی بیستەوە بە گەورەی لە قەڵەم داو، فرمێسکی خۆشی بە چاودا دەهاتو، کاتێ نیشانەکانی نەمەكو دڵسۆزی بەرچاو کەوت دڵی تەزاندو دڵی خۆش کردوو، ئەنجا چووە لای ڕۆڵەکەیو ئامێزی لە ملی کردو، وتی: ئەی کوڕم من لە ژێر فەرمانی تۆدام شوێن بۆ تۆ لەق ناکەم کەوا خودا ویستی لەسەرە لەوێ بیو، من دەبم بە ڕاوێژکارو ئەمینداری تۆو ئامۆژگاری خۆشەویستی تۆو، چاوت ڕونبێ بەو شکۆیەی خودا پێی کەرەم کردویت، قەت خۆرێ لەمن بزر نابێ کە لەسەر ڕوی بەڕێزی تۆ هەڵاتووە، جارێکی تریش ئەم قسانە دووبارە مەکەوەو تۆ جەرگی منیو ڕوناکی چاومی!.

(سەلاحەددین) هەستی بە بەرپرسیاریەتیەکی گەورە کرد کە لەمەڕ کوڕەکەیەوە دەکەوێتە سەر شانییەوە، لەدڵی خۆیدا بڕیاریدا کە ئەو بەرپرسی یەکەمە لە بەختەوەری ئەودا، هەڵسا بچێ سەرخەوێك بشکێنێ تا گورج بێتەوە، سەر لە سبەی

قازی (فاضـل)ی بانگێشە کرد، تا مەسەلەی کۆتایی هێنانی بە خەلافەت لەگەڵدا باس بکات، رەنگە چارەیەکی گونجاوی پـێ بێـتو، لـە (عبـدالرحیم)دا زیرەکـیو فێڵبازی هەبوو، بە (نجم الدین)ی ووت — کـە ناڕەحـەتی هەڵوێستەکە نیگـەرانی کردبوو بۆچونم وایە بە بڕینی (حـيّ على العمل) لە بانگەکەیان دەست پێبکەین کە زانیمان خەڵکی ناڕازین ئەوە دیارە کاتی نەهاتووە، باوکەکەش لە پێشنیاری قـازی ڕازی بوو، (سەلاحەددین) بەم کارە هەڵساو فەرمانی بە بانگدەران کرد کە ئەنجامی بدەنو ئەوەبوو کەس ناڕازی بوونی پێوە دیار نەبوو، هەبوو لە دڵـی خۆیـدا نـاڕازی بوو، بەڵام لەگەڵ دووبارەکردنەوەیدا چەندجارێ بە شوێن یەکتردا ئەم ناڕازییە نەما.

(سەلاحەددین) هەنگاوی دووەمی دەستپێکردو، هەڵسا بە گرتنی ئەو کەسانەی دەسەڵاتیان لەناو گەلدا هەیە هـەواداری فاتیمیـەکانن، لـەم هەنگاوەشـدا کەسـی نەبینی ئاشکرا نەیاری ئەمەی بێت.

قۆناغی سێیەم هاتو، (نجم الـدین) بڕیـاری دا کـە (سـەلاحەددین) بەشـداری ئەنجامدانی نەکاتو، ئەگەر کارەکەی سەری نەگرت دەرگـای پاسـاوو پۆزشـت لـە بەرامبەر تایبەتیکارانو گشتیدا ئاشکرابێ، چونکە ئەو بەشداری هیچی نەکردوەو، بەبێ ئاگایی ئەو پلانەکە گێڕدرایە، ئەم قۆناغە ئەو قۆناغە بوو (نجم الدین) لەگەڵ دەستەو تاقمەکەی خۆیدا لە ڕۆژی هەینیدا فەرمان بە وتاربێژ دەکـات کـە نـاوی (عاضـد) لە وتاری دووەمی هەینیدا بسڕێتەوەو، لە شوێنی ئەودا نـاوی خەلیفـەی عەبباسی ببات، بۆ ئەم مەبەستەش وتاربێـژەکی ئـازای سـوننی هەڵبـژارد، بـەڵام دوایی لەم بڕیارە پەشیمان بۆوەو ویستی ڕاستی بکاتەوەو بە دوو هەنگاو ئـەنجامی بدات، یەکەمجار تـەنیا نـاوی (عاضـد) ڕەش بکاتـەوەو نـاوی خەلیفـەی عەبباسـی نەباتو، ئەمەش ئێستا بەگوێ هەڵخستن ناودەبرێو، (نجم الدین) لەمە ڕازی بـوو، چاوەڕوانی هەفتەی داهاتووی کرد تا وتاربێژ بە ئاشکرا ناوی خەلیفـەی عەبباسـی ببـات. ئەمـەش لـەکاتی خۆیـدا کـرا کـە مانـای نـەمانی سـەردەمی فـاتیمی

دەبەخشێت، [1] هەواڵەکە بۆ (عاضد) هات نەخۆشی لەسەر نەخۆشی بۆ هات و، هەندێ دەڵێن بۆخۆی خۆی کوشتوە، چونکە لەدوای ئەوە تەنیا پێنج ڕۆژ دەژیێت،

---

١) لە کتێبی (ماهية حروب الصليبية/ د: قاسم عبده قاسم/ كويت/١٩٩٠ / ل٩٦)دا هاتوە، کە لە ئایندەدا {خەلافەتی فاتیمی گەیشتبوو بە قۆناغی دواکەوتنی سیاسی ناو خۆیی، دوای ئەوەی وەزیرەکان دەسەڵاتیان لە خەلیفەکان کێشابۆوەو کردبوویانە بوکەشوشەیێ چۆنیان حەز لێبایە ئاوایان دەجوڵاند، زۆر هەواڵی سەربازییان دا بێسوود بوو، نەیتوانی دەسەڵاتی لە دەستدراویان لە شامدا بگێڕنەوە کێشەی سیاسیو جەنگ هەمیشە هەبوو لە نێوان ئەوانو تورکە سەلجوقییەکانی دەوری خەلافەتی عەبباسی کە دەیانویست میسرو شامیش بگرنەوە ژێر ئالآیان، دیسان کێشە لە نێوان سلجوقی خۆیەخۆو، سلجوقیو میرنشینە عەرەبەکان هەبوو} ئەوەبوو لە سەردەمی (صلاح الدين)دا عەبباسیان لە ڕێگەی ئەوەوە هەنگاویان گۆڕا بە حکومەتی ئەییوبییەکان. ئەمەش یاسای ژیانە تاك – کۆمەڵگا – گەردوون هەموو شتێ لە بونەوەردا تەمەنێکی دیاری کراوی هەیە، تامردنی کۆمەڵگاو دەوڵەت شارستانی هەیە: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ..﴾(الاعراف-٣٤). هەموو میللەتێ ئەجەلی خۆی هەیە. میللەت کۆمەڵگایە کە کۆمەڵێ پەیوەندی لە بیرو باوەڕو پرەنسیپ بە پشت بەستن بە هەندێ تواناکان بە یەکیانەوە دەبەستێتەوە هەم دەوڵەتو هەم شارستانیش، ئەمانە مردنو ژیانو جوڵەیان هەیە. میللەت یان دەوڵەت یان شارستانی وەکو تاك دەژیو دەمرێو، چۆن تاك ملکەچی کاتێکی دیاریکراوو یاسایەکە ئاواش کۆمەڵگاو دەوڵەتو شارستانی کاتی دەبنو تەمەنێکی دیاریکراوی خۆیان هەیە

ئەم یاساو کاتەش بە یاسا مێژووییەکان ناسراون کە خودا لەمەڕیان دەفەرموێ ﴿...وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلًا﴾(الأحزاب-٦٢). واتە بۆ یاساکانی ئێمە گۆڕان نابینی. قورئان دەفەرموێ: ﴿وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾، واتە: ئەوانە ڕۆژانێکن لە ناو خەڵکیدا دەستاودەستیان پێدەکەین، نە مرۆڤ نە ماڵ، نە دەسەڵات، نە دەوڵەت تاسەر بۆ کەس نییەو بۆ کەسانی تر دەگوازرێتەوە دەستاودەست دەکات، وەکو ئەزموونێکی خوایی بۆ ئادەمیزاد دەگوازرێتەوە. هۆیەکانی مردنی کۆمەڵگاو دەوڵەتو شارستانیش زۆرە، وەکو چۆن هۆیەکانی مراندنی تاك زۆرە لەوانەشو بەدڕەوشتیو ناکۆکیو، داگیرکردن، بۆ نمونە: ﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا﴾ (الفاطر-٤٥)، واتە: ئەگەر خودا بەکردەوەکانی خۆیان خەڵکی بگرێ کەس لەسەرزەوی ناهێڵێتەوە، بەڵام بۆ کاتەکی دیاریکراو دوایان دەخات. ﴿إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ﴾ (النمل-٣٤)، واتە: (ئەگەر پادشاو دەسەڵاتداران چوونە ناو هەر وڵاتێ (بۆ داگیرکردن) تێکی دەدەنو خەڵکی بەڕێزەو بە دەسەڵاتی سەر شۆڕو داماو دەکەنو، هەر ئاواش دەکەن). هەر وڵاتێ چ لەناو خۆدا ستەمی لێکرا یان دوژمنێکی دەرەکی هات داگیری کردو ستەمی تێدا کرد، خودا ئەوانیش بە گەلەکی تر لەناودەبات ﴿وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ

بەرلەوەی هەینی داهاتوو بێت، ئەوانەی پلانی ئەویان دارشتبوو پێی ئاسودە بوون، چونکە ڕەنگە ئەگەر مابا پلانی زیانبەخشی بۆ دانابان.

بەڵام بۆچونی (سەلاحەددین)و باوکی ڕاستی نەپێکاو، وەکو دەیانوت سیاسەتی ئەوان شوێنی خۆی نەگرت، چونکە کۆمەڵێ لە یارانی (عاضد) پێیان ناخۆشبوو خەلیفەیان بەهۆی ڕاگەیاندنی لابردنی ئەو بە کەیسەری‌و وخەم سەرینێتەوە، بۆیە بڕیاریان دا پلانەکی سیاسی دارێژن بۆ ڕووخاندنی سوپای شام‌و حەق بگەڕێتەوە دەستی خاوەنی خۆی‌و، ئەوانە بۆ خۆیان ئەو توانایەیان نیە بەم کارە هەڵسن‌و ئاواتیان بێننەدی، بۆیە وایان بەباش زانی، نەك لەیەك لاوە، بەڵکو لە دوو لاوە داوای یارمەتی دەرەکی بکەن، لێرەدا (الباطنیة) هەیە کە لە هەموو پێرە مسوڵمانێ زیاتر رقیان لە (سەلاحەددین)و (نورالدین)ە، دەتوانن لە ڕێگەی تیرۆرەوە بە خێراو کت‌و پڕ تۆڵە وەربگرنەوە، چونکە دەستەیەك خۆبەخشیان هەیە، لەژێر فەرمانی (شیخ الجبل) هەڵ دەسوڕێن‌و، بێ پاساو کاری خۆیان دەکەن‌و، دەتوانێت کە بەدزییەوە یەکێ لەوانە ڕەوانە بکات بەدزی‌و ژیرانە (سەلاحەددین) تیرۆر بکات، تا بە مەبەستی خۆی بگات.

لەلایەکی تریشەوە لەلای فەرەنگەوە لە (بیت المقدس)دا کە گرەنتی پشتگیری تەواویان دەدەنێ ئەگەر هێرش بکەنە سەر (میسر) بە سوپایەکی چڕو چڕژاوەوە ئەوان دەتوانن (سەلاحەددین) لەناو ببەن، ئەمەش ئارەزوویەکی گەرمە لە دڵی

---

بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ﴾ (البقرة-٢٥١)، واتە: ئەگەر خودا خەلکی هەندێ بە هەندێکی تر لانەبەین زەوی خراپ دەکەن.

ئەگەر ئێمە بە وردی مێژووی سەردەمی (صلاح الدین) بخوێنینەوە لە ڕەوشتی ئەم سەردەمە بکۆڵینەوە دەبینین هۆکارەکانی ڕووخانی فاتیمی‌و دەوڵەتی ئەییوبی بۆ ناتەبایی ئەو دەسەڵاتانە دەگەڕێتەوە کە لەوکاتەدا حوکمیان کردوە، وەکو ناتەبایی ناوخۆی دەوڵەتی ئەییوبی‌و لەلایەکی تر فاتیمییەکان‌و مووەحیدەکان‌و زەنگییەکان‌و عەبباسییەکان سەربەخۆ حوکمیان کردووە، ئەگەر یەکگرتوویانەو، دوریان لە کێشەی ناوخۆیی هەرگیز دەوڵەتی ئیسلام لە جیهاندا ئەم هەڵسان‌و دابەزینەی توش نەدەهات (وەرگێڕ).

فەرەنگیەكانـــداو دەیانـــەوێ گـــورج بیهێننـــە دی، دوای ئـــەوەی كەشـــتیگەلی (سەلاحەددین) لە دەریای سوردا شكاندنیو بە نائومێدی كشانەوە.

هەر بە ئەوەندەش نەوەستان پەیوەندییان بە (ویلیەمی فۆرمانی)ی كرد كە شای (صقلیە) بوو كە كاتی هێرشی فەرەنگ بۆ سەر (میسر) لە خۆرهەلاتەوە ئـەوانیش پـەلاماری (صـەقلیە) بـدەنو ئـەوكات (سـەلاحەددین) دەكەوێتـە نـاو هـەردوو تاشەبەردی دەستارەوە، ئەو خۆبەخشەی شێخی جەبەل ئامادەی كردبوو لـە بـەرگی پالەوانەكانی شـامی داهـاتو بـێ هەسـتو خوسـت خـۆی خزانـدە نـاو سـوپای (سەلاحەددین)ەوەو لە هەل دەگەڕا بۆ كوشتنی، دوای ئەویش كەسێ نابێ لـەو دوو لایە لێك دورەوە جەنگەكە هەلسورێنێت، ئەوەی پلانگێڕانی هانـدا بـە پەلـە ئـەم كارە دەست پێبكەن ئەوە بوو، كە (توران شا)ی برای (سەلاحەددین) كە بە توانـاو جەستە بوو لە جەنگدا بۆ ڕۆلەكی گرنگو تایبەت بۆ یەمەن سـەفەری كـرد بـوو، ئەگەر (سەلاحەددین) تیرۆر بكرێ ناتوانێ لە شـوێن (سـەلاحەددین)دا دابنیـشێو كارەكە پشێو دەبێو، (نجم الدین)یش تازە هاتوەتە ناو میسر كەس بۆ سەرۆكایەتی دەستی ناگرێو بانگی ناكات.

یەكێ لەو خالانەی ڕێكەوتنی لەسەر كرابوو لەناو پلانگێـڕانو شـای فەرەنگـدا ئەوەبوو (ئەموری) كە پاشایە پەیامنێرێك بـۆلای (سـەلاحەددین) ڕەوانـە بكـاتو سەلامی ئەوی پێ ڕاگەیەنێو مەرجەكانی پـەیمانی ئاشـتی بـاس بكـەن، ئەمـەش (سەلاحەددین) دلنیا دەكات كە خۆی ئامادە نەكات، كاتێ پاشـای (صـەقلی یـە) وەلامی پلانگێڕانی دایەوە كەشتیگەلی گەورەی ئامادە كرد كە نزیكـەی (٣٠٠٠) سەربازی لەخۆ گرتبوو، تا جەنگەكە بـە پێـی نەخـشەیەكی ڕێـك بێـتو ژمـارەی زۆریش دەسكەوتەكە سەركەوتن بەدەست دێنێت!!.

پیلانگێڕان پەییان بە (زین الدین بن علی) نەبرد كە ئامۆژگاری بوو، حەزی بـە دانوسانی خاچ هەلگران نەدەكردەوە، ئەشی زانی ئەم كارە هەم بە زیـانی ئیـسلام تەواو دەبێت هەم مسولمانانیش، بۆیە ڕۆژبەڕۆژ ئامادەی كۆڕەكان دەبوو تا ڕۆژ بە

ڕۆژ هەواڵو باسەکان بۆ (سەلاحەددین) بگێڕێتەوە، پاشان نمایندەی (ئەموری) هات کە سڵاوی بە (سەلاحەددین) بگەیەنیّو هەولێش بۆ ئاشتییەکی هەمیشەیی دەدات، ئەمە یەکەم خاڵی دەستپێکردنی پلانە کەبوو.

لێرەشدا (سەلاحەددین) فەرمانی بەگرتنی هەموو ئەوانەدا کە دەستیان لەم پلانەدا هەبووەو هەر هەمووی لە سێدارەدان، لەوانە (عمارە الیمنی) کە شاعیرێکی ناودار بوو، (عبدالصمد)ی نووسەرو میرزاو، (العویس)ی قازی، بەڵام لە ئافرەتێ بوورا کە لە بنەماڵەی فاتیمی بوو، لە دانیشتنەکاندا بەشداری کردبوو پلانگێڕانی هان دەدا بۆ لابردنی ڕقو قینی ناو دڵی کە دوای مردنی (عاضد) هەڵی گرتبو، (سەلاحەددین) بەری داو ئەمەش هۆیەك بوو لە هۆکانی هەڵوەشان، چونکە بە شیاوی نەزای ئافرەتێ بکوژیّو لەدار بدات لەگەڵ ئەوانەی بەشداری ئەویان کردووە لە ڕێڕەوەکەدا.

ئاشکرابوونی پلانەکە وەکو تریشقەیەك دابەزییە سەر دڵی (ئەموری) کە هیوایەکی زۆری بەمە هەبوو کە بەهۆی یارمەتی شای (سەقلی یە) سەربکەویّ، زۆری نەبرد کە بە خەفەتو دڵەڕاوکێ مرد، بەڵام کەشتیگەلی (سەقلی یە) کە (ویلیەم نورمانی) ڕەوانەی کردبوون گەیشتنە ئاوی (ئەسکەندەرییە) تا سەرکردەکەیان بزانێ کە (ئەموری) سستی کردوەو لەسەر بەجێ هێشتنی گۆڕەپانەکە سووربووەو مردووە بێئەوەی کەس لە سەرکردەکانی ئاگادار بکات کە بە سوپاوە بەرەو میسر بچن! پاشان وای بەباش زانی کە هێرش بکاتە سەر هەندێ کەشتی بازرگانی کە لە بەندەری (ئیسکەندەرۆن)ەدا لەنگەریان دەگرتو لەوێدا نقومی کردن، چونکە کەشتی جەنگی نەبوون (سەقلی یەکان) ویستیان پەلاماری (الثغر) بدەن، بەڵام بەرهەڵستییەکی گەورەیان لە مسوڵمانانەوە توش هات، لەکاتێکدا لە بەرامبەر مەترسییەکەدا پێیان چەقاندنو زۆر شانەی سەربازییان نارد کە زۆر لەو کەشتی یانە بسوتێنن، پاشان ترسو تۆقینیان زۆر کردو پەلاماری (نورمان)بیانداو چادرو خێوەتەکانی ئەویان سوتاندنو، ئەوانەی مابونەوە بە

ترسەوە ڕایان کرد. بەو سەرکەوتنە (سەلاحەددین) دووپاتی کردەوە کە وەکو سیاسەتمەدارو جەنگاوەرێ پێی خۆی داکوتاوەو، پلانگێڕان لەدژیدا دەبێتەهۆی بنەبڕبوونی ئەوانە. لە پلانەکانی (موتورون).دەست بەتاڵ بوو لە (میسر)داو تا بەرەو دوژمنەکەی بکەوێتەڕێ لەناو لانە قایمەکەیدا.

# نێوانی دوو پاڵەوانی گــەورە

هەندێ کەس بە شێوەیێ لە (نورالدین) دەدوێن‌و لە هەڵوێستی ئەو لە بەرامبەر (ســەلاحەددین)داو هەڵوێــستی (ســەلاحەددین) لەبەرامبــەر ئــەودا وەکــو لەمــەڕ دووکەسی دژبەیەك‌و سەرکەش قسەدەکەن کە هەریەکە لەو دوانە دەیەوێ ئەوی تــر لــەناو ببــات، وەکــو (شــاور)و (ضــرغام) ســەیریان دەکــات[1] ئــەم بۆچــوونەش

---

١) بۆ نموونە (صالح قەفتان) کە لە کتێبی (مێژوی گەلی کــورد/ج٣ /٢٠٠٥/سلێمانی/ ل١٨٠)دا دەنووســێ: {سولتان سەلاحەددین ئەیویست تا- نورالدین- بێنێ لێــی لانــەدات، بــەڵام هــیچ حەزیــشی نــەدەکرد بــە خزمەتی بگات، بۆیە هەمیشە خۆی دڵی سوڵتان (نورالدین) یان لێ کرمێ کردبوو وایــان تێگەیانــدبوو کــە سەلاحەددینی لە سەودای سەربەخۆیی خۆی دایە، بەڵام سەلاحەددین قەت ڕێــی نــەداوە کــە ناحــەزی لــەوە دەربکەوێ، بەڵام هەرچی (نورالدین) بــوو متمانــەی نــەمابوو، لــە هــەل دەگــەڕا کــە بیکــا بــە بیــانو کــە (سەلاحەددین) لە میسر لابەرێت، ئەوەندە هەیە لەبێ تالیعی سوڵتان (نورالــدین) لای جــەزیرەوە هەمیــشە ئاژاوەی بۆ پەیدا دەبوو لەبەر ئەوە نەدەپرژا ئەم دوو دڵییــەی دەرونــی خــۆی لەتــەك ســەلاحەددینی بــەوەفا ئاشکرابکات. ئەوەندە هەیە کە سوڵتان (نورالدین) قاقەزی ئیتاعەت‌و تابیعیەتی لە سەلاحەددین وەرگــرت ئەنجا فەرمانی دا کە بە لەشکرەوە لە میسرەوە بچێ بۆ فەلەستین تا پێکەوە بچن قودس بگرن، بــەڵام لــەڕێ سەلاحەددین باسی نەخۆشی باوکی بۆ هات لەبەر ئەوە گەڕایەوە میسر، لەبەر ئەوە سوڵتان (نورالــدین) زۆر زویر بوو، ویستی بە لەشکرەوە بچێتە سەر میسر داگیری بکات‌و سەلاحەدینیش عەزل بکات، بەڵام ئەجــەل نەیهێشت‌و لەو ڕۆژانەدا مرد (٥٦٩ ك – ١١٧٣ ز)} هەرچی (شکرالله بابان)ە لە کتێبی (مێــژوی کــوردو کوردستان/ ٢٠٠٤/ وەزارەتی ڕۆشنبیری/ ل١٢٠)دا دەنوســێ: {.... نورالــدین ویــستی لەگــەڵ لەشــکرێکا بەرەو فەلەستین بکەوێتەڕێ‌و بۆ خۆشی لەو لاوە بێت بۆ شەڕێ پادشای (بیت المقدس)، ســەلاحەددین قبــوڵی کردو ڕۆیشت، بەڵام هەرکاتێ ئەوەڵی کە چاوی بە (نورالدین) کەوت زانی کە لە دڵەوە لەگــەڵیا پــاك‌و یــەك ڕەنگ نییە، سەلاحەددین نەخۆشی باوکی کردە بیانوو گەڕایەوە میسر.....} . لــە مێــژووی ســەلاحەددیندا زۆر جیاوازی تر هەیە، بەلکو لەسەر مەسەلەی چۆنیەتی گۆڕینی دەوڵەتی فاتیمیش لەلایەن سەلاحەددینەوە جیاوازی هەیە (شکرالله بابان) لە هەمان کتێبــی ڕابــردودا (ل: ١١٩) دەنوســێ (کــە ســەلاحەددین بــەپێی هەڵبژاردنی (العاضد)یە دەنگی تەواوی ســەردارەکانەوە بــووە ســوڵتانی میــسر، ئەمــەش قــسەی جــورجی زەیدانە} . بەم چەشنە مێژوو جیاوازی لە گێڕانەوەیدا زۆرەو هەڵبــژاردنی پــاك‌و پیــسەکانی‌و تــاووتوێکردنی دژوارەو مرۆڤی کارامەی دەوێت هەرچی توێژەریترە وەکو (ولید نــویهض) لە کتێبی (صلاح الدین الایــوبی/

قراءة معاصرة/ دار ابن حزم/ ل٨١) سەرەباسێ دەنوسێ: (جیاوازی دوو ستراتیژی جیاوازی نێوان صلاح الدین‌و نورالدین)ە. لەوێدا هاتووە کە ئێمە کورتی دەکەینەوە: (هاملتون جیاوازی ئەو دوانە بۆ ڕوانینی سیاسی دەگێڕێتەوە ..... هەوڵ دەدات کە تیۆری خۆی لەسەر گرژی پەیوەندییەکانی نێوان ئەم دوو سەرکردەیە لەسەر خوێندنەوەی جۆراو جۆر دابمەزرێنێ‌و، باس دەکات کە: (نورالدین) سووربوو لەسەری کە هەنگاوێکی یەکالآرەوە بنێ بۆ ڕاگەیاندنی خەلافەتی عەبباسی لە میسر دا، دوای ماوەیەکی درێژ لە مانگی حوزەیران (یۆنیۆ) ر١١٨١ ز دا بە ڕەسمی هەواڵی بۆ نارد کە بەم کارەی هەڵسێ و، هەمان کاتیش خەلیفەی عەبباسی لەم کارە ئاگادار کرابۆ وەوە بەبێ شپرزەبوونی دەرەکی دەستبەجێیی گوێڕایەڵ بێت}.
کەواتە: تەنگەژەکە لەم پەیوەندییەدا لە دوودڵی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی فاتیمی دا لە ترسی تێکچوونی باری ناوخۆ بوو، چاوەڕوانی نەخۆشی (عاضد)ی کرد تا دەمرێ‌و پاشان هەنگاوەکان بە شێنەیی هەڵبێنێت}
کات دانان بۆ لابردنی دەوڵەتی فاتیمی پەیوەندی گەرم‌و گوڕەکانی وردە وردە گرژ کرد وەکو - جب هاملتون) باس دەکات. باس لەوەش دەکات کە {لە ئاکامی شکستی (صلاح الدین) لە یارمەتیدانی گەورەکەیدا لە هەڵمەتی دا بۆ سەر قەڵای (شوبك/ تشرین یەکەم / ئۆکتۆبەر ١١٧١ز)دا هەندێ گومان قەوما، هەر پاساوێ بێنێتەوە بۆ هۆی کشانەوەکەی. (وەدەرکەوت کە دیارییەکەی بۆ نورالدین لە گەنجینەی فاتیمییەکان کافی نییە}. وە (جب) وادەروانێ کە نە مەسەلەی کات دانان بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی فاتیمی‌و ئەنجا کشانەوەی (صلاح الدین) لە قەڵای (شوبك) پاشان جیاوازی لەسەر بەشکردنی گەنجینەی فاتیمییەکان هەموو ئەوەندە کیفایەت نیە بۆ شیکاری جیاوازییەکە (ڕەنگە هۆکانی گرژییەکە لە بنەڕتدا بۆ جیاوازی ڕای سیاسی بگەڕێتەوەو دەیەوێ ئەم جیاوازییە بە ڕوانینی سیاسی ڕاڤە بکات {نورالدین شامی بە خاکی سەرەکی دادەنا بۆ جەنگ لە دژی خاچپەکاندا و، میسری بە پلەی یەکەم وەکو چاوگەی داهات دادەنا بۆ تفاقی جەنگ و، بە پلەی دووەمیش وەکو چاوگەکی سەربازی — الاضافی - بۆ وزەی مرۆڤایەتی سەیر دەکرد (.... کەچی (صلاح الدین) بڕوای وابو میسر لەم چاخە دا خلی سەرەکی مەترسیدارە).
کەواتە جیاوازی لەسەر ستراتیجیەتی کێشەکە دەست پێدەکات لەبەرەو ڕووبوونەوەی فەرەنگەکان لە شامدا. نورالدین شامی بە پێشتردا هەم ناو میسری بە هێزی دارایی دادەنا هەم مرۆڤی بۆ کۆمەکی. کەچی (صلاح الدین) خاڵی لاوازی لە میسردا بەدی دەکردو دوای ئەوەی لەوێدا ژیابوو دەیزانی ڕۆڵی یەکەمین قایمکردنێ ئەوێیە لە دژی هەڵمەتی خاچپەکاندا، ئەنجا بەرەو شام بڕوا بۆ جەنگی فەرەنگەکان}. وە مێژووزانی ڕۆمان نووس (ئەمین سەعلوف) بڕوای وایە یەکەم گرفتی ترسناکی نێوان ئەم دوو پیاوە لە هاوینی ١١٧١ ز دا تەقییەوە کاتێ (نورالدین)داوای لە وەزیری لاو (صلاح الدین) کرد کە دەوڵەتی فاتیمی بڕوخێنێ (....) (صلاح الدین)ی ناچارکراو پلانی پێویست بگێڕێ لە بەرامبەر ڕەنگدانەوەی دوژمنەکارانەی گەلدا، بەڵکو گەیشتە ئاستی خۆئامادەکردنێکی گشتی بە ئاشکرا ڕووخانی خەلیفەی تێدا ڕاگەیەنێ. بەڵام لە باسکردنیدا هەر دوودڵ بوو.
(عاضد) هەرچەندە نەخۆشییەکی درێژخایەنی کوشندەی هەبوو، بیست ساڵ بوو لەگەڵیدا بوو، صلاح الدین زۆر دۆستی ئەوبوو، بیری لەوە نەدەکردەوە ناپاکی لەگەڵدا بکات .....} (صلاح الدین) چاوەڕوانی وەفاتی (العاضد)ی کرد تا بە ڕەسمی ڕووخانی دەوڵەتی فاتیمی ڕاگەیەنێ ...}. (کورتکردنەوە) ئەم ڕوونکردنەوە پێچەوانەی ئەم ڕایەن کە دەڵێن: (صلاح الدین) برادەرێکی خراپی هەبوو. کەواتە: ئەم گرژییانە بوونە هۆی ئەوەی کە (نورالدین) لە دڵی خۆیدا بڕیاری لادانی (صلاح الدین) بدات، بەڵام وەکو (ابن کثیر)

سەرهەڵداوی خوێندنەوەیەکی بە پەلەی ئەو وتووێژەیە لەنێوان دوو پاڵەواندا ڕوودەدات. چونکە واقیعی بەرجەستە گەواهی دەدات کە (نورالدین) وەکو دوژمن‌و ناحەزو ڕکابەر سەیری ئەوی نەکردووە، بەڵکو وەکو یەکێ لە سەرکردەکانی خۆی سەیری کردووەو لە هەندێ کاردا شێنەیی‌و سستی نواندووەو، ئەمەش بۆتەهۆی مەسەلەی سەر کۆنەکردن نەك مەسەلەی دوژمنایەتی، دیسانەوە (سەلاحەددین) لە سەروی شاهیدەکانەو دان بەوە دادەنێ کە ئەو سەربازێکی (نورالدین)ەوە، هەر فەرمانێك بکات دەبێ ئەنجامی بدات.

پاشان ئەم دوو پاڵەوانە گەورەیە یەك مەبەستی هاوبەش پێکەوەی کۆکردونەوەو، هەموو ڕێگایەکی‌تری لە ژیاندا لێگرتبوون تەنیا سەرقاڵی ئەوەبوون، ئەم مەبەستەش تێشکاندنی خاچ پەرستەکان‌و پاشەکشەیێ کردنیان بووە بە دۆڕانەوە بەرەو دواوە، هەر کاتەکیش مەبەست یەك شت بوو، هەرچەند لە کارەکاندا هەندێ جیاوازیش هەبێ ڕێگای ڕێکەوتن ئاسان دەبێت.

بەم پێشەکییە دەچینە ناو مەسەلەی ئەو دوو پیاوەوە، بەرلەوەی (نورالدین) کۆچی دوایی بکات‌و بیئاگان لە هەر پلان‌و فێڵێکی دا، ڕژاو کە وتراوە، (نورالدین) کاتێ سوپای خۆی بۆ (سەلاحەددین) نارد تا پاڵپشتی بن لە جەنگی ملبەملانێدا بۆ سیخوڕی نەیناردبوون، چونکە هەموو سوپاکە هی ئەو بووە بەرلەوەی سوپای (سەلاحەددین) بن‌و، لە دڵسۆزیدا هیچ لەوانە کەمتر نەبووە کە دوای ئەوان هاتون‌و ئاسانیش نیە قسەی ئەم کەسە پەسەند بکەین کە وتویەتی: {ڕقی -نورالدین- کاتێ دەستی پێکرد کە (اسدالدین شێرکۆ) وەزارەتی گرتە دەست‌و، لە بەرنامەیدا نەبوو کە (میسر لەسەر دەستی ئەو لە دەستی فەڕەنگی دەربێنێ، هەتا یەکێکیان وتویەتی: گەر باسی گرتنی میسر هاتە گۆڕێ وەڵاهی — نورالدین — هیچ دڵی پێی خۆش نەبوو لە ڕوخسارو قسەکانیدا پێ ناخۆشبوونی لێدەردەکەوت، شێرکۆ

---

باس دەکات (جەنگی فەڕەنگ دەرفەتی ئەمەی نەدا ئەنجا نزیکبوونی مردنی..... شا صلاح الدین زۆر لێی دەترسا}. (صلاح الدين الايوبي/ سەرچاوەی ڕابردوو/ ل٩٤ - پەڕاوێز) بە کورتکردنەوە (وەرگێڕ)

تەماعی دەسەڵات بە سەرداگرتنی خۆی بڕیاری دابوو}[١][٢] ئەم قسەوباسانە واقیع نکۆڵی لێدەکات، چونکە (نورالدین) سوپای خۆی بە سەرۆکایەتی (اسد الدین) نەناردبوو بۆ (میسر)، ئەگەر ناحەزی دەکرد لەسەر دەستی ئەو رزگاری ببێ ئەنجا چۆن بە هێنانەدی ئاواتەکەی دڵی خۆش نابێ!! ئەگەر هیوای سەرکەوتنی هەوڵەکانی بۆ ئەو نیە ئەی بۆچی سوپای بۆ ڕەوانە کردووە؟! ئایا عەقڵ دەیگرێ سوپای خۆی بۆ تێشکان ناردبێ‌و، ئەو سەرکردەیە بشکێنێ کە لە ژێر ئالای ئەودا تێدەکۆشێت!

پاشان لێکۆڵەرەکە دەڵێ: (بەڵام – نورالدین – لەوکاتەوە ڕقی لە بنەماڵەی شادی هەڵسا کە (سەلاحەددین) پاش مردنی مامی دەستی بە وەزارەتی – عاضد –ەوە گرت‌و، کاتێ – نورالدین – لە تەماع‌و چاوتێبڕینی حاڵی بوو، زانی ئەوان بۆ خۆیان کاردەکەن‌و زۆر جار بە داخ‌و کەیسەوە دەیوت: کوڕی ئەییوب بوو بە پادشا)، ئاشکرایە کە پێویستە یەکێ لە سەرکردەکانی سوپای (نورالدین) بە وەزارتەکە هەڵبستێت‌و، ئەگەر غەیری (سەلاحەددین)یش هەڵبژێرێ‌و جڵەوی کاروبارەکانی بە دەست بگرێت، ئەو گومانەی لێکۆڵەر کردویەتی لە دڵ پیسبوونی (نورالدین) لە هەر کەسێکی‌تری غەیری (سەلاحەددین)یش دەیکرد!

ئەو کەسەی ئەو خەیاڵەی هەیە پێویستە کە بزانێ (نورالدین) بۆ خۆی (نجم الدّین ایوب) باوکی (سەلاحەددین) ڕەوانەی لای (سەلاحەددین) دەکات بۆ (میسر)و داوای لێدەکات لە پشتی کوڕەکەیەوە بێ، ئەی کەواتە چۆن لە داخوازی سەربەخۆیی میرنشینی (سەلاحەددین) دەترسێت‌و بە زیانەکی مەترسیداری دەزانێ لە بەرامبەر خۆیدا، ئێستاش گەورەترین پاڵپشتی ناردووە کە پشتی ئەو بگرێ‌و وەکو ڕێنومابەخش لەتەکیدا بووەستێ، ئەنجا ئەو کەسایەتییە باوکی خۆیەتی کە

---

١) الناصر صلاح الدین/ للدکتور عبدالمنعم ماجد، ص٨٢).
٢) تێبینی: دیارە ئەمجۆرە بۆچوونانە زۆر لە مێژوونووسان قسەیان لەسەر کردووە، پێشتر ئاماژەمان بە هەندێکیان کرد. هەمان سەرچاوەی ڕابردو/ ل: ٨٣. (نووسەر) (وەرگێڕ).

کەس لە دنیادا وەکو ئەو بۆ ئەو خۆشەویست نابێت!!

(سەلاحەددین) دەیویست دەست بەو شوێنە تازەیەوە بگرێ‌و، مسۆگەر هەر دەبێ ئەمەش ڕوبدات‌و[1] هەموو مرۆڤێکی هۆشیار کە خۆی لە چەقەکانی سەرکردایەتیدا دەبینێ حەز ناکات کە موڵك‌و دەسەڵاتی لەدەست بڕوات‌و لەگەڵ ئەوەشدا پەی بەوە دەبرد کە (نورالدین) گەورەو سەرداریەتی و، داخوازی دەکرد ئەو ڕازی بکات‌و ئەنجا مەسەلەی کینەو ئێرەیی نووسەرێکی خۆرئاوایی خەیاڵی دەکات کە لەکاتی نووسینی مێژووی جەنگی خاچ پەرستیدا بە ئارەزوی خۆی دەینووسێ وا دەزانن کە پاڵەوانانی ئیسلام هەر هەموویان لە جەنگی خەباتدا دژی گەلی خۆیان بوون، ئێمەش بەبێ بەڵگە شوێن لێکدانەوەی ئەوان دەکەوین، ئەمەش پێویستە خۆی لێدورە پەرێز بگرین.

زیاتر لە جارێ باسم کردووە: کە هەموو مەسەلەو بابەتەکی مێژوویی چەند ڕوویەکی ئەگەری هەیەو، هەرکەس ویستی لە کەسایەتی پاڵەوانێ کەم بکاتەوەو، ڕویەکی دەدۆزێتەوە بۆ تێرکردنی ئارەزوی کەسایەتی خۆی لە کەم‌و کوڕی لێگرتندا، بەڵام ئەوە شتێکەو ڕاستییەکەش شتێکی ترە.

بۆم هەیە چەند لاپەڕەیێ بخەمەڕوو لەوەی هەندێ لێکۆڵەران بەرهەمیان هێناوە لە بەڵگەنامەی ڕق‌و کینەی نێوان (نورالد ین)و (سەلاحەددین)، بەڕاستی ئامانجی سەرەکی (نورالدین) ئەوەبوو کە بەزوترین کات لەگەڵ خاچ پەرستەکاندا بکەوێتەوە

---

١) وەکو باسمانکرد (صلاح الدین) ڕەوادی بووە لە هەزەبان بووەو کوڕە میر بووەو، سەردەمێ حکومەتی ڕەوادی هەبووە لە سەردەمی بویە هیکانا لە (٣٣٢ ك) لەلایەن مەزرەبانەوە دروستکراوەو شابازیش لە دیاربەکردا حکومەتی دۆستەك لە (٣٧٠ ك)دا دروستدەکات. حەسنەویش لە شارەزورو کرمانشای ئێستا حکومەتێ دروست دەکات. بەڵام ئەم سەردەمە باوی دەرەبەگایەتی بووە کە قۆناغێ بوو مێژوو بزری کرد. ئەییوب باپیرەی (صلاح الدین) کەڵە پیاوێکی ئەم میرنشینە ڕەوادییە بووە. هەرچی میرنشینی هەزبانە لە (٢٩٩ ك)دا دیسم بەهرامی کوردی دروستی دەکات کە تا چیاکانی هەکاری دەستی ڕۆیشتووە، بەڵام (محمد ڕاوی) دەیخاتە ژێر دەسەڵاتی میرنشینی ڕەوادییەوە کە تاسەدەی (٧ ك) دەوام دەکات! امارە بهدینان) سەیر بکە (وەرگێڕ)

ملەملانێیەو، کاتێ (سەلاحەددین)یش لە مەسەلەی دەوڵەتی فاتیمی رزگاری بوو پێویستە بە پەلە بڕوات بۆ داگیرکردنی (کەرەك)، کاتێ (نورالدین) لە ڕوی بەرامبەریەوە بۆ (کەرەك) ڕادەپەڕێ دوژمن دەکەوێتە نێوان دوو بەرەوەو، بەمەش هۆیەکانی سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر دەکات... ئەگەر (سەلاحەددین) هەندێ شلیو شێنەیی بکات، ئەوە پێویستە (نورالدین) تورە بکات ئەگەر کوڕی (نورالدین) خۆشی لە شوێنی (سەلاحەددین) بووایەو سستی کردبایە لە چون بۆ ئەو شوێنە کە پێویست بووە بۆی بچێت، بێدوودڵی (نورالدین)ی تورە دەکرد.

(سەلاحەددین) دیاری بەنرخی لە دارایی گرانبەها بۆ سەردارەکەی نارد کە لە کۆشکی فاتیمیدا دەستی کەوتبوو، بەڵام (نورالدین) بە شوێن ئامانجی بەرزترەوەیەو، بەسەر نامەبەری (سەلاحەددین)دا قیژانیو وتی ئێمە (سەلاحەددین)مان بۆ ئەوە نەناردووە دیاری گرانبەهامان بۆ بنێرێ، بەڵکو بۆ ئەوەمان ناردووە تا بە ماڵەکەوە ئامادەبێ بۆ داگیرکردنێکی چاوەڕوانکراوو پێویستە هەر لە ئێستاوە لە نامەکەی خۆی حاڵی ببێت!! ئەم وەڵامەش بەلای (سەلاحەددین)ەوە وا سەیردەکرا کە بەکەم زانینی کارەکانی ئەوە، بەڵام وەڵامدانەوەی چاوەڕوانکراوی فەرماندەیەکی گەورەوەو ئارەزوومەندی بەرەو ڕووبوونەوەی لەگەڵ دوژمندا بە گروتین تر دەکاتو، لەگەڵ ئەو وەڵامدانەوەی (سەلاحەددین) ڕەوانەکراوی خۆی ناردە لای ئەم پیاوە گەورەیەو هەواڵی دەداتێ کە ئەو لە چون بۆ (کەرەك) دوا ناکەوێت.

بێگومان (نورالدین) بە سوپاوە بەڕێکەوت، چاوەڕوانی (سەلاحەددین)ی کردو ئەویش خۆی ئامادە نەکردبوو، ئەمەیە شوێنی ڕەخنەو گازەندەیی ئەوانەی دەڵێن: دواکەوتنی ئەو ئامانجێکی سیاسی بووە کە بریتی بووە لە ترسانی ئەو لە پاشماوەکانی فاتیمییەکان کە لەگەڵ ونبوونی ئەودا بیێنەوە سەر تەختی دەسەڵات، ئەوانە مەبەستەکیان هەیە لە قسەکەیاندا، بەڵام ئەگەر سەرکردەکە لە بەرامبەر هەموو ئەگەرێکدا بوەستێ کە دێتە ڕویەوە یەك بست ناڕواتە پێشەوە، بەڵکو پێویستە لەسەری کەسێك لە شوێنی خۆیدا دابنێ لە (میسر)دا کە خۆیان پڕچەك بکەن! بووار نەدات چاوە خەوتووەکان خەبەریان بێتەوە.

(نورالدين) ڕۆیشتو (سەلاحەددین) نەهاتو، ئەم پیاوە تووڕەیە نامەیەكی ئاگرینی بۆ ئەم سەركردەیە نارد كە لە بەڵێنەكەی دواكەوتبوە، ئەم نامەیە ئەوەندە توندبوو كە هەتا یەكێ لەسوارچاكانی (سەلاحەددین)ی تووڕەكردو لەناو خەڵكەكەدا هاواری كرد (بۆچی-نورالدين- بەم ڕەنگە دەدوێ‌و، وەك ئێمە لەبەرچاوی ئەو هیچ نەبین، ئەگەر بێت‌و بێتە ناومان بە شمشێرمان جەنگی لەگەڵدا دەكەین).

ئەو گەنجەیە پەلەیەكی هەڵەشانە هانیدا كە ئەمە لای گەلێك بەیان بكات كە هەر هەموویان سوپای (نورالدين)ن، (نجم الدين ايوب) پەی بەمەترسی ئەم قسەیە برد كە ئەم كابرایە بە پەلەیە، وتی، جا هاواری كرد: ئەزانی ئەوە باسی چی ئەكەیت، ئێمە هەمووومان لە خزمەت (نورالدين)دا كار دەكەین‌و، پاشان لەبەر چاوی ئاپۆڕەیەكی خەڵكدا ڕوی كردە (سەلاحەددین)ی كوڕی‌و وتی: (ئەگەر — نورالدين — بێ من ئەو خاڵەیەت — ئاماژەی بۆ جارمی كرد — زەوی لەبن پێ یدا ماچ دەكەین هەموو لەشكر وەك خۆمان گوێڕایەڵی (نورالدين)ین ئەو وڵاتەش كە ئێمە لەناویدا دەژین هی ئەوەو، بۆی هەیە فەرمانمان پێ بكات لەناویانداو، ئەنجا ڕوی لە سوپا كردو وتی: ئێمە لێرەدا هەمووومان گوێڕایەڵی — نورالدين — ین تێدەگەن؟!

بەناوی ئەو ئەو وڵاتەمان گرت‌و، بەناوی ئەویش لە مەیدانی تێكۆشاندا سەردەكەوین!!). (سەلاحەددین) وتی: باوكم چۆن دەڵێ ئاوایەو، ئەگەر (نورالدين) یەك نوێنەری بچوكی خۆی بۆ لام بنێرێ‌و جڵەوم بۆ لای ئەو ڕابكێشێ گوێڕایەڵی دەكەم ئەوەتامن بۆ (كەڕەك) دەڕۆم!!

فەرماندە بە لەشكرەوە لە (میسر)ەوە كەوتەڕێ‌و، وایزانی جەنگی گەرم لە دەوری (كەرەك)دا دەبێ، بەڵام هەر لە ڕێگادا دوو هەواڵی ناخۆشی پێگەیشت، یەكەمیان مردنی باوكی بوو كە لە ئەسپ كەوتبووە خوارەوە كە لە مەیدانی یاریكردن بە گۆچاندا دەكەوێتە خوارو سەری دەشكێ‌و، پزیشك ناتوانێ لە مردن

رزگـارى بكـات، هـەواڵى دووەم مردنـى پاڵـەوانى شـەهيد (نورالـدين) بـوو كـە گەورەترين دوژمنى خاچ پەرستان بوو[1] هەڵگرى ئاڵا بوو بۆ هێرش‌و بەرگرى!! ئـا لێرەدا (سەلاحەددين) بينى پياوێكى بەرپرسيارەو ئەركێكى قورسى لەسەرە چونكە سوختەى (نورالدين)ە.

(سەلاحەددين) ڕاوێژكارانى خۆى كۆكردەوەو، قازى (فاضل) لە هەمووان نزيكتر بوو، بۆئەوەى بزانێ چـى بكـات‌و، ڕايەكـە لەسـەر ئـەوە دەرچـو كـە بـۆ قـاهيرە بگەڕێتـەوە تـا مەسـەلەى ئيمـاڕەتى (نورالـدين) لـە شـامدا لـەدواى مردنـى (نورالدين)دا ڕۆشن دەبێت‌و، ئەو زانى لەناو ئەميرەكاندا كێـشە سـەر هەڵـدەدات‌و هەريەكەيان بە بيانووى پارێزكردن لە كوڕە باشەكەى شا (ئيسماعيل)دا دەست بـە سەر پاشايەتيدا بگرێت، منداڵەكە تەمەنى نەگەيشتۆتە (١١) ساڵى‌و تـا دەگاتـە تەمـەنى پێگەيشتن‌و هەرزەكارى پێويستى بە كەسێ دەبـێ كـە مـشورى كارەكـان بخوات‌و بەڕێوەيان ببات.

بە مسۆگەريش توندترين كێشە سەريهەڵداو، تەماعى گەورەى موسڵ كە بـراى (نورالدين) بوو دەركەوت بۆ خستنە ژێر ڕكێفى وڵاتـى ئـەو بـەو نـاوەى كـە ئـەو وەسييەكى ئەميندارە بەسەربرازەكەيەوە، ئـەنجا ئـەو هەواڵـە بـە (صـلاح الـدين) گەيشت كە هەندێ لە سەردارانى ميرنشينى شام پەيوەندييان بە فەڕەنگييەكانـەوە كردووە كە لەكاتى شەڕكردن لەگەڵ دوژمنيدا ئەوان كۆمـەكى‌و ياريـدەيان دەدەن!! جارێكى‌تر گەمەى (شاور)و (ضرغام) بۆ (شام) گەڕايەوە كـە (نورالـدين)ى هانـدا (اسد الدين) بنێرێ تا وڵات لە كارەساتى هێرشى فەڕەنگـەكان بپارێزێـت، كەواتـە پێويستە (سەلاحەددين) بەرەو شام بڕوات تا ئەو ژێردەستانە لەكاتى چـونيياندا بـۆ

---

١) ڕابردو بينيمان كە لە (مێژووى گەلى كورد/ صالح قەفتان/ ل١٨٠)و (مێژووى كـوردو كوردسـتان/ شـكرالله بابان/ ل١٢٠) ئاماژەكراوە كە (صلاح الدين) نورالدين — دەبينێ و، پاشان بە بيانوى بـاوكى دەگەڕێتـەوە! كەچى لە كتێبى ئەم نووسەرەدا كە نووسراوى (د: محمد رجب البيومى)يە (صلاح الدين) لە ڕێگادا هـەواڵى كۆچى ئەم دوانەى پێدەگات! (وەرگێڕ).

هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ فەرەنگدا کە ئەوان بە ڕەواڵەت وەریـدەگرن نەکەونـە داوی ئەوانەوە، ئەو شوێنە گرنگانەی لەسەردەمی (نورالـدین)دا قـایم بـوون دەسـت بـە داگیرکردنیان نەکەن.

ئەگەر (نورالدین)یـش بـۆ باوەشـی بـەزەیی خـودا گەڕابێتـەوەو ئـەو شـوێن و پێگەیەی (سەلاحەددین) پێیگەیی و ناوی دەرکرد لە وەچەکانی دوای خۆیـداو ئـەو وەری نەگرت، ئـەویش نموونەیـەکی جـوانی دڵـسۆزی بلیمـەتی و، هەسـتکردن بـە بەرپرسییەکی ئاینی پێشکەش کرد، ئەوانەی کەسان بە ئاکامەکان دەکێشن، نـەك بە نیەت پاکی ئەو حوکمەی بەسەردا دەسە پێنن کە وەکو (عماد الدین)ی بـاوکی و (سەلاحەددین)ی شاگردی نەیتوانی خاچ هەڵگرەکان بشکێنن و ئەوەیان لەیاد چووە کە ئەو پیاوە مەزنە مەیدانداری هەڵمەتەکانی خاچ پەرستی بەرفراوانی کردووە کـە لەسەردەمی باوکیدا ئەوە نەبووە، دیسانەوە ئەو (سەلاحەددین)ی لەسەر دڵـسۆزی و فیداکاری و پێشمەرگەیی ڕاهێناو سوپایەکی پێ سپارد کە بیکات بە سەرکردەیەکی تێکۆشەرو کۆڵنەدەر، ئەگەر لەبەرئەو نەبایە ئەییوبییەکان ئەو دەنگەیان نەدەهێنا، کەواتە ئەو شوێنێی لە نێوان ئەوانی پێش خۆی و دوای خۆیدا گەورەیە، زیاد لەوەش خاوەن ئەو بڕوایـە بـووە کـە شـەونخونی درێـژ بکـات، ئەمـەش لەکاتێکـدا خـاچ پەرستەکان لە هەر ناوچەیەکی مسوڵماندا هێرشیان بردووەو نوێژی تایبـەتی خـۆی لە میحرابدا هەبووە کە توێشوو توانای خۆی لێوەرگرتووە بـۆ خـەبات، کاتـێ لـە ڕکوع و کڕنوشدا بووە هەست بە یاریدەی خوایی دەکات فەیز دەکاتە سـەری، (تـاج الدین) شاهەنشا ڕاستی کردوە کە لەکاتی بـەزەیی پـێ هاتنەوەیـدا ئـەم شـیعرەی شاعیرێکی بەسەردا دەڵێت:

جمع الشجاعة والخشوع لربه      ما اعظم المحراب في المحراب

واتە: ئازایەتی و ملکەچی بۆ پەروەردگاری کۆکردەوە، چەندە مەزنە میحرابەکە لە میحرابدا.

لە دوای نووسینی ئەم مەسەلەیە داو تەواوکردنی دا حەز دەکەم کۆتایی باسەکە بەو گەواهییە ڕاستەیەدا بێنم کە هەستی (سەلاحەددین) لەمەڕ مامۆستاکەیدا دەردەخات، ئەمەش لەکاتی سەرهەڵدانی ئەو ناکۆکییەدا کە ڕابردوو ئاماژەمان بۆی کرد تا کۆتایی بە هەموو ئەو نووسینانە بێنێ کە دەیانەوێ کێشەکە بەو شێوەیە بەرجەستە بکەن کە خۆپەرستیو ئارەزووی کەسایەتی وێنە بیر دەکات کە (سەلاحەددین) بە قازی (بهاالدین ابن شداد) دەڵێ دوای ئەوەی کۆچی دوایی دەکات: (هەواڵمان لە — نورالدین — بەدەست گەیشتووە کە ویستویەتی بەرەو میسر بچینو، کۆمەڵێ لە یارانمان ئاماژەیان بەوە دەکرد کە نەیاری ئەو بینو بە قسەی نەکەینو، بەیەکڕیزی پەلاماری سوپای بدەینو پەرچی بدەنەوە ئەگەر هاتو مەبەستی هێنایەدی، من تاکە کەسێ بووم نەیاری ئەوە بوومو وتم: ئەم گوتنە دروست نییەو، بەردەوام ناکۆك بووم لەگەڵیاندا تا هەواڵی مردنی ئەو گەیشت،[1] ئەمەش دان پێداهێنانی (سەلاحەددین)ە بە زمانی خۆیو، (جەهیزە) قسەی هەموو قسەکەرێکی بڕییەوە.[2]

١) (احمد ایبش) لە (تحقیق)ەکەیدا لەسەر (النوادر السلطانیة ابن شداد/ ط٢/ ٢٠٠٥/ دیمەشق) لە (ل ١١٢)دا دەنوسێ: {ئەمە هەڵوێستێکی پیرۆزە کە بۆ صلاح الدین وەفاداری جوامێری بە هەموو شانازییەکەوە تۆمار دەکات کە نایەوێ قسەی گەورەی ڕابردوی خۆی تێکۆشەری گەورەو دنیانەویست نورالدین بشکێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا توانای تەواوی هەبووە نەیکاتو، هەموو هێزی میسرو داهاتەکەی بەدەست ئەوەو بووە}. (وەگێڕ).

٢) ئەمە پەندێکی عەرەبییە. (وەرگێڕ)

# لە پێناوی یەکڕیزی دا

شاعیرێکی عەرەبی دەڵێ:

لقد كان فی الهجران ما یزع الهوی ولكن شدید فی الطباع اشتقالها

ئەگەر خوونەریتەکان گواستنەوەیان دژوار نەبایە، ئارەزووەکان دەسەڵاتیان بەسەر دەروونذا توندوتیژ نەبایە کاربەدەستە بچووکەکان کە دەسەڵاتی شارێكو گوندەکانی دەوروبەریان هەبووە بۆیان دروست نەدەبو کە داوای ناکۆکی بکەنو، بە پەلە دەست بۆ هاوپەیمانی کردن لەگەڵ دوژمنان درێژ بکەن تا -(سەلاحەددین) بڕوخێنن، (سەلاحەددین) لە (قاهیرە)وە بۆ شام هات نەك بۆئەوەی لە شوێنی خۆیاندا لایان ببات، بەڵکو بۆئەوە هات ئەگەر بێتو ئەوان بێنە ژێر بەیداخی تێکۆشەرانەی ئەو وەکو چۆن ڕابردوو لەژێر بەیداخی (نورالدین)دا بوون، ئەو سەقامگیرو پاچەسیاویان دەکات [1].

---

١) محمد ئەمین زەکی بەگ لە کتێبی (مشاهیرو کردستان/ اعداد رفیق صالح/ ج٢/ ل٢٥/ سلیمانیە/ ٢٠٠٥)دا دەڵێ: {ئەگەر سەیری ژیاننامەی کورتی ئەو بکەین سوڵتانێکی مەزن بوو، خزمەتێکی گەورەی پێشکەش بە خۆرهەڵات کردو، بەسەر فەرەنگدا سەرکەوتو سوپای شکاندن و، قسەی سەردارانی ئیسلامی کرد بە یەكو دوو پایەی گەورەی خستەسەر دەسەڵاتی خۆیو لە میرنشینی ئیسلامیدا کە — سوریاو میسر بوو، هەرچەندە مەزهەبیان جیا بووە — حوکمی ئەو لە کوردستانەوە تا تونسو تا سودانو یەمەن تا عەدەن درێژ بۆوەو، بە زیرەکی خۆی توانی یەکڕیزی دروست بکات، هەر چەندە لە مەزهەبو نەریتو ڕەگەزدا لێك جیابوون، هەموو ئەو سەرکەوتنو ڕزگار کردنانە کە پایەیەکی مەزنیان هەبوو لە دامەزراندنی دەسەڵاتیداو پاراستنی ئیسلامدا بۆ کەسایەتی مەزنیو سروشتی پاکی ئەوو جوان ئیدارەییو دادگەریو نەرمی ئەو دەگەڕێتەوە دکتور یوسف قەرزاوی لە (این الخلل)دا؟ لەمەڕ (صلاح الدین)ەوە لە خۆرهەڵاتناسی ناودار (گب) دەگێڕێتەوە کە لە کتێبی (الی این یتجه الاسلام ؟)دا دەڵێ: {جموجۆڵە ئیسلامییەکان تەنیا لە بوونی

پێویستە لەسەر هەر یەکێك لەوانە هۆشیارانە بە خۆیدا بچێتەوەو، بپرسێ: ئایا ئەگەر پشتگیری لە (سەلاحەددین) بکەم هیچ شتێ زەرەر دەکەم؟ بەڵکو پێویستە هەستی ئاینی بە سەریدا زاڵ ببێ‌و پرسیار بکات: ئەی بۆچی (سەلاحەددین) خەبات دەکات؟ کێ خەبات دەکات؟ جیاوازی لە نێوان پاڵەوانێکی مسوڵمانی ئازادا، کە ژیانی بەولاوە ناوەو قوتابی‌و شاگردەکەی ئەوچی دەبێ کە بە شایەستەیی شوێنی ئەو بگرێتەوە کە جگە لەو کەسی‌تر پێی ناگات؟!

ئەگەر ڕوو لە یەکتری بکەن‌و ژیرانە لە یەکتری بپرسن کە نموونەی وەك (سەلاحەددین) بەشێکە لە بەزەیی خودا بۆ ئەوانەو ئەو لە پاش خودا پاسیان دەکات‌و لە دەست فەرەنگەکان دەیانپارێزێت. ئەگەر لەلایەن فەرەنگەوە پەلاماریان بدرێ بە هەر هەموویان ناتوانن بەر بە کونەکەی بگرن، خاچ پەرستەکان بە مردنی (نورالدین) زۆر دڵخۆش بوون‌و، وایان دادەنا ئەگەر مەترسی (سەلاحەددین) نەبێ کاتی سەرکەوتن نزیکەو، ئەوان بە تەواوی تەییارو ئامادەن کە لەگەڵ ناحەزی (سەلاحەددین)دا لە مسوڵمان‌و نامسوڵماندا هاریکاری بکەن تا ببن بە کۆمەڵەیەکی یەکگرتووی پشت بە یەك بەستو لە بەرامبەر سەرۆکی (مصر)دا.

گەورەترین هیوای فەرەنگی ئەوەبوو کە فەرمانڕەوایانی (شام)و (موسڵ) (جەزیرە)یان لەگەڵدا بن‌و، خەلیفە (نورالدین) بێ یاریدەدەر بمێنێتەوە!! ئا ئەوەتا ئەوانە دەبینن کە هیوایەکانیان خەریکە بێتەدی کە دەبینن ئەو میرنشینە

---

سەرکردایەتییان کەمە، لە دەرکەوتنی -صلاح الدین-ەکی تر هیچی تریان کەم نییە}. (محمد ئەمین زەکی بەگ) لە (مشاهیر الکردو کردستان / ل ٢٦)دا دەنوسێ: {مێژونوس (ستانلی) دەڵێ: (جیهان بە ڕەوشتی ئەو کەسەوە وەسفە بەرزەکەی ئاشنابووە، بێگومان دڵێکی پاکی هەبوو، پیاو ئازاو دڵ ناسك بوو... هتد. بەو وەسفانە نموونەیەکی کامڵ بوو بۆ ئیسلام).

هەروەها هاتووە: {هەتا (قلب الاسد) بەم ناوە وەسفی دەکاتن: (دڵێ ئەم شێرەیە لە دڵی شێری ئێوە بەهێزترە)}. وە (امین معلوف) لە (الحروب الصلبیە/ ل٢٢٦) دەڵێ: {بەخشندەیی صلاح الدین وەکو دەبینین گەیشتۆتە ئاستی نەست (الاوعی)}. (ابن الاثیر) لەمەڕ نەژادی ئەییوبییەکان دەڵێ: {ئەم پیاوە نەژادی بەرێزترینی کوردەکان بووە}.

(صلاح الدین الایوبی/ ولید نویهض/ دار ابن حزم/ ل٦٦-١١٦}. (وەرگێڕ)

بچووکانە بە گەردەنکەچییەوە بە پەلەوە بەرەو ڕوویان دەچن و داوای پاسکردن و چەپاڵەدانیان دەکەن لەدەستی (سەلاحەددین)! وەك بڵێی ڕابردوو نەیان بینی وە کە (کامل کوڕی شاوەر) چی پێکردن کاتێ لە ڕووی باوکیدا قیژاندی: ئەگەر من بە دەستی پاڵەوانەکانی مسوڵمان بکوژرێم پێم باشترە لەوەی بە سەرشۆڕی لە بەردەستی بەزەیی دوژمنێکی خاچ پەرستدا بژیم، وەك بڵێی نەزانن کە دوژمنی ستەمکار مەڕە دابڕاوو ئاوارەکان یەك بەیەك خوێنیان دەڕێژن، ئەگەر ڕێگا چۆڵ بێ و ڕوی (سەلاحەددین) بزربێت.

(سەلاحەددین) بەوەی زانی کە خاچ پەرستەکان بە مردنی (نورالدین) کەیفخۆش بوون و، بە دووربینییەکەی دەیزانی کە ئەوانە شارەکانی (شام) یەك بە یەك هەڵدەلوشن و ئەوەی (نورالدین) بەربەست بوو لە ڕێگای هێنانەدیدا دەیهێننە دی. ئەنجا بە ئەرکی زانی بە ئاشتی پەروەروەرانە لە ئەمیرەکانی شام ڕاپەڕێ و بە دیتنی ئەو هەورانەی لە ئاسۆدا هەیە بکەوێتە کێبەرکێوە، بەڵێ بەشێوەیەکی ئاشتیانە ڕۆیشتن و جگە لە (٧٠٠) سەرباز لەگەڵ خۆیدا نەبرد، ئەمەش تەنیا بۆ خۆپاراستن لە هەر ئەرکێکی پەلاماری دوژمنی خاچ هەڵگری ستەمکاردا، کاتێ بە ساغی گەیشتە (دیمەشق) سوپاسی خوای کرد کە چاوەکانی فەرەنگی خەواندن، چونکە لەوە دەترسا ئەگەر سوپایەکی تەواو ئامادە لە ژمارەو تفاقدا بڕوات ئەمیرەکانی شام واتێدەگەن کە (سەلاحەددین) بۆ جەنگی ئەوان هاتووەو، دەیەوێ بە زۆری شمشێر ناچاریان بکات. خودا لەمەدا سەری خست بەرلەوەی بگاتە (دیمەشق) پەیامنێری خۆی نارد تا خەڵکی ئاگادار بکاتەوە کە لە مزگەوتی گەورەدا کۆببنەوە، ئەو وەکو سەردان هاتووەو مەبەستی شەڕ نییەو هەڵوێستی دوای مردنی (نورالدین) لەگەڵ جێنیشینەکانیدا بەسەر میرنشینەکانەوە تاووتوێدەکات، تا ڕیزەکان لە ژێر یەك ئاڵادا یەکبگرنەوە، وە ئەو تەواوی خۆشەویستی خۆی دامەزراندووە بۆ (ساڵح) شای کوڕی (نورالدین) لە ڕوی بیرەوەری باوکیداو، ڕێزی تەواو بۆ ئەو خێزانە تێکۆشەرە دادەنێت.

خەڵکی گوێ بیستی ڕاستگۆیی‌و ئاشتیخوازانەی (سەلاحەددین) بوون، زانییان خودا دوای (نورالدین) مسوڵمانی پشتگوێ نەخستووە، بەڵکو کەسێکی هێناوەتە شوێنی ئەو کە هەنگاوەکانی ئەو هەڵدەگرێ‌و ڕۆڵی ئەو دەبینێت‌و هەواڵی پێگەیشت کە جەنابی (سیف الدین غازی) کاربەدەستی (موسڵ) کە کوڕە مامی (صالح) شایە لە دۆستایەتی خۆی لایداوە، بە منداڵ سەیری دەکات گوایە ناتوانێ ئەرکی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت‌و، بۆیە ویستوویەتی میرنشینی ئەو نەك بە خۆشی. بەڵکو بە داگیرکردنێکی بە زۆری دەستی بەسەردا بگرێت‌و، هەر وەکو (نورالدین) لە موسڵدا لە شوێنی خۆیدا داینەناوەو، زەمینەشی بۆ پادشایەتی بۆ خۆش نەکردووە بە پێدانی سامان‌و کەرەستەو ئامێرو پیاو.
هەواڵی نیازی (سیف الدین) بە (سەلاحەددین) گەیشت‌و، زانی زەنگی شەڕ خەریکە لێدەدات‌و، ئەو ناکۆکی‌و پارچە بوون‌و فراوانی شەڕو هەرایە کە لە ڕابردودا حیسابی بۆ کردبوو بووە بە واقیع‌و، دڵنیابوو لەوەی کە (دیمەشق) شەڕی تێدا ناقەومێ‌و ئاشتی پارێزراوەو، ئنجا ڕووی لە (حمص) کردو، فەرمانڕەوایەکەی ڕێگای نەداو، خۆی لە پاڵ قەڵاوە تەقەت کرد.

لەوکاتەشدا فەرمانڕەوا خۆپەرستەکان لەگەڵ شا (صالح)دا کۆبونەوە، تا وای لێبکەن کە (سەلاحەددین) بۆئەوە هاتووە کە لەسەر تەختی لاببات‌و ئەوەی دەیڵێ لەبارەی پاراستنی ئەودا تەڕاویلکەیە کە خەڵکی پێ فریو خواردو دەکات، شای منداڵیش لەوەی دەیبیستێ نازانێ کامە ڕاستە، بۆیە هەموویان پێیان لەسەر ئەوە داگرت کە لەگەڵ (سەلاحەددین)دا بجەنگن، تەوان دەیانزانی لەبەرامبەری ئەودا دەبەزن، بۆیە گەوجییان خەیاڵی داواکردنی یارمەتی شای (ترابلوس) بە ناوی (ریموند) لە کەللەی دان‌و ماڵ‌و چەکیان بۆ هەڵڕشت تابە سوپاوە بێ لە کارەساتی (سەلاحەددین) دەربازیان بکات! (ریموند) بە دڵی خۆشەوە وەڵامی دایەوەو، سوپای خاچ پەرستی بۆ پەلاماردان کۆکردەوە، بەڵام (سەلاحەددین) ئەوەی پشتگوێی نەخستووە، بەڵکو بە مەبەستی (تەڕابلوس) کەوتە ڕێگا، کاتێ هەواڵی پێگەیی کە

سوپای مسوڵمانان بەرەوو تەرابلوس بە ڕێگاوەیە، ڕوی لە قەڵاکەی کردو ڕایگەیاند ئەو ئاشتیخوازە نەك شەڕفرۆش.

بەم شێوەیە خودا مسوڵمانانی لە جەنگێ چەپەڵەدان کە خەریك بوو هەڵگیرسێت پاراست، خەڵکەکە بیریان لە تیرۆرکردنی (سەلاحەددین) کردەوە، بەڵام کێ ئەو ئازایەتیەی هەیە؟ ئەوانە خۆبەخشانێکن لە یارمەتیدەرانی (سنان)ی (شیخ الجبل)، پەیوەندییان بەوانەوە کرد، کێ لەخۆی ڕادەبینێ (سەلاحەددین) تیرۆر بکات، ئەگەر خودا نەیپاراستبایە دەبو بە کارەسات، (سەلاحەددین) کۆڵی نەداو ڕوی لە (حمص) کردو قەڵا شینەکە خۆیان دابەدەستەوە، ئەنجا دانیشتوانی (بەعلەبەك)و، پاشان دوای بەدەستهێنانی سەرکەوتن بۆ (حەلەب) گەڕایەوە.

فەرمانڕەوایانی شام بینیان کارەکە ڕاستییەو شای فەڕەنگی بێدەنگ بووەو پلانی (باتینییەکان) سەری نەگرتووەو، هیچ ڕێگایەکیان نەماوە مەگەر داواکردن نەبێ لە (سیف الدین غازی) کاربەدەستی (موسڵ) کە وایان تێگەیاند ئەگەر یارمەتییان بدات بۆ بەرکەنارکردنی (سەلاحەددین) ئەوکاتە تەواوی وڵاتی (نورالدین) لە ژێر ڕکێفی ئەودا دەبێت.

دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی چەك‌و سوپا تا ببێ بە کۆمەکییەکی کاریگەر لە جەنگی (سەلاحەددین)دا، (سیف الدین)یان بەو قسانە لەخشتە برد (کە لەبارەی تفاق‌و سوپاوە بۆیان باسکردبوو، زوو چووە پێشەوەو داوای لە شا (صالح) کوڕی (نورالدین) کرد کە چاوی پێ بکەوێ‌و داوای لێکرد کە لە پێشەنگی سوپادابێ‌و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ ئەودا بڕوات تا خەڵکی وابزانن بۆ تۆڵە سەندنەوە هاتوە، بۆ برازاکەی لە دکتاتۆرێکی زەوتکەر کە هاتووە کوڕی پادشاییەکەی دەربکات.

(سەلاحەددین) ویستی بەبێ جەنگ شەڕەکە یەکلابکاتەوەو نوێنەری خۆی ناردە لای (سیف الدین غازی) کە پێی ڕاگەیەنێ ئەو حەزی لە ئاشتی‌و پێکهاتنەوەیە تا خوێنی مسوڵمانان نەڕژێ‌و، شکستیش بە نیازی فەڕەنگی بێنێ کە حەز دەکەن مسوڵمانان خوێنی یەك بڕێژن‌و دەسەڵات‌و توانا لەدەست بدەن‌و، ئەو ئامادەیە

وڵات وەك خۆی بە ئەو بسپێرێ بەو مەرجەی ئەو لە (دیمەشق)دا جێگری شا (صالح) بێ! ئەمەش پێشنیارێکی سەخاوەتیو دڵفراوانییەکە (سەلاحەددین) بۆ یەکخستنەوەی ریزەکان خستیەڕوو، چونکە ئەو دەیویست ئەوە دەستەبەر بکات کە وڵات لەدەستی مسوڵماندا بمێنێتەوەو، ئەگەر (سیف الدین) لە (دیمەشق)دا جێگری (صالح) شا بێئەوە حەقو مافی ئەو پارێزراو دەبێو ئەرکی باوکی ئەوی ڕەچاو کردووە، لەلایەکی تریشەوە لەناو گوێچکەو چاوی فەرەنگیدا لە کەمینا دەبێو دەتوانێ خۆیان لێ بپارێزێو، دەتوانێ بەربەستەك بێ لەبەرامبەر وڵاتانی شامداو، بەڕاستی ئەمە خودی قوربانی بە خۆدانەو، ئەگەر خەڵکەکە حاڵی بووبان بەمە دڵخۆشو کامەران دەبوونو ئەو دەمە ئەیانبینی کە پەیماننامەکەی (سەلاحەددین) پارێزەرێکە قەت خەونیشیان پێوە نەبینیوە لە ڕابردوودا.

بەڵام وەڵامی ئەوەیان نەدایەوە کە پاراستنو ئاسایشی ئەوانی لەخۆ گرتبوو، (سیف الدین) لەسەر جەنگ گێڕان سووربوو تا (سەلاحەددین) بە یەکجاری دەربکات، ئاکامەکەشی ئەوەبو لەگەڵ یارمەتیدەرانی زۆر بەخەستی شکانو، سوپاکە پەرتو بڵاو بوون ونەیانتوانی یەك بگرنەوەو، بەرامبەریشیان بە دواوەیانە بەدیلیان دەگرێو دەست بەسەر تفاقیانداەگرێ تا لە (حەلەب) داگیرسانەوەو، فەرمانڕەواکان بە شکاوی گەڕانەوە دواوە.

هەرچی (سیف الدین) بوو بە ترسەوە بۆ (موسڵ) گەڕایەوەو لەسەر هەستی دەروانیو هەواڵێکی ناڕاستی بۆ هات کە گوایە (سەلاحەددین) بە ڕێگاوەیەو بەنیازە بێتە سەری، ئەمەش پڕو پاگەندەیەکی ناڕاست بووو جێگای بڕوا نییە، چونکە (سەلاحەددین) لەبەر دوژمنی ڕاستەقینەی خۆی بە سوپاوە بۆ دوور ناڕوات، بەڵکو وازی لێدێنێ تا لەگەڵ ڕۆژاندا هەڵوێستی دەگۆڕێ، ئەم هەواڵە ناڕاستە بە پەلە هەردوو لەشکری پێك پڕژاند، کاتێ (سیف الدین) بە سوپایەکی نوێ کە لە دەوری شاردا کۆی کردبوونەوە کە دەگەیشتە (٦٠٠٠) جەنگاوەر هێرشی بردو، سەرکەوتنەکەش بۆ (سەلاحەددین) بوو، ئازایانە دەسەڵاتی بەسەر

هەڵوێستەكە داگرت‌و ئەوانى تريش بەترسەوە ڕايان كردو دەسكەوت‌و تالآنيانى زۆريان بەجێ هێشت كە سوپاى (سەلاحەددين)ى بەهێز كرد. بەمە هيواى (سيف الدين) نەما (سەلاحەددين)يش بۆ داگيركردنى شام‌و گوندەكانى كەوتە ڕێگاو بە ملكەچييەوە جڵەويان دايە دەستيەوە.

لەوكاتە تيپێكى تيرۆرست لە لادەران بە پلانى يەكێ لە فەرمانڕەوايانى (مورتورين) پەلامارى (سەلاحەددين) دەدەن كە جلوبەرگى (ميسر)ى دەپۆشن‌و دەورى دەدەن‌و، يەكێ لەوانە چەقۆيەك دادەوەشێنێتە سەرى‌و، ئەگەر لەبەر خودەى ئاسنينى سەرى نەبايە دەستبەجێ دەيكوشت، بەڵام خودا پاراستى‌و (سەلاحەددين) ئاگاى لە خۆى بوو، دەستى گرت‌و، تاوانبارەكەش كە زۆر بە توانا هەركەت بوو هەوڵى دەدا چەقۆكە لە گەردەنى (سەلاحەددين) بدات‌و، هەرچى (سەلاحەددين) بوو دەستەكەى ترى گرت‌و دەيگوشى، تا سوپاكانى هاتن‌و بكوژەكەيان گرت تا بيبەن سزاى تاوانى خۆى وەربگرێت، ئەم پاڵەوانە توشى چەند برين‌و ڕوشانێ هات كە كەمێ خوێنيان لێدەهات، بەڵام بە زويى سارێژ بوونەوە.

ئەو تاوانە لەبەرامبەرى قەڵاتى (ئيعزاز)[1]دا كرا كە لە ژێر گەمارۆى لەشكردا بوو، چەند ڕۆژێكى بەرهەڵستى كردو دانيشتوانەكانى لە سەركەوتنى ئوميديان نەما، بۆيە چەندان خەڵكيان بۆ ئاگربەست نارد، (سەلاحەددين) ئاشتى پەسەند كردو لە هێكرا كچى (نورالدين) بەدەركەوت كە لەناو گەمارۆدراوەكاندابوو لە (١٠) ساڵيدا بوو، ئەويش بەڕوى خۆشەويستى‌و ڕێزەوە پێشوازى لێكردو ماڵ‌و زێڕى پێ بەخشى‌و پرسيارى كرد لە داخوازيەكانى‌و ئەويش وتى: (خەڵكى ئيعزاز ئەويان دەوێ، بەڵام بەبێ دانانى هيچ دەسەڵاتێ بە سەرياندا)، (سەلاحەددين) پێكەنى‌و وتى: ئەم شارەم بە تۆ بەخشى‌و تۆش بە ئەوانى ببەخشەوەو، ئەنجا لێى پرسى چى ترت دەوێ؟ وتى: دەمەوێ بگەڕێمەوە (حەلەب) بۆ ناو خێزانەكەم‌و،

١) (العزاز)يش هاتووە بەبێ هەمزەو، (ياقوت)ى باسيكردوە كە بێ هەمزەش دەخوێنرێتەوەو شيعريش لەويارەوە هاتووە.

ئەویش پێی لەسەر ئەوە داگرت كە خۆشی وەكو بیرەوەرییەك بۆ باوكی تا دەگاتە شورەی شارەكە خۆشی لەگەڵیدا بڕواتو، دوای چاوكەوتنی بەم كچە بچوكە دڵی لێبوردنی فراوان بوو فەرمانیدا بە ئازادكردنی سەرجەم دیلەكانو چارەسەری بە برینداركاندا كە گەورە پیاوی دەڤەرەكەی تێدا بوو كاتێ گەڕانەوە باسیان لە پیاوەتیو مەردایەتی ئەو دەكردو، سەرباری ئەوەش دیاری بەسەردا دابەشكردن كە قەت چاوەڕێی ئەوەیان نەدەكرد.

ئەم هەڵوێستە پێویستی بە شاعیرو هەڵبەست هەیە وێنای بكاتو پێویستی بە دەرونزانێك هەیە شیبكاتەوە! ئەم پاڵەوانە لەو گەلەیە تووڕە بوو كە دژایەتییان كرد، بێئەوەی دەستدرێژیو دوژمنایەتی بخاتەڕوو، پاشان خەریك بوو لە هێكڕا بە لێدانێكی ستەمكارانە ئەگەر خودا منەتی بەسەردا نەكردبایەو نە پاراستبایە بیكوژن، بەڵام بەبرینێكی سوك رزگاری بوو، ئەم جۆرە كارانەش تووڕەیی تۆڵەسەندن دەوروژێت، بەڵام لەگەڵ دیتنی منداڵێكی بچوكی كچدا كە كچی سەرۆكە ئازیزەكەی بوو كتوپڕ ئەوەی لە ناخی قوڵیدا حەشاری داوە جوڵا كە سۆزو خۆشەویستیو ڕێزو ئەمەكداری پێ دەشڵەقا بۆ كەسێكی خوالێخۆشبووی ئازیز كە مامۆستاو نموونەی باڵای ئەوبوو، تەواوی ڕقی دامركایەوەو ڕووی گەشكردەوەو بزەی خستەسەر لێوەكانیو، ئەمە كچە بچوكەكەیەتی داخوازییەكی زۆر گەورەی ئاراستەكرد كە دەستهەڵگرتنی بوو لەم شارە، كەبێ والی بێنێتەوە! ئەویش بە خێرایی وەڵامی داخوازیەكی دایەوەو، نەیویست ئەو كچە خۆشەویستە بێ هیواو دەستخەڕۆ بگەڕێتەوە!! وای بە باشزانی وەكو ڕێزێ بۆ باوكی خۆشی تا شورەی (حەلەب) لەگەڵیدا بچێتەوە تا بێ ترس بگاتەوە شوێنی خۆی... ئایا بۆ مێژوونووس نیە بۆ وێناكردنی ئەو هەڵوێستە جوامێرییە جوانە پشت بە شاعیر ببەستێت.(١)

---

١) (زێوەر) دەڵێ: كورد میللەتێكی قەدیمە ساحیبی تەبعی سەلیمە شاهیدی ئەم مودەعایەیە لە (سەلاحەددینی سوڵتانە). (وەرگێڕ)

پاشان: ئایا دوای ئەم سەرکەوتنە ڕۆڵی (سەلاحەددین) ئاسانتربوو؟ خەمی زۆری لەسەر جیاوازیو ناکۆکییەك دەنگی مسولْمانانو جەنگی ناوخۆیی مسولْمانان بوو، ئەم خەمەشی هاوتەریبی مەراقەکانی بوو لەمەڕ داگیرکردنی قودس لە لایەن فەڕەنگەکانو هاوپەیمانەکانیان، باشترین چارەش بەلای خۆیو ڕاوێژکارانییەوە ئەوە بوو کە هەوڵ بدات میرنشینە مسولْمانەکان پێکەوە کۆ بکاتەوە و، لە یەکڕیزو ژێر یەك بەیداخدا دایان بنێتو لەژێر چاودێری خۆیدا بن، چونکە لاساری تاکە کاربەدەستێ دەبێتەوە هۆی ئەوەی هی تریش لاسایی بکەنەوە، بەلْکو دەبێتەهۆی هاوپەیمانیو گرێبەستی سەلبی لەگەڵ فەڕەنگییەکاندا!

(سەلاحەددین) پەی بەوە دەبرد کە گەورەترین دوژمنی لە جەنگدا لەگەڵ خاچ هەڵگرەکاندا ئەوانەن کە ئێستا بە (تابوری پێنج) ناسراون! کە بە ئاشکرایی گوێ لە مشتی سەرکردەی دلێرنو کەچی سیخوڕو چاودێرن بەسەر ئەو کەسانەوە لە دژیاندا ڕادەوەستنو، دیسان ئەوانە وەکو دوو ڕووەکانی مەدینەن لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ دا کە بەردەوام حەز لە ئاژاوەو ئاشوب دەکەنو تۆوی دووبەرەکی دەچێننو لەبەر چاوان سورن لەسەر یارمەتیدانو سەرخستنی ئیسلامو، لەکاتی جددییەتو هەوڵداندا دەبنە هۆکاری سستی نواندنو ناچوستیو، (سەلاحەددین) ناچاربوو ئاپوڕەیەکی زۆر بۆ بەرەو ڕوبونەوە کۆبکاتەوە. خوای گەورە ڕاستی فەرمووە لە ڕاست ئەوانەدا، نموونەی ئەوانە لە ڕۆژگاری (سەلاحەددین)دا، لە پاش ئەوانەدا وەکو ئەوانن: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ، لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَأً أَوْ مَغَارَاتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ﴾ (التوبة/ ٥٦-٥٧).

واتە: سوێند بە خودا دەخۆن کە ئەوانە بەشێکن لە ئێوەو، ئەوانەش لە ئێوە نین، بەڵکو ئەوانە دەستەیەکن زراویان دەچێت. ئەگەر پەناگایەك کونە ئەشکەوتێ یان کونو تونێلێ بدۆزنەوە بە پەلە بۆی دەچن. من دەڵێم: ئەوە پەرچدانەوەیەکی ئەو کەسانەیە کە لە نووسینی ژیاننامەی (سەلاحەددین)وا دەڵێن: ئەو خەمی

فراوانکردنی دەسەلاتو درێژکردنی هێزو توانا بووە لەسەر حیسابی دراوسێیەکانیو، تا ملی پێ کەچ نەکردن وازی لە شەڕکردن نەهێنا لەگەڵیاندا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر مێژوو بە چاوی بێلایەنی بخوێنرێتەوە دەردەکەوێ کە (سەلاحەددین) لەگەڵ هەموو مەیدانداریییەکدا دەستی بۆ ئاشتی درێژ کردووەو، داوای کردووە کە بێنە ژێر یەك لەشکرەوە لەژێر سەرکردایەتیکردنی ئەودا، هەر فەرمانڕەوایەکیش خاوەنی ولاتی خۆیەتی کە بە فرمانی ئەو لەناوخۆدا سەربەخۆ دەبێت، بەلام پەیمانیان شکاندو گوێیان بە شێنەییو هێمنی نەدا، ئەمەش (سەلاحەددین)ی ناچار کرد کە لەگەڵیاندا بجەنگیو بە یەقینێکی ڕاستگۆیانەو ڕاستی بەردەوام بوو لە ملکەچکردنیان[1]، (سەلاحەددین)[2] بەرەو (میسر) گەڕایەوە، دوای ئەوەی پەیمانو بەڵێنی لەوانە وەرگرت کە بە سەریاندا زاڵ بوو کە بەڵێنەکەیان پێشێل نەکەن، لە نێوان ئەوو فەرەنگدا ئاگربەستێ هەبوو پێی وابوو کە ڕێزی دەگیرێت، بەلام کە خەڵکەکە زانیان بۆ (میسر) گەڕاوەتەوە بە لەشکرێکی زۆرەوە بۆ شام کشان، بەلام لەبەر بەهێزی بەرهەڵستکاری نەیانتوانی (بەعلەبەك) داگیر بکەن، بۆیە بەرەو (دیمەشق) ڕۆیشتن تا توانی بەرەنگاری کرد، بەلام بەزوییو ملی خۆی کەچکرد کە

---

١) (ئارشاك سافراستیان) لە کتێبی (کوردو کوردستان/ و: ئەمین شوان/ ج٢ /٢٠٠٥ / ل٤٩)دا دەنوسێ (یەکەم پاڵەوانی مسوڵمانی مەزنە سوریاو عێراقی لە ژێر فەرمانی خۆیدا یەکخستو بەرە بەرە سەری بە ئەتا بەگی حەلەبو موسڵو دیاربەکرو چەند میری تری سەلجوقیو کوردو عەرەبیش دانەواند، بەم جۆرە ئەم سەری دەوڵەتەکەی لە دورگەی عەرەبەوە دەستی پێکردو کۆتایی لە ڕوباری دیجلەوە دەگەڕایەوە، نەك هەر ئەمە بەڵکو سوڵتانی سەلجوقیەکان لە (قونیە)ش ناچاربوو خۆی بکوتێتە ژێر باڵی ئەوەوە)).

مێژوونووس (ستیفاتسن) وەك لە (هممر/ ج٤، ص٢٠٧-٢٠٩)دا هاتووە (ئەمین زەکی بەگ) لە (مشاهیر الکرد وکردستان/ ل١٢٧دا/ ج٢ /٢٠٠٥ /السلیمانیە)دا گێڕاویەوە دەڵێ: {سەلاحەددین لە نەخشەی جەنگدا سەرکەوتوو بوو، لە هەڵسەنگاندنی توانای دوژمندا شارەزابوو، لە بڕیارداندا خێرابوو، لە پراکتیککردنی ئەو نەخشەیەدا هەستی بە مەلولیو ماتەمی نەکردووە، لە کارەساتەکاندا خۆڕاگربووە، متمانە بەخۆبونی زۆر بووە، کاتێ دەستبەکار دەبوو تا تەواوی نەکردبایە کۆڵی لێنەدەدا و، ئەو سیفەتو ئەوکارانە یارمەتیدەری بوون لەم جەنگە زۆرانەدا، هەتا ببێ بە گەواهیدەو لای خودا لە تێکۆشانیدا بۆ ئیسلام، لە ڕاسپاردەکەیدا دەڵێ: (تا لەگەڵ مندا زیندو بێتەوە لە قیامەتدا وەسیەت دەکەم شمشێرەکەم لەگەڵ خۆمدا بە خاك بسپێرن.} (وەرگێڕ)

٢) هەرچەند بە بڕوای من (ص) پیتەکی ئەلفبای کوردییەو وەکو دەڵێی (صەد) واتە (سەد) واچاکە ناوە عەرەبیەکان بە پیتی خۆیان بنوسرێنەوە. (وەرگێڕ)

هەواڵەكە بە (سەلاحەددین) گەیشت بێ خۆئامادەكردنی تەواو لـە (الرملـە)وە بـە پەلە بۆ (فەلەستین) چو، شای (قودس) بەو هێرشە بە پەلەیەی زانیو دەستیكرد بە كۆكردنەوەی هێزو توانایەكەی بۆ بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ (صلاح الدین)دا، ئەگـەر شەڕ بەم چەشنە تۆمار كرابایە ڕۆژێ بۆ تۆیەو ڕۆژێ لە دژی تۆیە، (سـەلاحەددین) لێرەدا دەشكاو ئەگەر خوا ڕزگاری نەكردبایە بـەدیل دەگـیرا، ئـەوەبوو نامـەی بـۆ (شمس الدين توران شا)ی بـرای نووسـیو دەڵـێ: (خەریكـە بـە فـەتارەت بـچینو، خوداوەند ئەگەر بۆ كارێكی مەبەستی خۆی نەبایە ڕزگاری نەدەكردین).

هەواڵەكە بە فەڕەنگەكان گەیشتەوەو هەوڵیان بۆ گـەمارۆدانی (حـارم)دا، شـا (سـالح) نـەیتوانی مقاوەمـە بكـاتو، بۆیـە مـاڵێكی زۆری پێـدان، تـا دەسـتی لێهـەڵبگرنو ئـەوانیش بـۆ ماوەیـێ دووركەوتنـەوە، كاتـێ (سـەلاحەددین) بـە دروستكردنی قەڵایەكی خاچ هەڵگری زانی لە نزیك بیابـانی (بـەهناس)دا لـەنزیك شوێنەك بە ناوی (منحاضة الاحزان)دا كە شوێنێكی قەدەغەبوو هەردوولا لەسەری ڕێك كەوتبوون، بەڵام گوێیان بە بەڵێنەكە نـەداو (سـەلاحەددین)یـش هەستی بـە مەترسیداری قەڵاتەكە دەكرد لـە بەدەسـتهێنانی سـەركەوتندا، بۆیـە دەسـتی بـە سـوپاوە دەگـرێو، ئازووقـەو تێـشووەی سـوپای چـەپاڵەداو مقاوەمـەو بـەرگری درێژوەكاتەوەو، ئارامی لەسەر ڕقەكە گرت.

خاوەن قەڵاكە بەناوی (بەلە دوێنێ چوارەم)[1] بەو كۆمەكیـە جەنگیـەی لـەلای دەسـتی دەكـەوت فریـوی خـواردو، بـە سـوپاكەیەوە پـەلاماری (دیمەشـق)یـدا، (سەلاحەددین)یش بەپەلە (فەڕڕوخ شا)ی برازای ناردەسەر بە سەرۆكی سوپایەك كە ڕاهێنراوو ئامادەباش بوون، خۆڕاگری كردو كۆڵی نەدا تا سەركەوت، خـەریك بـوو (بەلەد وین) خۆشی دەسگیرببێ، ئەگەر خۆی نەناس نەكردبایەو جلوبەرگی موڵكی (مەدەنی)و نەكردبایە بەریەوە، هەڵاتو رایكرد تا سوپایەكی تر كۆبكاتـەوە، كـە لەو شوێنەدا بەرەنگاری (سەلاحەددین) بێتەوە كە لەناویدا نیشتەجێ دەبێت.

---

١) (بەگدوین)و (بەردویل)یش هاتوە كە ناوی پێنج لە شایانی قوس پێك دێنێت. (المنجد في الاعلام) (وەرگێڕ)

ئەم پاڵەوانە دلێرە قەڵایەكەى (منحاضة الأحزان)ى تۆق كردو سووربوو لەسەر رووخاندنو بردنى دەسكەوتنى ناوى، ئەم كارەشى هێنایەدىو (بەلەدوین) بەلایەوە دژوار بوو لە قەڵاكە شاربەدەر بكرێو لە دەستى بڕوا، دواى ئەوەى ئەو هەموو ماندوبوونو شەكەتیەى لەسەر دیتووە، ئەنجا سوپایەكى كۆكردەوەو برادەرانى خۆى لە فەرمانڕەوایانى فەڕەنگى یارمەتییان داو لە (صفد)ەوە بۆ ئەردەن كەوتەڕێو لە (مرج العیون)دا بارگەیان خستو لەوێدا جەنگێكى گەرم قەوماو بەسەركەوتنى مسوڵمانان تەواو بوو، ئەوكەسانەى قازانجو زیانى جەنگەكان هەڵدەسەنگێنن دەڵێن: نرخو بەهاى ڕاستەقینەى ئەم جەنگە لەسەرەنجامەكەیدا نییە، بەڵكو لە بە دیلگرتنى فەرمانڕەواكانى گەورەى خاچ هەڵگرە، لەوانەش (ڕیمۆند)و شاى (تەڕابلوس)و، (بەلەدوین) پاشاى (ڕەملە)و، (حوج) شاى (تەبەرییە)!

خۆزگە دەمزانى كاتێ جەنگ بە گرتنى ئەو گەورانە كۆتایى دێو، بە شوێن ئەوانیشدا پەلامارى ترى شوێنكەوتوانى ئەوان هەیە، چۆن ئەمە شكۆیەكى گەورەى نابێ، نەخوازەڵا ئەوانە ناچار بوون كە بارمتەیەك بدەن كە نووسەرى (سەلاحەددین) نەیدەتوانى بیژمێرێ بە ماندوبوونێكى زۆر نەبوایە، جگە لەوەش بەدیلگرتنى ئەمانە دواى جەنگێكى سەختو لەناوبەر هاتووە، ئەى بۆچى هەوڵ دەدەین بەكەم سەیرى بكەین؟!.

ڕوخاندنى قەڵاى (منخاضة الاحزان)و بەزاندنى شوێنى (مرج العیون) هۆكارێك بوو بۆ ڕووخاندنى دەرونى لە ڕیزى سوپاى خاچ پەرستداو بەزیوەكان ئەوەیان بە چاك دەزانى ئاگربەستێكى تازە گرێبەست بكەن كە دووساڵ درێژبێتەوە! بەڵام شاى (تەڕابلوس) ڕازى نەبوو تەنیا بارمتەدانى بێ مەرج نەبێو، هەندێ كەس سەركۆنەیان دەكرد كە كەسێ ئازاد بكەن كە ئاگربەستەكە مۆرنەكات، ئەمەش هیچ كارزانىو داناییەكى تێدا نییە نەیاندەزانى كە (سەلاحەددین) چاك دڵى ئەوانەى خوێندۆتەوە كە پەیمانى ئەوانە تەنیا مرەكەبێكە بەسەر كاغەزەوە! شاى (تەڕابلوس) لەوانە ڕاستگۆترە، چونكە ڕوونتر باسیكردووە بێ فرتو فێڵو، ئەو بەڕێزترە لەوانەى پەیمان دەدەن وەدەشى شكێنن.

ئەم پاڵەوانە چووە ناو جەنگی لاوەکی لەگەڵ شای (ئەرمینیا)و (قەلیج ئەرسەلان)داو، سەرکەوتنی بەدەستهێناو، ئەمەش دەنگو دۆی لە تەواوی وڵاتی شامدا دایەوە، شای (موسڵ)و شای (جەزیرە)و، شای (ئەربیل) و[1] (کیفیا)و،

---

١) لە کتێبی (اربیل بین الماضي والحاضر/المهرجان السنوی الثالث/ ١٩٨٧/ ل٤٠)دا هاتووە: گەورەترین پەرەسەندن کە هەولێر لەچاخی دوای ئیسلامدا بەخۆوەی بینی دامەزرانی ئەم میرنشینانەبوو لە ناویدا.

١- میرنشینی هەزەبانی: کە تیرەیەکی کورد بوونو کۆچەرو ڕەوەند بوون و، کوێستانو گەرمێنیان دەکرد لە هاوینو زستانداو، هاوینان دەچوونە چیاکانو زستانان دەهاتنە ناو دەشتاییەکانی نێوان دوو زێیەکە. هەزەبانییەکان هەوڵیان دەدا کە دەسەڵاتی تەواویان بەسەر هەولێردا بشکێ بۆیە لەگەڵ خێڵی (حەمیدیە)دا کە تیرەیەکیتری کورد بوون هەر لە ناوەڕاستی سەدەی (١٠)ی زاینیدا لەگەڵیاندا کەوتنە کێشەوە. کوردی هازەبانیو دانا بە شێوەیەکی تایبەتی هەر لە سەدەی (١١ ز) لە هەولێر دەوروبەریدا نیشتەجێ بوونو گەورەکانی هەردوو تیرەکە لە هەرێمی هەولێردا قەڵای زۆریسان هەبووە، لەسەر دەسەڵات گرتن بەسەر هەولێردا بە داوا دەهاتن.

(ابن خلدون) باسی لەو کێشانە نەکردووە کە لە سنوری ئێوەی (١١ ز)دا ڕویانداوە. هەزەبانییەکان میرنشینیان لە قەڵای هەولێردا بنیاتناو، تەختی دەسەڵاتیان لەوێدا دانا، یەکێ لە فەرمانڕەواکانیان (عیسای کوڕی موسا) بوو، ئەنجا (سالاری موسا)و، پاشان ئەبو حەسەنی کوڕی موسەك (موسا) و، ئەبو عەلی کوڕی موسەك کە لە ڕوداوی (ساڵی ٤٤٠ك)دا ناویان هاتووە. بەڵام میر ئەبوهەیجای هەزەبانی (حەزەباتی) کە (حوسەین کوڕی حەسەن کوڕی موسا)یە لە سەردەمی سەلجوقیدا ناوی دەرکردو (ابن اثیر) لە (الکامل)دا، باسی ناوی ئەوو چالاکیو هاوپەیمانەتیو بەشداریەکانی ئەوی کردووە کە لەنێوان خەلیفەکانی عەباسیەکاندا ڕویانداوە، یان لە نێوان ئەوانو کاربەدەستانی موسڵدا لە ماوەکانی (٥٠٠ — ٥٢٠ ك)داو، بۆ زانین هەواڵەکانی دوای (٥٢٠ ك) دەپچڕێو، وا دیارە میرنشینەکەی دەکەوێتە جەنگ (عمادالدین زنکی) لە (٢٢ ك) کاتێ (عمادالدین) لە ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا هەولێر دەگرێت. لە دەشتایی هەولێر ئێستاش گوندەك ماوە بەناوی هەزەبان ناوی هەزەبانیەکانی پاراستووە کە بە گوندی (عازەبان) ناسراوەو لە هەزەبانەوە گۆڕاوە. لە پەندی کوردیدا نمونەیان پێ هاتووەو وتراوە: وەکو ئەسپی هەزەبانە.

٢ - میرنشینی بەکتینیە (٥٢٢-٦٣٠ ك): لە ساڵی (٥٢٢ ك) لەسەر دەستی (زین الدین عەلی کوچەك کوڕی بەکتین)دا دەمەزرێ کە یەکێکە لە سەرکردەکانی (عمادالدین زنکی) کە دامەزرێنەری دەوڵەتی (ئەتابەکە) لە موسڵداو، ئەتابەکە موسڵو شارەزوورو شوێنی تری وەبەرخۆداوە (زین الدین) لە (٥٦٣ ك)دا لە هەولێر دەمرێو دەنێژرێ، ئەنجا کوڕەکەی ئەبو سەعید کەوکەبری شوێنی دەگرێ کە دوای لاچونی لە پاش ماوەیەکی کەمی حوکمیدا برا بچوکەکەی جلەوی دەسەڵات دەگرێ بە ناوی (زین الدین یوسف) کە لە جەنگی خاچ پەرستیدا شانبەشانی (صلاح الدین ئەییوبی) دەجەنگێ. (یوسف) لە ساڵی (٥٨٦ ك)دا لە (فەلەستین)دا لە شاری (ناصرە)دا کۆچی دوایی دەکات و، لە هەمان ساڵدا (ئەبو سەعید کەوکەبری) ناسراوبە (شای گەورە: مظفر الدین) دەبێتە کاربەدەست کە زاوای (صلاح الدین) دەبێ و، یەکێکە لە بەشداربووە ناودارەکانی جەنگی خاچ پەرستی، بەتایبەتی لە جەنگی (حەتین)ی ناوداردا. لەسەردەمی ئەودا

سوڵتانی (قونییە)و شای (ئەرمینیا)و ئەوانی تریش هەموویان بە پەلە هاتنە ناو هاوپەیمانی ئەوەوە.

(د. احمد بیلی) دەڵێ: (لەو هاوپەیمانییەدا ئەو چەقە گەورە بایەخدارەی پێدەزانین کە (سەلاحەددین) پێیدەگات‌و دەسەڵاتەکەی پێی شاد دەبێ. لەکاتێکدا ناوی ئەو لەو ناوچانەدا بڵاوبۆوە کە دەکەونە نێوان (دەریای ڕەش)و (کەنداوی فارسی) خۆرهەڵات‌و (دەریای سپی ناوەڕاست لە خۆرئاوادا، وە ئەو هاوپەیمانییەتیانە بەڵگەیەکی ڕوونن لەسەر توانینی کۆکردنەوەی ئەو هەموو میرنشینییانەو هێنانیان بۆ جەنگ کردنێکی پیرۆز لەگەڵ فەرەنگدا.

دیسان بەردی بناغە بوو بۆ چەند جەنگێکیدا هاتووە لەگەڵ فەرەنگدا). لە جیهانی سیاسەتدا چاوەڕێی ئەوە ناکرێ کاروبارەکان لەسەریەك ڕێگا برۆن، چونکە تەماعە خۆییەکان وەلامدانەوەی هزری نین کە فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە دەکات، بەڵکو مل بۆ چەند هەڵچونێکی سۆزی‌و عاتیفی کەچ دەکەن کە کاریگەری زۆری بەسەر گرگنەکانەوە هەیە نەك بەسەر زەبەلاحەکانەوە! (سەلاحەددین) ڕۆڵەکی گرنگی بینی لە خەباتی داو دڵنیایی وەرگرت لەوەی ئەنجامی داوەو، دەستیکرد بە کۆچکردن بەرەو (میسر) کە زۆر لەمێژ بوو لێی نامۆو ئاوارە ببو، بەرەو (میسر) چوو بەو نیازە بوو کە بەو زوانە دەگەڕێتەوە.

---

میرنشینەکە گەشەی کرد لەمیانەی (٥٨٦ ك /١١٩٠ ز /٦٣٠ ك/ ١٢٣٢ ز)دا لەبواری ئاوەدانی‌و کۆڕو، خانەی هەتیوان‌و پەککەوتەو کوێرەکانی بنیاتناو، لە میرنشینیەکەیدا هەموو دام‌و دەزگایەکی تێدا بوو کە دەوڵەتی سەربەخۆ داخوازی دەکات. لەسەردەمی ئەو زۆر لە بێگانەکان لە هەولێردا نیشتەجێبوون و، بە گرنگترین شار دانراوە. (سوڵتان زۆر جەژنی سەرسوڕهێنەری دەگێڕا کە لە هەموو شوێنەکەوە سەردانکەران بۆی بێن، دیارترین یاد جەژنی لە دایکبونی پێغەمبەر ﷺ بووە کە زۆر بە فراوانی گێڕاویەو بازاڕی بازرگانی گرنگی لەگەڵدا بووە، دوای سوڵتان لە ساڵی (٦٣٠ ك)دا ئیمارەتەکەی دەکەوێتە وە چەنگی خەلیفەی عەبباسی (المستنصر) و، پاشان توشی لێشاوی (مەگۆل) دەبێت. لە ساڵی (٦٥٦ ك — ١٢٥٨ ز)دا مەگۆل قەلاکە دەگرن دوای ئەوەی (٦) مانگ مقاومە دەکەن. دوای داگیرکرانی لەلایەن مەگۆلەوە هەولێر لەڕوی زانست‌و ئاوادانیەوە کەوتە قۆناغی وەستان‌و دواکەوتنەوە). وە جەزیرەو موسڵیش زۆری میرنشینی کوردی تێدا سەرهەڵداوە وەکو لە پەڕاوەکانی مێژودا باسیان لێوە کراوە. (وەرگێڕ)

# چاکسازییەکانی ناوخۆ [١]

(سەلاحەددین) هەر سەرکردەیەکی جەنگی نەبوو، بەڵکو سەرکردەیەکی ئیداریو کارگێڕیش بوو، ئاگاداربوو بە هەموو یاوەرانی دەوڵەتو کەسانی شایستەو باش لە بلیمەتانی پیاو بۆ دیاری دەکرد، دوربین بوو لەگەڵ ئەو کەسانەی لە دەوریدا بوونو، زانیارییەکانی خۆی بە وردی هەڵدەسەنگاندو هەرکەسەی لە شوێنی شایستەی خۆیدا دادەنا، شانس یاوەری بوو کە لە ڕۆژگاری ئەودا دەستەپیاوەکی بەهێز هەبوون کە لەگەڵ دڵسۆزیدا، خۆڕاگر بوون لەسەر کارکردنو ئاسانترین ڕێگاکانیان هەڵدەبژارد بۆ وردبوونەوە، لەو پیاوە گەورەو ئیشکەرانەش قازی (فاضل) بوو لە بواری فێرکردنداو (حسام الدین لؤلؤ) بوو لە سەرکردایەتیکردنی کەشتیگەلو دروستکردنیانداو، (بهاء الدين قرقوش) بوو لە دروستکردنی شورەو پردی ئاویداو، غەیری ئەوانەش لە سەرکردەکانی دەوڵەتەکەی کە بە تەواوی نایان ناسین کە باشترین کەسی ئەو بوون لە خێزانەکەی[١]. وە لە

---

١) ئەم (فاضل)ە وەکو نووسەر لە دوایی دا باسی دەکات زانایایەکی عەرەب زمانە کە پشتگیری خوازی (صلاح الدین)ەو، لە فێرکردندا شانبەشانی شێخ عیسای هەکاری دەوری بینیوە. (محمد ئەمین زەکی) دەڵێ: (شێخ عیسی)ی هەکاری ناوی (ضیاء الدین عیسی کوڕی محمد)ە لە ئەمیرەکانی دەوڵەتی ئەییوبییە کە خاوەن شکۆو ڕێزێکی زۆر بووەو، یەکەمجار حوجرەی (الزجاجیە) لە (حەلەب)دا وانەی وتوەتەوەو پاشان پەیوەندی بە میر (اسدالدین شێرکۆ) مامی (صلاح الدین)ەوە کردووەو ڕابەری ئەو بووە. کاتێ چووەتە میسر لەگەڵیدا بووە، لە کاتێکدا شێرکۆ مرد (عیسی)ی هەکاریو (بهاء الدین قەرەقوش) لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە (صلاح الدین) لە شوێنی ئەودا دابنێن، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر زەحمەتیان کێشا.

کاتێ (صلاح الدین) هاتە سەر تەخت ئەم چاکەیەی لە یاد نەکردو پشتی پێ بەست، بۆ کاری خێرو چاکەی خەڵك زۆرجار ناوەندیار (واسطة)ی باش بوو، وەکو خۆی مایەوە تا لە (٩/ذو العقدة/ ٥٨٥) لە چادرەکەی (الخزوبە)دا مردو لە نزیك (عکا)داو بۆ (قودس) گوازرایەوە. (وفیات الاعیان / مشاهیر کرد وکردستان / محمد امین زەکی بەگ / ل: ٢٢٨

بواری فێرکردندا داراییەکی زۆری خەرجکرد بۆ دروستکردنی حوجرەو قوتابخانەو خانەقاو مزگەوت کە پڕ بوون لە حەلقەی وانەو دەرس، ئەگەر بە جەنگی وێرانکارانە سەرقاڵ نەبوایە بەهۆی زانایانی پایەبڵندەوە چاخی ئەو گەشەی دەکرد، وەکو سەردەمی ڕەشید مەئموون، بەڵام لەگەڵ ئەو ئەرکەشدا فەلسەفەیەکی تایبەتی هەبوو لەمەڕ فێرکردنداو، دوای نەمانی چاخی (فاتیمی) بە چاکی زانی فیقهی سوننی بڵاوبکاتەوە، بۆیە دەستیکرد بە دروستکردنی قوتابخانەو خوێندنگەی ئاینی بە فراوانترینو خێراترین شێوە، لە سەردەمی دەوڵەتی فاتیمیدا قوتابخانەکان فرەنەبوون لە (قاهیرە)و (ئەسکەندەرییەدا)، بەڵام لە چاخی (ئەییوبی)دا قوتابخانەکان بۆ دەرەوەش گوازرانەوە.

(مەقریزی) -١٤- قوتابخانەی ژمار دووە کە لە قاهیرەدا لە چاخی ئەودا هەبوون، خۆرهەڵاتناس (کریسویل) لە کتێبێکەیدا بە ناوی ئاوەدانکردنەوەی ئیسلامی لە میسردا باسێکی دوورودرێژی نووسیوە کە (سەلاحەددین) زۆر خولیای فیقهی سوننی بووەو، هەتا بەر لە ڕووخانی دەوڵەتی فاتیمیشدا. (دکتۆر ئەحمەد فکری) لە کتێبێکەیدا (مساجد القاهرة ومدارسها) لە (مەقریزی) ٣٠) بە هەندێ دەسکارییەوە دەگێڕێتەوە: (مەقریزی) گێڕایەوە - سەلاحەددین) لە ساڵی (٥٦٦ ك)دا کاتێ وەزیری (عاضد) بوو مزگەوتێکی لە تەك مزگەوتی عەمرۆ دروستکردو، یەکەمجار بە (الناصریه) ناونراو، ئەنجا گۆڕا بە (ابن زین النجار)و، ئەنجا بە (شریفیه)و بەناوی شافیعییەوە دەبێت، کە یەکەم قوتابخانە دەبێ وانەی سوننی تێدا دەخوێنرێو، قوتابخانەیەکی تریش بۆ مالکییەکان دەکاتەوە لە تەکدا مزگەوتی عەمرۆدا بە ناوی (قەمحی یە) چونکە دەغڵی زۆربووە کە ئەوقافەکەی داویەتی لە ساڵی (٥٧٠ ز)دا (قطب الدین خەسرەو) کە یەکێکە لە میرانی (سەلاحەددین) بە ناوی (القطبية) خوێندنگەیەکی لە (قاهیرە) بنیات ناو وەقفی مەلایانی شافعی کردو، لە هەمان ساڵدا بە ناوی دروستکەرەکەی خوێندنگەکەی (ابن الارسوفی) دروستکرا کە بە ناوی بازرگانەکانەکی (عەسقەلانی)یەوە بوو،

شوێنى ئەو قوتابخانەيە لە ميسر بوو لە (فسطاط)دا لە سالّى (٥٧٢ ك)دا (سەلاحەددين) قوتابخانەكى وەقفى مەلايەكانى حەنەفييەكان كرد، كە بەشێ لە خانوبەرەى (مأمون البطائحي) وەزير بوو بە قوتابخانەى (يوسيفيية) ناسرا، چونكە بازاڕى يوسيفييەكان ئەوكاتە لەسەر دەرگاكەيەوە بوو، ئەم قوتابخانەيە بە يەكەم قوتابخانەيە لە (ميسر)دا بۆ حەنەفييەت تەرخان بكرێت.

خاوەنى كتێبى (مساجد القاهرة و مساجدها) وەكو ڕابرد ئاماژە بۆ ناوى قوتابخانەى تر دەكات وەكو (خەبوشانى)و (تەقوييە) كە ئاماژە دەكات بۆ بايەخدانى (شاناصر) بە بزاڤى فێركردنى گەورە كە ڕوبەرێكى فراوانى ميسر دابپۆشێت، ديسان ئەوە دەردەخات كە گەورەپياوان لە فەرمانڕەواو بازرگانەكان لەبەر خۆشەويستى زانستى بێ يان بۆ نزيكبوونەوەبێ لە دەسەلاتدا بەشدارييان لەو چالاكييە فێركردنەدا كردووە. قازى (فاضل)ى فەقيهو زاناو ئەديب لە بەرامبەر (سەلاحەددين) گەورەترين چاكەى هەبوو، دەستيكرد بە حوجرەيێ لەتەك مالّى خۆيدا كە لە شێوەى خۆيدا وێنەى نەبوو، لەبەر ئەوەى بۆ خوێندنى فيقهى مالكىو شافعى بوو پێكەوە، بەلاّم هەموو قوتابخانەكانى تر كە باسيانكرا سەربەخۆ بۆ يەك مەزهەب تەرخانكراون.

قازى ناوبراو لەگەلّ ئەو قوتابخانە فراوانەدا كە چەند لقێكى لێدەبۆوەو كۆمەلّە كتێبێكى دەگمەنو زۆريشى لەمەڕ هەمو زانستەكان بەخشى، كە وتراوە خۆى لە (١٠٠ ،٠٠٠) بەرگ داوە! قورئانێكى گەورەى لەناو دابوو كە بە خەتى (كوفى) نووسرابۆوەو خەلّكى بە (مصحف عثمان) ناويان دەبردو، لە شوێنێكى تايبەتدا لەتەك ميحرابدا لەناو بازنەكى شوشەييدا دانرابوو، خەلّكى بۆ موتفەڕك سەيريان دەكرد.

هەركەس توانيبايە بەرپەرسەكە قايل بكات ماوەيەكى كەم بيخوێنێتەوە بە دەسكەوتێكى گەورەى دەزانى بۆ خۆىو شانازى بەوەوە دەكرد كە لە قورئانى (عثمان)دا قورئانى خوێندۆتەوە.

قوتابخانـەی قـازی (فاضـل) بـە (الفاضـلیة) دەناسـرێو دەدرێتـە پـاڵ خـۆی، قوتابخانەکە (١٠٠) هەزار بەرگی زانستی لەناودابوو، تا ئەوە نیشان بدات کە ئـەو نووسراوانە سامانێکی زانستین کە لەناویاندا دانراوە. دیسان ئەوە دەردەخـات ئـەو قسەیەی لەمەڕ سوتاندنی نووسـراوەکانی خەلیفـەکان لەلایـەن (سـەلاحەددین)ەوە وتراوە زیادەڕەوی تێدا کراوە، ئەگەر وابایە ئـەو کتێبخانانـەی تایبـەت بـوون بـە خەلیفەکان سوتێنرابن چۆن قوتابخانـەی (فاضـل) بـە تـەنیا (١٠٠) هـەزار بـەرگ دەگرێتەوە خۆیەوە! کەچی لەو سەردەمەی گوایە کتێبەکانی تێدا سـوتێنراوە نزیـك بـووە، ئـەوەش ئاسـاییە کـە هـەر قوتابخانەیـەك بـەرگی تـری هـەبوبێ، ئەگـەر نەگەیشتبنە ئاستی قوتابخانەی قازیش کە زۆر قسەی ناڕاستی لەبارەوە دەگوترێت.

مامۆستا (محمد فرید ابو حدید)[1] دەڵێ: هەڵەیە گـەر وابـزانین (سـەلاحەددین) قوتابخانەی بە مانای نوێی هێنایەدی، چـونکە تـەنیا کتێبـی ئـاینی تێـدا بـووە، هەرچی زانستی پیشەسازیو هیتر بوو لە زانستی ماددی کەرەستەیی وابەستە بـە ژیانەوە لە قوتابخانەو حوجرانەدا بێ بایەخ بـوونو، ئەمـەش (سـەلاحەددین)ی پـێ لەکەدار ناکرێ، چونکە لـەو چـاخانەدا لـە هـەموو شـوێنەکدا فێرگـە ڕەسمیـەکان تایبەت بـوون بـە زانسـتە ئاینییەکانـەوە، بـەڵام ڕوونکردنـەوەی زانسـتیتر لـە چاخەکانی دوای ئەودا زانراوە، ئەمەش واتای ئەوە نیە ئەو چـاخانە گـەورە پیـاوی نەناسیوە لە نوشداریو پزیشکیو ئەندازەو جەبرو زانستەکانی تـر، بـەڵکو مانـای وایە کە خوێندنی ئەو زانـستانە تـەنیا چـەند مامۆسـتایەکی هـەبووە کـە چـەند قوتابییەکی زیرەك نەبێ قوتابی زیاتری نـەبووە کـە زانـستی ئـەو هەڵبگرێتـەوە. لەگەڵ ئەوەشدا (سەلاحەددین) نەخۆشـخانەو بیمارسـتانی بنیاتنـاوەو نـاودارترین پزیشکی تێدا داناونو خەرجی فروانکردنیو ئامادەکردنی ئامێرەکـانی چـارەکردنی کێشاوەو کە ئەوە دەردەخات مەسەلەکانی پزیشکیو دەرمانگەری (الصیدلیە) ئەو لێکدانەوە وردەی دەوێ بـۆ هەڵـسەنگاندنی چارەسـەری لای مامۆسـتا گـەورەکان

---

١) صلاح الدین الایوبی، الاستاذ ابی حدید (ل: ١٢٦/ دوای ئەوە).

شوێنی ڕۆچوون‌و تێگەیشتن بووە، بەڵام لە قوتابخانەکەیدا دانە نیشتوون کە ڕێزی تێدا ببەسترێت! توێژینەوەی بابەتە فیقهییەکان لە مەزهەبە جیاجیاکاندا هۆشێکی ئیسلامی گەورەی دروستکرد لەمەڕ یاسادا کە لە ئەوروپادا هاوشێوەی نەبووە، چونکە فەقیهەکان لە قوتابخانەکانیاندا تەنیا هەر مەسەلە خواپەرستییەکانی وەکو دەستنوێژو پاکژی‌و نوێژو زەکات‌و ڕۆژو حەج ناخوێنن، بەڵکو مەسەلەکانی سەوداو کڕین‌و فرۆشتنیش دەخوێنن وەکو مامەڵەو ڕەهن (بارمتە)و حیجر[1] (قەدەغەکردن)و شوفعەو سودو پەشیمان بوونەوە (الخیار)و کشتیاری (الزراعة)و بەکرێدان (الاجارة)و مەسەلەکانی باری کەسێتی (الاحوال الشخصیة) وەك ژنخوازی‌و تەڵاق (دەست لێکبەردان)و میرات‌و مەسەلەکانی سزادانی تایبەتی بە (کوشتن‌و چەتەیی‌و ڕێگری‌و زیناو دزی‌و مەی خواردنەوە، وە شارەزایی کردنی فەقێ‌و قوتابی بە یاسا دینییەکان لە هەموو بەشەکانیدا چاوگەیەکی ڕوناککردنەوە بوو، وەجیاکردنەوەی ڕەواو ناڕەوا ئەوانە ڕۆشەنبیرییەکی نایاب بوون شوێنەواری دوورو قوڵی خۆیان هەیە[1].

دەچینە سەر مەسەلەی ئاوەدانکردنەوەو بیناسازی، نەخوازەڵا لە (میسر)دا کە (سەلاحەددین) زۆر بایەخی پێدا بەشێکی زۆری لە ئەرکی ئەو گرتووە، چونکە لەناوەڕۆکدا سەردەکێشی بۆ پاراستنی (میسر) لە هێرش‌و پەلامارەکانی خاچ پەرستی‌و یەکەم شت کە کردی بە خەمی خۆی دروستکردنەوەی شورەی (قاهیرە) بوو کە (جەوهەر سیقلی) لە خشت دروستی کردبوو، ئەمەش لەکاتێکدا لە (قاهیرە)دا دەست بەکاربووە، پاشان کۆنی بەسەردا هات‌و (بدر الدین الجمالی) ناچار بوو جارێکی تر لە خشت دروستی بکاتەوە، کاتێ سەردەمی (ئەییوبی) هات

١) (حیجر) - وەلانان/ دەسەڵات بەندی/ ڕەفتابەندی، (شوفعە- لێك کڕینەوە)و، (خیار: سەربەستی)و: معاملە: مامەڵە. {فەرهەنگۆکی یاساپارێزی/ پارێزەر: احمد عبدالله خدر/ ج٢ /٢٠٠٣/ هەولێر. (وەرگێڕ)

١) ئەم ئاوەدانکرنەوەیە لە زانست‌و بیناسازیدا هەموو ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی (صلاح الدین)ی گرتبۆوە، بۆ نموونە لە هەولێردا (سوڵتان: مظفرالدین) بەم ئەرکە گرنگە هەڵساوە. قوتابخانەو نەخۆشخانەو هەتیوخانەو مزگەوت‌و دام‌و دەزگای تر کە ڕابردوو ئاماژەمان پێیکردووە دروستکردووە. (وەرگێڕ)

(سەلاحەددین) پەی بە گرنگی ئەم شورەو پەرژینە برد بۆ پارێزگاریکردن لە پایتەخت، کاتێ بینی کەللەبەرد کونی تێدا پەیدا بووە کە سوپا دەتوانێ بە ناویدا دزە بکاتو ئامێری قورسیش لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێ، ئەوکاتە پەیوەندی نێوان (الفسطاط)و (القاهیرة) بچڕا بوو، (سەلاحەددین) نیازی وابوو پایتەختی کۆنو نوێ پێکەوە گرێ بداتەوە، تا ئەو مەیدانە فراوانەی نێوانیان بە جۆرەها ئامێری ئاوەدانکردنەوە پڕ بکاتەوە، لێرەدا بۆ دوو مەبەستی گەورەی دەڕوات: یەکەمین: قایمکردنی پایتەخت لە بەرامبەر پەلامارە ئەگەرەکانی خاچ پەرستەکانو، دووەم: دروستکردنی قەڵایەك بوو لەناو ئەو شورایەدا کە سوڵتانو سوپا لەکاتی مەترسیدا بپارێزێ، کاتێ شۆڕشی ناوخۆ بەهۆی یاخیبوون سەرهەڵدەدات. قەڵا دروستکردن لای میسرییەکان زانراونە بووە، بەڵام لە شامدا بڵاوبووە کە یارمەتی پاراستنی ئەو کەسانەی دەدا پەنایان دەبردەبەر،[1] مسوڵمانان بان یان خاچ پەرست بان دیسان بە شێوەیێ دەکرا کە دەوری قەڵاکە بە بازاڕەوە کاروباری بازرگانی ئاوەدان بکرێتەوە، ئەوکەسەی بە ئەنجامدانی بنیاتنانی ئەو شورەو قەڵایە هەڵسا میرێکی ناودار بوو بە ناوی (بهاءالدین قرقوش)ی ئەسەدییە[2]، ئەو پیاوە ئیشکەرێکی بەتوانا بوو بەیانیو ئێواران کاری دەکرد وەك بڵێی ئاسن بێ نەك گۆشتو خوێن، لەگەڵ یارمەتیدەرانی خۆیدا زۆر بە زەبرو زەنگو زبر بوو، زۆری شەکەت دەکردن، تا لەسەر توندوتیژی ئەودا نموونە دەهێنرێتەوە لەناو خەڵکداو دەڵێن: (حوکمی قەرەقوش) کەلای خەڵکی بۆ زوڵمو ستەم نموونەی پێدەهێنرێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئاوا نیە، چونکە جیاوازی دیار هەیە لە نێوان ستەمدا کە مافی خەڵکی

---

١) قەڵای دێرینی هەولێر بۆ نموونە کە تەنیا خوا مێژووی کۆنیەکەی دەزانێ، لە کاتی پەلاماری تەتەرو مەگۆلدا توانیان (٦) مانگ لە ناو قەڵاکاندا بەرگری بکەن، لە (١٢٥٨ ز)دا. ئەمەش ڕۆڵی گرنگی قەڵا دەبینی لە دێرینیدا بۆ بە ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ هێرش بەراندا.

٢) (قەرەقوش) وەکو لە (المنجد فی الاعلام)دا هاتووە: لە بنەچەدا ڕۆمی یەو، کوڕی (عبداللە)ی ئەسەدییە (مردن: ٥٧٩ ك/ ١٢٠١ ز)و، لەخزمەت (صلاح الدین)دا گەورەبووەو لە میسر دا جێگری بووەو، شورەی قاهیرەو قەڵاکەیو پردی جیزەو، شورەی عەکای بنیات ناوەو، (صلاح الدین) لە دیلی فەرەنگی دەیکڕێتەوە. (وەرگێڕ)

زەوتدەكاتو نێوان جددييەتو دڵسۆزى كە بۆ كاركردنێكى تێكۆشەرانە هانت دەدات.

نكوڵى لەوە ناكەم كە (مير قەرەقوش) پێويستى بە سۆزى وەك (سەلاحەددين) هەيە تا ئەو كەسانەى لەبەر دەستيدا كاردەكەن پشويان پێ بدات، ڕەنگە بينى بێ كە زۆربەى كرێكارەكان خاچ هەڵگرن كە ژمارەيان (٦٠) هەزار بووە، بۆيە ويستويەتى بەدرێژايى ڕۆژ كاريان پێ بكات، ئەمەش دروست نييە، چونكە (ديل) لە ئيسلامدا بەشى خۆى هەيە لە پشوودانو ئاسايشو، باشترين مامەڵەكردن لەگەڵياندا.

(قەرەقوش) لە ماوەى (٦)ساڵدا كە كارى نەپساوەى تێدا كردو، شەوو ڕۆژ پشتى ڕاست نەدەكردەوە، كە تەواوى كرد تا لە شەودا چرايەكان لەسەر شورەكاندا دەبينرا هەڵكرا بوون، تا كرێكاران ڕێگاى پێ ببينن‌و، بۆ ئامادەكردنى ئەم كارە گەورەيە لەو ماوە كورتەيدا قەرەقوش فەرمانى بە ڕووخاندنى زۆر قوچەكى‌و هەرەمى بچوكدا لە (الجيزة)دا كە لە بيناكانى (عامرە)وە بۆ شورەكە دەچوون كە خانوبەرەو مزگەوتو گۆمەزو گۆڕستانى لێ بوون.

(سەلاحەددين) پياوەتى لەوەدا هەيە كە (قاهيرە)ى كردە پەناگا بۆ خەڵكى ناوخۆى‌و گشتى‌و تايبەتى كوڕەكانى وڵات، چونكە كاربەدەستانى ئەوبەر لە ئەوە خانوبەرەيان سەربەخۆ دروستدەكرد كە بە لەشكرگەو سەربازگە ناسرابووەو، پاسەوانەكان نەبێ بۆيان نەبووە لەو پايتەختە نوێياندا نيشتەجێ بن‌و ئۆردو هەڵبدەن.

لە سەردەمى (سەلاحەددين)دا قەڵاكە بەشێوەى كۆتايى تەواو نەبوو، بەڵكو لە سەردەمى (كامل)دا تەواو بوو، كردنى بەبارەگاى دەسەڵاتى خۆى، نەك هەر قەڵا شوێنى بايەخى (سەلاحەددين) بوو، بەڵكو دەستورى بە (قەرەقوش)دا كە چەند پردو جسرێك لە (جيزە)دا لەسەر ڕووبارى (نيل) دروست بكات، كاتێ دروستيكرد

وەکو چیایەك بوو کە بەسەر ئاوا ڕاکشا بێت، چونکە تاویرەکانی ئەهرامەکان[1] کەرەستەی ئەو پردانە بوون، ئنجا قەڵاکەی لە باکوری (قاهیرە) دروستکرد، پاشان لە (مەقس)دا کە بۆ ماقس دەگەڕێتەوە واتە: باج و سەرانەی هێناوە — ئەم قەڵایە فراوانەو بەرز بوو، بە شێوەیێ بوو بە قەڵایەکی ترو خەڵکی ئاسایی پێیان وتووە (قەڵای قەرەقوش)و، قەڵاکەی تر بە (قەڵای سەلاحەددین) ناونراوە. (قاهیرە) بەتەنیا شوێنی بایەخپێدانی شا (ناصر) نەبووە، بەڵکو سەری کێشاوە بۆ (بەندەرەکان) کە کەشتی دوژمنانی بۆ ڕەوانە کراوەو لەکاتی گەمارۆدرانیدا لە (ئیسکەندەرونە)دا لە جاری یەکەمدا هەستی بە نرخی قایمکردنی بەندەرەکان کرد، وە لەکاتی پەلاماری خاچ پەرستاندا بۆ سەر (دمیاط)، ئەنجامی بەدەستهێنانی وەزارەت — پاش ئەسەدەدین— بۆ ئەو بوو، (دمیاط) لە سەردەمی (فاتیمیەکان)دا خانەی دروستکردنی کەشتی جەنگ بووە، هەر لەوکاتەوە تا ئیمڕۆش بەوە ناسراون کە لە پیشەسازیدا باش بوونو خەڵکەکەی لە باشترین پیشەسازیدا کارمەندنو، (سەلاحەددین) دوای وەرگرتنی پۆستی دەسەڵاتی، گورج بەرەو ئەوێ ڕۆیشتو بە زنجیری ئاسنینی پارێزەر ئامادەی کردو تۆقی دا، ئەو زنجیرانەش بوون پێشیان بە

---

١) ئەهرامەکان بەشێکن لە کارە سەرسوڕهێنەرەکانی مێژو لە میسرداو لە سەیری دا هیچی لەو مۆمیا کەمتر نیە کە بۆ هەڵگرتنی لاشەی فیرعەونەکان بەکاریان هێناوە. (ئەهرامەکان لە میسردا بێ چیمەنتۆو گەچ وقسڵ پێکەوە بەستراونەتەوە، بەڵام چۆنو لە کوێیە هاتونو هێنراون؟ لەکاتێکدا دەبینی کێشی یەك تاوێر (١٥ — ١٠٠) تەن دەبێ. پاشان با سەیری (بەعلەبەك) بکەین تاوێرە سێ لەسەر چوار ملیۆن کگمو درێژی (٢٥ م) پانیو بەرزایی (٥ م)، چۆن ئەم پارچە تاوێروتاشەبەردەیە بڕاوەو هەموار کراوە؟ سەیرتر لەوەش ئەو تاوێرانە لە جۆری ئەو بەردانە نین کە لە ناوچەکەدا هەیە}! قورئانی مەزن لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ﴾(الفجر-١٠) مامۆستای خاڵ لە (تفسیرە)کەیدا (الاوتاد)ی بە ئەهرەمەکان لێکداوەتەوە. وە لاشەی فیرعەونی سەردەمی موسا (علیه السلام) لە یەکێ لەناو ئەهرامەکاندا دۆزرایەوەو، مانای ئەم موعجیزە قورئانیە هاتەدی کە دەفەرموێ: ﴿فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ ....﴾ (یونس- ٩٢). کە مێژوی بۆ (٦) هەزار ساڵ دەگەڕایەوە. {غرباء وخارقون ودخلاء/ فرید مجید/ ل ١٣٧) حقائق القرآن والعلم الحدیث/ عامر تحسین/ ل: ٣٧ /١٩٨٦ /موصل). (تفسیر خال جزمی سێهەم/ج٣ / ١٩٨٦)، سەیر بکە. (وەرگێڕ)

سوپای هێرشبەرگرت کە نەتوانن سنوری شارەکە ببەزێنن، ئەوکاتە زنجیرەکە بە قەڵاتی گەورەوە قایمکرابون کە لە بەردی ئەستێ (الصوان)و سفت دروستکرابوون، تا بتوانن بەرگەی ئەو زنجیرانە بگرنو کارانێکە لەسەر لاوازکردنی ئەم زنجیرانە بێ توانابوونو، ئەنجا هەوڵدرا بۆ توندکردنەوەیانو، قەت لە زنجیرەو کۆتی (دمیاط) بێ ئاگانە دەبوو، کاتێ دەیبینی خەریکە بڕوخێ چاکی دەکردەوە، تا شار لە هێرشی لە هێکڕا بپارێزن، هەموو ئەمەش ئەرکەکی جەستەیىو ماڵی زۆری دەویست، شا (ناصر) نەیدەویست ڕژدی لەو دۆستانەدا بکات، چونکە ئامێری بەرگریکردن لە بیرکردنەوەی ساغی ئەودا لە ڕیزی پێشەوەدا دادەنرا.

بەڵام (ئیسکەندەرییە) گرنگییەکی پتری لەلایەن ئەم پاڵەوانەوە پێدراو، فەرمانیدا بە چەقاندنی زیاتر لە (٤٠٠) ستونی ڕۆمانی زەبەلاح لە دەوری (دەریای سپی ناوەڕاست)دا لەناو ئاودا، تا ببن بە کۆسپو تەگەرە لەبەردەم کەشتی پەلاماردەرەکانداو، دوژمن نەتوانن بچنە ڕۆخ دەریاوە[1]، ئەنجا چوو شورەی شارەکەی نۆژەنکردەوەو چاڵی لە دەوردا هەڵکەندو هەربەوە نەوەستا کە (قەرەقۆش) ئەم کارە بگرێتە ئەستۆ، بەڵکو خۆیشی لە (قاهیرە)وە چوو بۆ ئیسکەندەرییە تا ئەویش بە شارەزایی خۆی چاودێری جێبەجێکردنەکەی بکات، تا لە ((دمیاط)یش دا بەم کارە هەڵساو ماوەکی زۆرخۆی چاودێری کرد، تەنیا لە (دمیاط)دا (ملیۆن) دیناری خەرج کرد، بەڵام خەرجی ئەسکەندرونە پتر بوو، شورەکەی خراپ ببوو، چاککردنەوەو قایمکردنەوەی خەرجی زۆری دەویست.

---

١) لێرەدا بۆ زانین: (ئیسکەندەرونە) هەیە کە شارەکە لە سوریا دەکەوێتە سەر کەنداوی ئیسکەندەرونە. (ئیسکەندەرییە) هەیە کە شارێکی میسریە و، بەندەرێکە لەسەر دەریای ناوەڕاستو بەهۆی زانکۆکەی مەڵبەندێکی بازرگانیو ڕۆشنبیرییەوە یەکەمجار ئەسکەندەری گەورە لە (٣٣٢ پ. ز)دا دروستی کردووە. وە (ئیسکەندەر)ی ئیتالیش هەیە کە شارێکی ئیتالییە لە بەیمونتەو، ناوچەکی کشتوکاڵیو پیشەسازییە. (المنجد في الاعلام/ بە کورتکردنەوە). وە لە سەرنەخشەی کوردستانیدا ئیسکەندەرونە بەشێکە لە کوردستان. (وەرگێڕ)

بە دووربینی هۆشمەندانەی خۆی لە جەنگدا بەرەو (نیمچە دورگەی سینا) کەوتەڕێو، لەوێشدا چەند مەڵبەندێکی پاسەوانیو زێرەڤانی دروستکردو، ئەمەش ئەرکێکی زۆری ویست، چونکە ناوچەکە بیابان بوو (میسر)و (فەرەنگ)ەکانی ناو (بیت المقدس)ی لێك جیادەکردەوەو، لەو ڕێگایەوە لەشکری فەرەنگی هێرشی دەهێنا، بۆیە پێویستی بە قەڵای زەبەلاح هەیە بیپارێزێو ئەم کارەشی ئەنجام داو ترسی خستە ناو خاچ هەڵگرەکانەوە!!

لێرەدا حەز ناکەم لەم شوێنەدا لەوەی باسمکرد لە خەباتی (قەرەقوش) هیچی تر باس نەکەمو خۆی لێبێدەنگ بکەم، چونکە خەڵکی ئاسایی خۆمان لە مەسەلەی ستەمکاریدا نموونەی پێدێننەوە، وەك ڕابردوو ئاماژەمان پێیکردو، ئەم چەند قسەیەی (ابن خلكان)[1] بەسیەتی کە لە ویژدانی خۆیەوە لەبارەیەوە وتویەتی: (کاتێ سەلاحەددین) جڵەوی کۆشکی لە (میسر)دا سەربەخۆ بەدەستەوە گرت، ماوەیێ لە میسردا جێگرییەتی ئەوی وەرگرتو کارەکانی بەو سپاردو لە بەڕێوەبردنی کارەکانی پشتی پێ بەست، ئەو پیاوە، بەڕێزو شکۆداربوو، ئەوبوو کە شورەی دەوری (قاهیرە)و (میسر)و نێوانی ئەوانی دروستکردو، قەڵای چیای (الجبل)ی دروستکردو پردی (جیزە)ی سەر ڕێگای (ئەهرام)ەکانی هەڵبەست کە شوێنەواری پایەداری ئەو بەڕێزەیان پێوە دیارە، لە (المقس)دا (رباط)ی ئاوەدانکردەوەو لە (القاهیرە)دا (خان سبیل) لە (باب الفتوح)دا لە بەرزی قاهیرەدا ئاوەدانکردەوە، وەقفی زۆریشی هەبوو کە خەرجیەکەیان زانراو نییە، ئەو نیازو مەبەستێکی خاوێنی هەبوو، مافەکی زۆری بەسەر سوڵتانو مسوڵمانەوە هەیە، خەڵکی زۆر حوکمی سەیری دەدەنەپاڵ لەکاتی دەسەڵاتیدا، هەتا (اسعد بن مماتی)

١) (ابن خلكان): دوو برا بەم ناوەوە هەیە، ناودارتریان قازی قازیەکان (شمس الدین ئەبول عەبباس ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبو بەکری کوڕی خەلەکانی هەولێرییە کە شافعی مەزهەب بووەو زانایەکە لە زانا ناودارەکان و، لە (ام المؤید النیسابوریة)دا دەڵێ: (ئەو لە ١١/ مانگی ڕەبیعی دووەمی/ساڵی ٦٠٨ لە هەولێردا لە قوتابخانەی سوڵتان (مظفر الدین) کوڕی (زین الدین) لەدایك بووە لەوێدا خوێندویەتیو باوکی لەوێ وانەی وتووەتەوە، تا لە (٦١٠) کۆچی دوایی کردووە.

بەشێکی هەیە لەوبارەوە ناوی ناوە (القاقوش فی احکام قرەقوش)[١] زۆر شتی تێدایە کە لەوی بە دوور دەزانیّو [٢] ئاشکرایە کە هەڵبستراوە، (سەلاحەددین) لەکاتی دەسەڵاتیدا پشتی پێ بەستووە، ئەگەر متمانەو بڕوای بە زانستی ئەونەبا کارەکانی پێ نەدەسپارد). بایەخدان بە ئامادەکردنی کەشتیگەلی (الاسطول) دەریایی جێگای خەمخۆری (سەلاحەددین) بوو، کە سەرقاڵی کردبوو، لەکاتێکدا فەرمانیدا بە ئامادەکردنی کەشتی جەنگی تەواو بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی دوژمن کە دەیەوێ بە توانای زۆرییەوە لەو بوارەدا دەستدرێژی بکات، (میسر)یەکان لە چاخی (فاتیمی)یەکاندا کەشتیگەلیان هەبووە کە ڕۆڵی جەنگی خۆیان بە سەرکەوتنەوە بینیوە، پاشان دووچاری کارەساتێکی گەورە هاتون، ئەمەش نەك لەلایەن دوژمنانەوە، بەڵکو لەلایەن وەزیری میسرییەوە کە لەکاتێکدا بووە (شاور) لەوە دەترسا شای (بیت المقدس) بە ناوی (ئەموری)یەوە دەستیان بەسەردا بگرێت، ئەو لە جیاتی ئەوەی کاربۆ بەهێزکردنو گەشەکردنیان بکات، هات بەشێکی گەورەی لێ سوتاندن، (عەبید)ەکان هاتن ئەوەی مابۆوە لە سوتاوەکانی بەتاڵانیان برد، بەو چەشنەیە (الفسطاط) جارێکی تر دەسوتێتەوەو، دیسانەوە لەسەر دەستی (شاور) کەشتییەگەلەکە دەسوتێنرێتەوە!

کاتێ (ئیسکەندەرییە) لە سەردەمی (سەلاحەددین)دا تۆقکرا، سەیری کرد کە بوونی کەشتیگەل زۆر پێویستە، نەك هەر بۆ پاراستنی (ئیسکەندەرییە)، بەڵکو بۆ پەلاماردانی دوژمنانیشی لە بەندەرەکانی شامدا، بە (حسام الدین لؤلؤ)ی فەرماندا کە بەئەرکی ئامادەکردنی کەشتییەگەل هەڵبستێ بۆ جەنگکردن، هەرچی

---

١) (ابن شداد) لەمەڕ قەرەقوش دەڵێ: (لە ٣ ڕەبیعی یەکەمدا (یەزەك) هی تاڵقەی سوڵتانی بوو، خەڵکەکی زۆر لە دوژمن پەلاماریداو، ڕوداوێکی گەورە لەنێوانیاندا قەوما کە زۆر کوژرانو پیاوێکی گەورەشیان وەکو باسکراوە لێکوژرا. بەڵام لە مسوڵمانان تەنیا خزمەتکارێکی سوڵتان کوژرا بەناوی قەراقوش کە زۆر ئازا بوو، ڕوداوو داستانی گەورەی هەیەو لەو ڕۆژەدا شەهید بوو -خوا لێی ڕازی بێ-} (نوادر السلطانیة / ل: ٢٦٩) (وەرگێڕ)

٢) کورد لە کۆنەوە بە حوکمە ستەمکارەکانی وتووە: ئەوە حوکمی قەرەقوشە.

پێویستییەتی لە داروباری وڵاتو کەرەستەی دروستکردنی ئامێری جەنگی بە دەستیەوە بگرێ، دیسان سۆراخی ئەوانەی کرد کە کارامەن لە دروستکردندا لە دەوڵەتداو خستنییەژێر فەرمانی (حسام الدین)ەوەو چەند کەرتێکی تایبەتیو سەرچاوەکی کشتوکاڵی بۆ ئەوکەشتیگەلە تەرخانکرد کە داهاتەکەی بۆ نۆژەنکردنەوەیو دروستکردنەوەی ئەوبێت.

دەسەڵاتێکی تایبەتی لەناو پیاوانی دەوڵەتدا بە (حسام الدین) سپارد، بە شێوەیێ کە هەر قسەیەکی لە دەمی بێتە دەرەوە ڕەتکرانەوەی نییەو دەبێ داخوازییەکەی ئەنجام بدرێت، (حسام الدین) زۆر بایەخی بە ئەرکی خۆی داو بەردەوام لەسەر کارەکەی پێداگرتو بوو، تا کەشتییەگەلەکە لە ژمارەیاندا گەیشتنە ئاستی تۆقین بخاتە دڵی دوژمنانەوەو، سەرەتای چالاکی خۆی لە جەنگی (موج العیون)دا پیشاندا، کاتێ (حسام الدین) مقاوەمەی کەشتیگەلی فەرەنگی کردو هەندێ کەشتی ئەوانی وێرانکردو دو کەشتی گەورەی دەسکەوت کە پڕبوون لە تورەکە زێڕو کوژراو.

(سەلاحەددین) بەباشی زانی، کە ئەو زێڕانە بەسەر ئەو جەنگاوەرانەدا دابەش بکات، کە لەسەر ئاونو، دەسکەوتێکی زۆریان پێ برا، دیسان گیرفانی وەستاکانی پڕ لە دینارە زێڕکرد تا خاوەنی کتێبی (الروضتین)[1] دەڵێ: (کۆمەڵە کەسانێ دارابیان دەستکەوت کەقەت دەموچاوی ئەوان دەرهەمودیناری بەچاونەکەوتبوو)[2].

کەشتیگەلەکە لە (شارۆچکەی صور) تووشی شکان هاتن، کە دڵی مسوڵمانانی خەمۆك کرد، بەڵام زۆری نەبرد لە جەنگی (عەکا)دا باری خۆی ڕاستکردەوەو، (لؤلؤ) بە (٥٠) کەشتی جەنگەوە پەلاماری کەشتیگەلی فەرەنگیداو لەناوی بردن،

---

١) الروضتين / ٢ / ١١). (نووسەر).

٢) الروضتين في اخبار دولتين) وکتێبەکە باس لە دەوڵەتی (نورالدين)و (صلاح الدين) دەکاتو (ابو شامە المقدسي) نوسيويەتی/ المنجد في الاعلام/ لويس معلوف. هەر لە (المنجد في الاعلام)دا هاتووە کە ناوی (عبدالرحمن بن اسماعيل شهاب الدين)ە (١٢٠٢-١٢٦٦) مێژو نووسەو لە (دیمەشق) پەیدابووە... هتد. (وەرگێر)

درێژەی باسی ئەوە لە مەسەلەی قسەکردن لەمەڕ فەرمانداری دەریاوە دێ کە هەموو دەسەکەوتەکانی ناوی زەوتدەکاتو، سوپاکەی ناوی بۆ شارە گەمارۆدراوەکە دەگوازرێتەوەو، ئەمەش تفاقو چەکی زۆرترکردو ورەی خەڵکی (عەکا)ی بەم سەرکەوتنە بەرزکردنەوەو سوپاکەیان بە تواناتربوونو خاچ پەرستەکان لەمە ترسانو هەرچی کەشتی ئەوان بوو کۆیان کردەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ کەشتیگەلی میسریدا، بەڵام جەنگەکە بەسەرکەوتنەکی یەکلاکراوەیی هاتەدی، پاشان کەشتییەکی دەسکەوت کە بۆ رزگارکردنی فەرەنگەکان هاتبوو ئەوەی لەناوی دابوو سەرنشینەکانیشی هەموویان دەستیان بەسەردا گیرا.

دوای چەند ڕۆژێ جەنگی دەریایی دەستی پێکردەوە، دوای ئەوەی کەشتیگەلێکی زۆر لە ئەوروپاوە هاتنو توانییان گەمارۆی (عەکا) بدەن، نەتواندرا ئازوقەی بۆ دانیشتوانی ڕەوانە بکرێت، (حسام الدین) تاکتیکەکەی دۆزییەوەو کەشتییەکی قەبەی ئامادەکردو، دەستوری بە پیاوەکانیدا کە جلی خاچ هەڵگرەکان بپۆشنو ریشیان بتاشنو دوو خاچ بەرز بکەنەوە، سەرکردەکانی فەرەنگ وایانزانی ئەوانە لە خۆیانن، بۆیە وازیان لە کەشتییەکە هێنا کە بەرەو قودس بڕوات، ئەنجا بەرەو (عەکا) ڕۆیشتنو توێشو زەوادییان پێ بوو، خەمی لەسەر گەمارۆدراوەکان لابرد کە پێویستیان بە خواردنو خواردنەوە هەبوو، ئەمەی چەند جارێ دوبارەکردەوە، تا فەرەنگەکان هەستیان بە پلانەکردو ئەمەش بووە هۆی ڕوودانی جەنگێکی درێژخایەن بە حیسابی هێرشو پەلاماردان.

ئەو کەشتییەگەلە خەباتی سەختی خۆی هەبوو لەهەموو هەڵوێستێکدا، دیارترین هەڵوێستیان سەرکەوتنیان بوو بە سەرکەشتییەگەلەکی فەرەنگیدا، کاتێ کۆمەڵەکی زۆریان هاتن بە شوێن حاجیانی ماڵی خودا داهاتن، ئەوانە هەر بە تالانکردنی ئەوانە نەوەستان کە پێییان بوو، بەڵکو شمشێریشیان لە ڕاستدا هەڵکێشانو دەستیانکرد بە کوشتیان تا لە یەکتریان دابڕن، (سەلاحەددین) زۆر بە توندی ڕقی خۆی بە (ئەرناط) نیشاندا کە پاشای (کەڕەك) بوو کە بەم کارەی

هەڵسابو، دوای ئەوەی لە داهاتودا لە شوێنێکی تر پێیگەیی کارەساتی خۆی بەسەردا هێنا، چونکە بەقسەی ناشیرین سوکایەتی بە کەسایەتی پێغەمبەری خودا ﷺ کردبوو، (سەلاحەددین) مووەکانی پێگرژبوو، سوێندی بە خودا خوارد کە تۆڵەی لێ بکاتەوەوە کارەکەشی هێنایەدی.

ئەمە بەشێك بوو لە خەباتی کەشتییەگەلەکانو، ئەگەر (ابن خلکان) بەهۆی گێڕانەوەی خۆی لەوەی باسمانکرد بە ویژدانەوە بۆ (بهاء الدين قەرەقوش) چووبێ، منیش بۆم هەیە بە ویژدانەوە لەگەڵ (حسام الدين لؤلؤ)دا بجوڵێمەوەو، داستانێ لەمەڕ ئەمەوە دەگێڕمەوەو، لەژێر ناونیشانی (ئەمیری دەریا)دا دەینووسم کە لە ناوەڕۆکدا بەشێکە لە مێژووی (سەلاحەددین).

## سەرلەنوێ بەرەو (شام)

هەر كارەسات و ئاستەنگەكى (صلاح الدين)م خوێندبێتەوە كە لە ژیانێكى پڕ لە كێشەیدا لە بەرامبەریدا خەباتى كردووە، ئەم قسەیەى شاعیر (ئەبو تەمام)م دەهاتەوە یاد كە دەڵێ:

لقد علمنا ان ليس اِلاّ بشقّ النفس صار العظيم يدعى عظيما
طلب المجد يورث المرء خبلا وهموما تقضقض الحيز و ما
فتراوه وهو الخلي شجيا وتراه وهو الصحيح سقيما
يمته العلى فليس يعد البؤسف بؤسا ولا النعيم نعيما
كل حال تلقاه فيها ولكن ليس يلفى في حالة مذموما

چونكە (سەلاحەددین) هەر لەوكاتەوە كە وەزارەتى (عاضد)ى گرتە دەست شەوێكى پشوى نەداو نەحەسایەوە، دوژمنانى تۆقیاندابوو، هەبوو لەو دوژمنانە ئاشكرابوون كە بەهۆى پەلامارە دوژمنكارانە تاوانكارەكانیان دەیانناسین، دوژمنى شاراوەو نادیاریشى هەبوو كە ئەوانە هاوپەیمانەكانى بوون لە مسوڵمانان كە رواڵەتیان بە خۆشەویستى پیشان دەداو فرت و فێڵێشیان بە دزییەوە لێدەكردو پلانیان لێدەگێڕا، لەوانەش خزمەكانى خۆى لە ئامۆزایەكانى كە ئەو شكۆیەیانى بە شایستەى ئەو نەدەزانى و وایاندەزانى قابیل بە ئەوانە، كەچى (ئەییوب)ى باوكیان خۆشى كوڕەكەى خۆى لە ئەو بەشایەنەتر دەزانى و، بەوەى ڕازى بوو كە لەژێر بەیداخى ئەودا كاربكات.

چونكە سۆزى باوكێتى هيچ بوارێكى بۆ كێبەركێ نەهێشتبۆوە، هەرچى خزمايەتى برايەتى‌و مامێتییە ئاسانە كە خۆپەرستەكان شيرازەى بپچڕێنن[1].

هێشتا (سەلاحەددين) لە شام نەگەڕابۆوە تا لە (ميسر) دابنيشێ كە هەستى بە دڵەڕاوكێ كردو، جێگاى لێ ناڕەحەتكرد، وەك بڵێى لەسەر دڕك گەوزە دەكات، گەر لە خەو هەڵدەستا هەور بەرى ئاسۆى گرتبوو لەبەرچاويدا، سپێدەى بە ڕۆناكى نەدەبينى، بەڵكۆ بە لێڵى‌و تەڵخى دەهاتە بەرچاوى‌و بە دووربينى خۆى پەى بەوە دەبرد كە هەڵگيرسانى ئاگرەكە نزيكە، ئەم گومانەشى لەيەك لاوە نەبوو، بەڵكو دوولايەنە بوو، هەر دوولاكانيش پێچەوانەى يەكترى بوون، چونكە ئەو مسوڵمانانەى لە شامدا بەيعەتيان پێوەكردبو حەسوديان پێدەبردو لە ناخياندا دەمامكيان دابو، هەبوو وايدەزانى (سەلاحەددين) ميراتى ئەوى قۆرخكردووە،

---

١) جوانترين نموونە لە قورئاندا بەسەرهاتى يوسف‌و براكانيەتى، كاتێ وتيان ﴿... لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ...﴾ (يوسف- ٨)، واتە: باوكمان يوسفى لە ئێمە خۆشتر دەوێ، كەچى ئێمە دەستەيەكين. لێرەدا ئێرەيى دەيانگرێ و، ڕق‌و كينە لە دڵياندا دروست دەكات‌و، هانيان دەدات بۆ لەناوبردنى يوسف يان هەرنەبێ دورى بخەنەوە. جا ئەگەر گوڕانى پێغەمبەران ئەم كارانە بكەن بۆ خەڵكى تر زۆر ئاسايى دەبێت!

لە كتێبى (الكرد في دائرة المعارف الاسلامية/ ت: حميد ريبوار)دا (ل: ٥٦)دا هاتووە: (زۆربەى سوپاى ئەييوبى تورك بوون و، ژمارەكى زۆريش كورد بوون، لە ساڵى (١١٨٧ ز)دا (صلاح الدين)داواى كۆمەكى لە كوردەكانى باكورى ديجلە كرد بۆ خەبات، هێزى جەزيرە لێرەو لەوێدا بە تايبەتى لە ساڵى (١١٨ ز)دا بڵاوەى لێكرد، بەڵام ديارىەكرو زۆر لە هۆزەكان شانبەشانى (صلاح الدين) جەنگى گەرميان دەكرد. زۆر پلەى سەربازى بەرز لە كورد بوون ديسان دەسەڵاتى ترى دەوڵەتيش لە سەردەمى ئەييوبييەكاندا بە چەنگ كورد بوو، كەچى زۆرجار پێچەوانەى بەرژەوەندى حكومەت كاريان دەكرد. كاتێ (شێركۆ) مرد، كورد بەوە رازى نەبوون كە (صلاح الدين) لە شوێنى ئەودا دابنرێت (ابن خلكان/ مجلد ٤ / ل: ٤٦٤) بەڵام خێڵى ئەبو هەيجانى عازەبانى كە بە ميرات سەرۆكى هەولێر بوون ڕۆڵەكى گرنكيان هەبوو لە بەڕێوەبردنى ناوچەكەدا..).

(ام يحسدون الناس على ما اتاهم الله من فضله)؟ حەسودى‌و ئێرەيى ئاستەنگێكى گەورە لەبەرامبەر ڕێگاى خێرو حەقداو، سەرچاوەى زۆر گوناهو تاوانى گەورەيەو، زۆر دەسكەوتى گەورە لە دەست مرۆڤ دەدات، وەكو ئيمان‌و دەسەڵات‌و، برايەتى‌و، بەختەوەرى‌و پێكەوەژيان‌و ئاسايش‌و خاك‌و نيشتمان‌و خێزان‌و پێشكەوتن‌و سامان‌و ئابڕوو ... هتد. (وەرگێڕ)

کەچی زەوی خاکی خوایەکە مەبەستبێ دەیدا بە بەندەکانی، هەتا ئەو فەڕەنگانەی ئاگربەستی لەگەڵدا کردبوون پێیان شتێکی گەورەبوو کە شامو میسر پێکەوە لەژێر فەرمانی (سەلاحەددین)دابن، (نورالدین) کە تەنیا شامی بەدەستەوە بوو زەقنەمووتی پێدەنۆشین کە پیاوی دڵنیابوونو پشتگیریکردن بوو، ئەی دەبێ حاڵەتیان لەگەڵ (سەلاحەددین)دا چۆن بێ کە (میسر)یشی لەگەڵ (شام)دا گرێداوە، کە پیاوی پەلامارو پەلەکردنە، ئایا هەتا ئەو بەسوارو پیاوەکانی هێرشیان دەکاتە سەر بێدەنگ دەبن کەوا گومان ببات ئەوان بێ هێزو لاوازن، یاخود دوژمنایەتی خۆیان بە داگیرکردنی میسری وڵاتی لەم زوانەدا پیشان دەدەن، ئەو دەیزانی خەڵکی بایەخ بە ئاگربەستەکەی نادەنو، ئەوان ئامادەباشی تەواویان هەیە بۆ بەرەورووبوونەوە، چونکە دەریاچەكو هێزو پیاو ڕەوانە دەکات بۆیانو، ئەو کۆچکردانەی تینوی جەنگکردنن زۆربوونو پێویستە جەنگەکە دەست پێبکات!

ئەمە پوختەیەکە پێویستی بە ڕاڤەو لێکدانەوەی ڕوون هەیە، کە وەکو گومانێ (سەلاحەددین)ی داگرتبوو، ڕۆژانیش سەلماندیان ئەمە واقعێکەو ڕاستە لە ڕەوانگەی ئەو مسوڵمانانەوەش کە دەیانویست کێشەی بۆ بنێنەوەو تەنگاوی بکەن دەرفەتێکی بە پەلەیان بۆ هاتەپێش، کاتێ لە دوو کاتی نزیك لەیەکتریدا (سیف الدین غازی) شای (موصڵ)و پاشا (صالح ئیسماعیل نورالدین) شای (حەلەب) مردن کە هەردوولا بە نهێنی ئەویان ناڕەحەت دەکردو بڕوایان وابو کە جەماوەری مسوڵمان بۆ دەسەڵاتگرتن بەسەر جیهانی ئیسلامیی بانگێشەی دەکەن لەناو گەلی عەرەبیدا، ئەم تەنگانەیەش کاتێ خرایەڕوو کە دوو ڕاسپاردە (الوصیە)ی هاوشێوەی یەکتری نووسران، ڕاسپاردەی یەکەمین (سیف الدین غازی) نووسی کە دەقەکەی لەسەرئەوەیە کە (موسڵ) پاش ئەو بۆ (عزالدین مسعود)ی براکەی دەبێتو بۆ هیچ کام لە کوڕەکانی نابێ، چونکە ئەوان هێشتا بچوکنو ئەوەندەیان بەسە لە ژێر چاودێری (عزالدین)دا دوو شار سەرپەرشتی بکەن، وەك بڵێی هەمو میراتی کۆکردۆتەوە.

ڕەنگە دەنگ‌و دۆی ئەم ڕاسپاردەیە لە ڕۆژانی دوایی تەمەنی شا (صلاح) لەکاتی نەخۆشیەکەیدا بۆ ئەو گوازرابێتەوە، بۆیە ڕاسپاردەی خۆی بۆ (عزالدین مسعود)یش دەنێری، چونکە وای دەڕوانی گەر ئەو ناوچە بنەڕەتیانەی وڵاتی شامی لە ژێر چەنگدابێ هەم میراتی (سیف الدین)یش ئەمەلادەبێ بە مەترسییەکی گەورەو هەڕەشەلە (سەلاحەددین) دەکات، ئەنجا وەکو سەردەمی (نورالدین) شام[1] بۆ خانەوادەی (زەنگی) دەگەڕێتەوە. لەسەروبەندی مردنی (شا صالح)دا هەواڵی ڕاسپاردەکە بە (عزالدین مسعود) گەیشت‌و ئەویش ڕوی لە (حەلەب) کرد، تا بەو نزیکانە ببێتە پاڵەوانی بەرەو ڕووبوونەوەو، لە ڕێگای سبخورەکانییەوە هەواڵی پێگەیشت کە سوڵتان بەو نزیکانە (میسر) بەجێدێڵێ‌و بەرەو (شام) دەکەوێتەڕێگا، چاکی دەزانی (سەلاحەددین) کێیە؟ لە هاتنی ئەو ترسی بۆ پەیدا بوو، داوای لە (عماد الدین)ی براکەی کرد کە لە شوێنی ئەودا دابنیشێ لە (سنجار)[2] و ئەویش ببێ بە شای (حەلەب)، (عماد الدین) ئەم ئاڵوگۆڕەی زۆر بە دڵ بوو، بڕوای وابوو چارەنووس لەگەڵ ئەودا دەبێ، چونکە شامیەکان دەزانن ئەو ڕەسەنە نەك بێگانەیەو، شارەکەش هی باوکییەتی‌و، (سەلاحەددین)یش سەربازەکی باوکییەتی‌و، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەو خاوەن حەقە بۆ دەسەڵاتگرتن بەسەر (حلب)دا وە کەس ئەو مافەی نییە.

١) (شام) وەکو لە (المنجد)دا هاتووە: (ڕابردوو بە هەموو سوریا وتراوە شام، بەڵام لە سەردەمی دەسەڵاتی عەرەبدا بۆ (٧) کەرت دابەشکراوە: (فەلەستین‌و ئەردەن‌و حمس‌و، دیمەشق‌و قەنەسرین‌و عەواسیم‌و ثغور) هەرچی ئیمڕۆیە تەنیا بە دیمەشقی پایتەخت دەوترێت). لە کتێبی (ترغیب اهل الاسلام فی سکنی الشام/ حجە الاسلام عزالدین)دا هاتووە لە (ل ٤٨)دا لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە لە (جامع الصغیر)و (مجمع الزوائد)دا (صحیح)ە: {پێغەمبەر ﷺ ڕوی کردە شام‌و عێراق‌و یەمەن فەرمووی {اللهم اقبل بقلوبهم علی طاعتك، وحط من وراءهم} .

٢) سنجار (شەنگار)ە: ئەم ناوچەیە لە (کیتاب المقدس)دا بە (بابل) هاتووەو شوێنی (نەمرود) بووە. لە بەرامبەریشدا: (سینجار) هەیە لە نزیك سنوری عێراق‌و سوریادا کە چیاێیکە بەسەر شەنگاردا دەڕوانێ (٢٠٠ - ١ م) (المنجد في الاعلام) (وەرگێڕ).

ئەوانە لە يادیان كردبوو كە (سەلاحەددین) لەگەڵ ڕەوەندەكانیو پاشماوەكانی كاربەدەستانی (زەنكی)دا لە ڕابردوودا ڕێكەوتن نامەكی كرد بوو كە دەسەڵاتی لە ژێر دەسەڵات ئەودا بۆ ئەوانە، تا ئەوان لەگەڵ ئەودا شانبەشانی یەكتری لە بەرامبەر هێرشی خاچ پەرستیدا بەرەو ڕووبنەوەو، كەس بۆی نیە ئەگەر (شام) چۆڵ بكاتو (میسر) بگرێتە دەست ڕێگای پێ بگرێت.

ئەم ڕووداوانە بە پەلەو بەشوێن یەكتریدا هاتنو، هەواڵەكە بە (سەلاحەددین) گەیشت. پاشان كارەساتی لەمەش خراپتری بۆ هات كە گوایە هەندێ لەو هاوپەیمانانەی ئەو لەگەڵ (فەرەنگ)و (باطنیية)كاندا بوونە سوێندخواری یەكتری، تا وەكو كۆمەڵێك دژ بە (سەلاحەددین) كار بكەن!

(خاچ هەڵگرەكان) بەم ویلایەتە زۆر خۆشحاڵ بوون كە ئەوان بەوانیان داوە، كەواتە مسۆگەرە بۆ (شام) دەڕواتو زۆر لە خۆشەویستانو مریدانی ئەو حەزیان نەدەكرد ڕووداوەكانی ئەوانە بێزاری بكەن، ئەنجا ئاهەنگەكی ماڵئاواییان لە (دۆڵی نیل)دا بۆ گێڕا، وەكو دواجار. نازانم بۆچی خودا ئیلهامی هەندێ لە مامۆستایانی منداڵەكانی ئەوی كردووە كە بەم هەڵبەستەی شاعیر لەگەڵیدا بدوێن:

تمتع من شـــميم عرار نجـــد          فما بعد العشـــيه من عرار

ئەمەش گەواهی دانەكە بۆنی ڕەشبینی لێدێو، دڵی (سەلاحەددین)ی پێگیراو، كاتێ نكۆڵی تەواو لە قسەی مامۆستاكە كرا، ئەو وتی مەبەستم پێ لەوەیە كە ئەو دەیەوێ هەندێ دوور بكەوێتەوەو بەسو هەندێ شنەی (میسر) هەڵمژێت، وە مەسەلەكە لێرەدا چێژەو، چێژیش شتێكە لە كتێبێكاندا نییەو، جێگای داخیشە - سەلاحەددین) لەبەر ئەوە ڕۆیشت كە نەگەڕێتەوە...

(سەلاحەددین) بەرەو (دیمەشق) كەوتە ڕێگاو، جەماوەرەكی زۆری لەگەڵدا بوو كە نەك هەر سەرباز بوون، بەڵكو بازرگانو پیاوی گەورەشی لەگەڵدا بوون بۆئەوەی، تا دەگاتە (دیمەشق) هاوڕێتی بكەن، هەتا هەست بە تەنیایی نەكاتو، خەمێ

بڕەوێننەوە، ئەمەش هەستەکە لەناو عەرەبدا باوەو لەو کەسانەدا دەیبینن کە لە هەلوێستی ترسناکدا ناسڵەمنەوە بۆ ڕازیکردنی وەلامی هەلوێستە سۆزییەکانو عاتیفییەکان کە لە دلیاندا دەجولێتەوە، خاچ هەلگرەکانیش بە هاتنی ئەو تۆقینو هەر یەکەمجار زانیان کە هەوالەکە درۆ نیە کە بنەمالەی زەنگی لە دژیدا وەستاونەوەو، هەیە لەوانە کە پەیوەندی پێوەکردنو، سولتانیش بەمەی زانیو ئاگاداری خۆی وەرگرتو سوپای کرد بە دوو بەشەوە، بەشێ بەرەو (دیمەشق) بەسەرکردایەتی برای پالەوانی (بوری تاج الملوك) کەوتە ڕێگاو، بەشەکەی تریش لەگەلٚ خۆیدا مایەوە وەك ئامادەسازی بۆ جەنگ، برازاکەی تریشی (فەروخ شاە) کارێکی ژیرانەی کرد کە پالەوانەکانی تربوو جێگری ئەو بوو لە دیمەشقدا، کاتێ زانی خاچ هەلگرەکان لە دەوری (ئەردەن)دا کۆبوونەوە بۆ جەنگێکی چاوەڕێکراو لەگەلٚ (سەلاحەددین)دا ئەو - خوا پاداشتی بداتەوە - بە پەلە پەلاماری (طبرية)و (عکا)ی داو، (شقیف)و (ارنون)ی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوەو (١٠٠٠) دیلو (٢٠٠٠٠) سەر مەڕی لەگەلٚ خۆیدا هێناو، ئەنجا هەلێکوتایە سەر کەناری خۆرهەلاتی (ئەردەن)و دوای (٥) ڕۆژ گەمارۆدانی توانی گرنگترین کۆشکەکەی دەستی بەسەردا بگرێو، دوای ئەوەی فەڕەنگەکانی لەناوی ڕایانکرد مسولمانانی لەناودا نیشتەجێ کرد!

ئەم هەوالە خۆشە گەیشتە (سەلاحەددین)و دەستخۆشی لەو پالەوانەتیەی برایەکەی کردو، چەندە خاچ هەلگرەکانو خەمباری لە دەستدانی (عەکا)و (طبرية) (شقیف) بوون، هەندە دلخۆشی تێدا بوو بۆ ئەو تا تفاقەکی تێر بێ بۆ مسولمانان!

کاتێ سولتان گەیشتە (دیمەشق) لە براکەی بیست کە ئەو چەكو تفاقەی دوای هێرشی (ئەردەن) هێنایەتی دەتوانێ ببێ بە هێزێك بۆ لەشکری مسولمانان، ئەنجا زانی کە جەماوەرێکی خاچ هەلگر لە دەوری (طبرية)دا کۆبوونەوەو بە پەلە دەستوری بە (فەڕوخ شا)دا کە بچێتە مەیدانیانو لەناکاودا بیانگرێتو، ئەویش بەمەبەستی خۆی گەیشتو بە ڕامالین گەیشتە شاری (بیسان)و گورج بە دەسکەوتێکی زۆرە وە بۆ (دیمشق) گەڕایەوە.

ڕۆڵی (سەلاحەددین) لەبەرامبەر دوژمنیدا لە (حەلەب)دا زۆر دژوار بوو، هات تۆقیدا بێتەوەی جەنگ داگیرسێنێ، چونکە دەیزانی شارێکی مسوڵمانانەو، لە نیازی ئەودا نیە مسوڵمانان لاواز بکاتو پەلامارییان بداتو، بە چاکی زانی بۆ (موسڵ) وازیان لێ بێنێو، لە ڕێگادا (الرها)و (حران)و (الرقه)و (سروج (نصیبین)ی گرت، وەکو (حلب) لەبەرامبەر (موسڵ)دا وەستاو، نەیویست هێرش ببات، بە چاکی زانی خەلیفەی (بەغداد) ئاگادار بکاتەوە تا گرژیو ئاڵۆزی نێوان ئەوو ناحەزانیدا چارەبکاتو مسوڵمانان زیانیان لێنەکەوێ، خەلیفەش هیچ کارێکی یەکالاکراوەی نەکردو، تەنیا پیاوێکی ئاینی گەورەی ناردەلا بۆ ناوەندیاریو ناوبژیکردن!!

هەواڵ هات کە خاچ پەرستەکان کۆبونەوە بەتەمان هێرشێکی کاولکار لەکاتی ئامادە نەبوونی (سەلاحەددین)دا بکەنە سەر (دیمەشق)، بۆیە ناچار بوو گەمارۆکە هەڵگریو بە پەلە باربکات، بەڵام فەرەنگییەکان نیازیان نەبوو سەرەتا بەرەو (دیمەشق) بچن، بەڵکو خراپەکاری وکاری تێکدەرانەو تۆقینییان خستە دەڤەری (حۆران)ەوە، پاشان بەرەو کەنارەکانی (دیمەشق) چوون، لەکاتێکدابوو کە جێگری سوڵتان مردبوو، زۆری نەبرد (سەلاحەددین) پەلاماریدانو نەیهێشت بە مەبەست بگەن دوای بە ئامانج گەیشتن بەرەو (حەلەب) کەوتە ڕێگاو (عماد الدین) سەرکاری ئەوێ دڕدۆنگ بوو لە کارەکانی (سەلاحەددین)و دەیزانی کە سوڵتان بشکێ ئەو ناچاردەبێ شەڕ لەگەڵ فەرەنگدا بکاتو ئەویش ئەو هەرەکەتو هێزی نییە، بۆیە پێشنیارێکی بۆ (سەلاحەددین) ناردو داوای لێکرد کە (حەلەب) وازلێدێنێو ببێتە والی بەسەر (شەنگار)ەوە[1] کە وڵاتی خۆیەتیو، سوڵتان بەو پێشنیارە دڵخۆشبوو، ئەنجا بۆ ڕازیکردنی دڵی ئەو زیاتر لەوەش (خاپور)و (الرقه)و (نصیبین)و (سروج)یش بەو سپاردو بەمەش کردی بە هاوپەیمانی خۆی.

---

١) شەنگار (سنجار) لە (کتاب المقدس)دا (بابل)ە کە مەڵبەندی نەمرود بووەوە ئیمڕۆش بە زۆری کوردی ئێزدی لێیە کە پاشماوەی کوردی دێرینن (وەرگێڕ)

(حەلەب) مەیدانی خۆی بەتاڵکرد بۆ پاڵەوانی رزگارکەرو بە سوپاس‌و ستایشەوە هاتە ناویەوەو، جارێکی تر بێ ڕکابەر شامی کەوتە ژێرچەپۆك، ئێستا پێویستە لەسەری کە دوای ئەو گێژەلۆکە هەڵەشەیە خۆی بۆ خاچ پەرستەکان دەستبەتاڵ بکات، خاچ پەرستەکان بەم ئەنجامە ترسان کە لەناکاوڕا ڕوویداو قەت چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکردو، (ئەنتاکیا) لەتەواوی ئیمارەتەکان پتر ترسی ڕێ کەوتبوو کە میرەکەی دەیزانی لە نیازی (سەلاحەددین)دایە پەلامار بدرێ‌و، ئیمرۆش کاتی ئەوە هاتووە، بۆیە دەستیکرد بە هەوڵدان بۆ خۆشنودکردنی سوڵتان‌و ڕازیکردنی‌و، کۆمەڵێ دیلی مسوڵمانانی بۆ ناردەوەو، ئەمان‌و دڵنیایی پێداو ئەنجا بە پەلە بە ترس‌و لەرزەوە رایکرد بۆ کۆنگرە بەستن لەگەڵ میری (تەڕابلوس)و شای (بەیت‌ولمەقدس)، تاپێکەوە وتووێژبکەن کە پێویستە ئەوان چی بکەن، ئێستا وا (شام) کەمێکی نەبێ لەگەڵ (میسر)دا هەمووی بۆ (سەلاحەددین) پاك بۆتەوەو چوڵبوو.

یەکێ لە ئەدگارەکانی سەرکردەی شارەزا ئەوەیە کە بتوانێ دڵی دوژمنانی خۆی بخوێنێتەوەو ئاگاداربێ بەوڕووانەی کە ئەوان بۆی دەچن لە هۆیەکانی لۆژیکی‌و ژیربێژی، یان سۆزی‌و عاتیفی‌و لەکاتی تەنگانەدا جڵەوی هەڵسوکەوت بەدەست خۆیەوە بگرێ، (سەلاحەددین) لە ڕیزی ئەوانەدا بوو کە هۆشیارانە تاووتوێی ناحەزەکانیان دەکەن‌و، ئاکامەکەشی پشتی بەو بەڵگانە دەبەست کە بەڕاست دانراون‌و دورن لەهەر ئەرکێکی دوور، ڕۆیشتنی شایەکانی فەڕەنگ‌و میرەکانیان جێگای ڕوانینی وردی ئەوبوون، دەیزانی هەیانە کە مەیلی ئاشتی دەکات‌و دەتوانێ بە دڵ ڕازیکردنی نەرم بگرێ‌و، ئەوەی سەربزێویش بکات نەك بەهۆی توانای زۆریەوە، بەڵکو بەهۆی سەر شێتییەکی بێ سەروبەرەوەبێ بێ وردبوونەوە ئەوە دەبێتە تفاقی ئەو لە جەنگدا.

یەکێ لەو شایانەی خاچ هەڵگر (ریجنالد) بوو، کە عەرەب پێیان دەوت (ئەرناط) کە لە بنەڕەتدا تەنیا هەڵپەرست بوو کە ڕواڵەتی تاکیەتی دروست

دەكەن، بێ حاڵیبوون لە مانای ڕاستەقینەكەی، لە جەنگی خاچ پەرستیدا هەناسەی بۆ هیوای دوور هەڵدەكێشا لە سامانو پلەو پایەو فراوانی دەست ڕۆیشتنو، ئەو لە ئەوروپادا خاوو خلیسك بوو، كەس بە شكۆدار ئاماژەی بۆ نەدەكرد، هیچ زمانێ بە بەڕێز باسی نەدەكردو، وە قەتیش لە زێدو نیشتمانی خۆیدا زەمینەی بۆ نارەخسێ كە هەڵكەوێو دەربكەوێ، بۆیە لەگەڵ سەرەڕۆیەكان كۆچی كردو، هەواڵی بۆ هاتەپێش كە پێشڕەوی شاندێكی وەكو خۆی بكات، ئەمەش لە ڕێگای فێڵو پیلانەكی داڕێژراوی خۆیەوە بوو، بەڵام ئاواتەكەی درێژخایەن نەبوو، هەڵەشەییەكەی هانیدا وەكو چەتەو ڕێگرێ پەلاماری كاروانێكی عەرەبەكان بدات كە لە ژنو منداڵیشی تێدابوو كە خزمەكانیان پێیان سەرشۆڕیو سوكایەتی بوو بكەونە ژێردەستیانەوە، بۆیە بە گورجوگۆڵی پەلامارپاندا، ئەویش نەیتوانی بەرگری زەبری یەكەم بگرێو كەوتەژێر دیلیەتی سەرداری (حەلەب)و (١٧) ساڵان بەدیلی مایەوە، چونكە هیچ لە شاكانی فەڕەنگ ئاوڕی لێنەدایەوەو، دەستی بۆ كڕینەوەی ڕانەكێشا، ئەمەش مانای وایە كە ئەو كابرایە لای ئەوان سەرەڕۆیەكی گەورەیەو ئازادی بكەنو نەكەن هیچ خێری بەناوچەوانەوە نییە، بەڵكو گێرانی ڕەگە بەربەستێ بێو هەڵەشەی ئەو نامێنێ كە دوور نیە مەترسی بۆ كەسانی تریش پەیدا بكات.

بارودۆخەكە وا هاتەپێش كە خۆیو گروپێكی وەكو خۆی بەرەڵا بكرێن، بەڵام نەك بۆئەوەی بگەڕێتەوە بۆ تاڵانی بێ سەرو بەرەو بەس، بەڵكو بۆئەوەی پیرەژنێ فریو بدات كە باوكی مردووەو میرنشینی (ئەردەن)ی بەدەستەوەیە، ویستی پیاوێ بدۆزێتەوە كە لە ڕێگای ئەوەوە ئەو ماڵە میرە بۆ ئەو بگەڕێتەوە، (ئەرنات) خۆی بردە پێش وەك گەنجێ بە ئامادەییو داواكاری خۆیەوەو ئەویش وەكو مێرد پەسەندی كردو، لەچاو تروكانێكدا دەسەڵاتی بەسەر گشت (ئەردەن)دا گرت، هەم جوتە قەڵای (كەرەك)و (شوبك)و وایزانی كە بەم هەڵگواستنە لە هیكڕایە دەبێ بە هاوشانی شاكانی (قودس)و (ئەتاكیە)و (تەرابلوس)، لەكاتێكدا ئەوانە لەگەڵیدا

کۆبوونەوە، پاش ئەوەی (حەلەب) کەوتە ژێر ڕکێفی (سەلاحەددین)ەوە بووە پیاوی خاوەن هەڵوێست لە (شام) دا، دەستیکرد بە دەرخستنی ڕەوتی هەڵەشەی خۆی کە گەلی خۆی بێزار کردبوو، ئەوانیش بە مەترسیداریان دادەنا بۆ خۆیان.

یەکێ لە تەنگەبەرەکانی ئاسۆکانی ئەوەبو، لەکاتێکدا دوای (١٧) ساڵان لە دیلی بەربوو وایدەزانی هێزی ئیسلام هەروەکو جارانی سەردەمی ئەوە، ئەمەش نەزانی یەکی ساویلکەییەو شایانی ئەو کەسە نیە کە فەرمان لە میرنشینی (ئەردەن)دا دەربکاتو سەرداری ئەوێ بێ، کاروباری ئیمڕۆی لەگەڵ (سەلاحەددین)دا جیایە لەگەڵ کاروباری دوینێی (نورالدین)، ئەگەر مسوڵمانانیش لەسەر یەك بۆچون نەبن لەبەرامبەر خاچ پەرستاندا یەك هەڵوێستیان هەیەو، ئەگەر کەسێکی واش هەبێ حەز بەوە نەکات (سەلاحەددین) سەرۆك بێ لە بەرامبەری ڕای گشتیدا ناتوانێ بە گوێی نەکاتو، هەموو ڕۆژێك سەرکەوتنەکی هەیەو لە شوێنەکەوە بۆ شوێنێکی تری دەباتە پێش!!

(ئەرناط) نەزانی کرد کاتێ خۆی وەکو ڕێگرێ نواندو هەڵیکوتایە سەر کاروانە دڵنیاو بێ ترسەکان کە بۆ ماڵی خوا بۆ حەجکردن دەچونو بە مەبەستی قڕان تێخستنیانو ئەو ئاگربەستەی لە نێوان (سەلاحەددین)و خاچ هەڵگراندا بوو شکاندیو، کاتی بە هاوارو قیژە حەجاجەکانی تۆقاندو بە ناچاری بەرەو شەهیدی بردن، وایزانی لە شەڕەکەدا سەرکەوتو بە سوپاوە بە بیاباندا بەرەو (تەیهاء) کەوتە ڕێگاو بە دزێوترین شێوە ڕایگەیاند کە تا (مەدینە) ڕانەوەستێ، تا جەستەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگرتێ بەرنەدات!!

ئەم ڕاگەیاندنە دزێوە ناشیرین بوو، کاریگەری گورجی ئەوە بوو (فروخ شا) سەرداری (دیمەشق)و برازای (سەلاحەددین) بەرەو (ئەردەن) ڕۆییو سەرکەوتنی دەستەبەر کردو وەك پێشتر ئاماژەمان پێیکرد.

بێگومان ئەم دەستدرێژییە بۆ سەر کاروانی حاجیانی بێ ترسو، پاشان ڕاگەیاندنی چون بەرەو (مەدینە)ی ڕوناك چاوگی ترسە بۆسەر هەموو مسوڵمانان

کە وایان بە پێویست زانی هەموویان یەکدەنگ بنو هەر لە ئێستاوە لە ژێـر یـەك ئالآدابنو، هەستی مسوڵمانانە گۆڕا بۆ توڕەییەکی بەگەرمەوە، نوێنەرو نمایندە لـە هەموو ناوچەیەکەوە هاتنە لای (سـەلاحەددین)و شـای (قـودس) زانـی شـکاندنی ئاگربەستەکە لەلای (ئەرناط) دەبێتە هۆی داگیرسانی شەڕ بە پەلـەو زویـی، بۆیـە نوێنەری نارده لای سوڵتانو پاکانەی خۆیکرد لەوکارەی (ئەرنات) کردویەتی، بۆیە (سەلاحەددین) وەڵامی بۆ شای (قودس) ناردەوە کە داوای کردبو هەچی (ئـەرنات) گرتویەتی لە دیلی مسوڵمانانو سامانو دارایی ئەوان بێ دواکـەوتن بیگێڕێتـەوە، (شا) بە ترسەوە چووە لای (ئەرنات)و پێـی وت کـە داهـاتو هێرشـێکی بـە پەلـە هەیەو بۆی ڕونکردەوە، بەڵام ئەو گاڵتەی بە قسەکانی هاتو بە لاوازو خەڵـەفاوی ناوزەدی کردو جەختی کردەوە کە سورە لەسەر چون بەرەو (مەدینە)ی مونەوەرە.

چەند کەشتییەکی خاچ هەڵگران لـە (ئـەوروپا) وە بـۆ (فەلەسـتین) ڕۆیـشتو، هەوای دەریای شەپۆلاوی بەرەو کەناری (دەمیات)ی بردنو،(٢٥٠٠) حـاجی تێـدا بوو کە مەبەسـتیان نیـشتەجێ بـوون بـوو لـە (قـودس)دا، بۆیـە (سـەلاحەددین) فەرمانی گرتنی بـە گـورجی ئـەوانی دەرکـردو بـە (عـادل)ی بـرای ڕاگەیانـد لـە (قاهیرە)دا کە بەپەلە بەم کارە هەڵسێ، تا بێتە وەڵامێ بۆ کاری (ئـەرنات) دژ بـە حەجکارانی مسوڵمانان!

بەڵام لێرەدا زۆرجیاوازی هەیە لە نێوان ئەم کارەو ئەو کارەدا، ئەم شاستەمکارە بە شمشێر ڕاسایە سەرنشینەکانی ناو کەشتی مسوڵمانانەوە، بەڵام سوڵتانی شکۆدار لەگەڵ حاجیەکانی بێ چەکدا کە شمشێری یـان هەڵنـەگرتبو تـەنیا بـەدیلی گـرتن، تاوەکو سەربەسەر بیان گۆڕێتەوە لەگەڵ دیلە مسوڵمانەکاندا.

پاش ئەوەی (حسام الدین لؤلؤ) سوپای (ئەرنات)ی شکاند لە ڕێگـای کەشـتیە گەلەکەیەوە (الاسطول) جەنابی (سەلاحەددین) خۆی هەڵسابە پـەرچ دانـەوەی ئـەم دەستدرێژییە کە لەکاتی ڕۆیشتنی دا بەرەو(مەدینە) شوێنی کەوتو، هەڵیکوتایـە سەرکەشتییەکانیو وەکو ڕابردوو بە کورتی باسمانکرد تێکی شکاندنو، دا هاتووش لە باسی (ئەمیری دەریا)دا ئەم مەسەلەیەو تێکۆشانی دلێرانەی ئەو بە درێـــــژی

لەلایەن خوێنەرەوە دەخوێنرێتەوە.

(سەلاحەددین) دەستوری دا کە ئامادەبێ بۆ سزادانی (ئەرنات) لەناوەراستی ماڵی خۆیداو سوێنی خوارد کە دەبێ بە شمشێری خۆی بیکوژێ ئەمەش لەکاتێکدا کە هەواڵی نەزانی ئەو لەمەڕ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەو گەیشتو، ئەم سوێندەش بووە نەزرەکی شەرعی کە پێویستە ئەنجامی بدات، تا بزانێ کە پێغەمبەر ﷺ لە (یەثریب)دا لەژێر چاودێری خوادایە، بەرلەوەی لەژێر چاودێری مسولماناندا بێ، سولتان روباری (ئەردەن)ی بڕیو پەڕییەوەو لەگەڵ سوپای فەڕەنگ کەوتە شەڕ کە لە شوێنێکی یەك لایی کەردا بوو کە وای لێ کرن بە تۆقو لەرزەوە ڕابکەن، لەشکرەکەی ئەو لەگەڵ لەشکری (فەروخ شا)ی برایدا یەکیان گرتەوە.

ئەنجا پێکەوە هێرشیان کردە سەر ناوچەی (غەوەر)ی دەوری (بەیسان = بیسان)و، لە وێشدا تێ شکان ئەنجا پاڵەوان نەگێرسایەوەو پشوی نەداو ڕوی کردە قەڵای (الكوكب) کە قایم ترین قەڵاتی خاچ پەرستان بوو، شەڕەکی گەرم لە دەورەکەیدا قەوماو، سەرکەوتن بۆ سەربازی (سەلاحەددین) بوو، بەڵام دوای ئەوەی کۆمەڵێ پاڵەوان شەهید بوون.

(سەلاحەددین) بەباشی زانی کە میرنشینی (تەڕابلوس)و (ئەنتاکیە) لێکتر دابڕێ، ئەمەش بە داگیرکردنی (بەیروت)، بۆیە چوو تۆقی کردو، وشکانیو دەریای لێ گرتن، بەڵام ملکەچ نەبوو، بەرەنگاری یەکی کرا کە (سەلاحەددین) وایزانی کە ئەم گەمارۆدانە درێژە دەکێشێتو وای بە چاك زانی بەجێ ی بێڵێو ئەو دیلانەی گرتوویەتی لەدەوروبەریدا بەسیەتی، لەگەڵ ئەو دەسکەوتە زۆرەی کە لە ناوەڕاستی دەستی کەوتووە، دڵنیا بوو لەکاتەکی تردا دەچێتەوە مەیدانی یەوە، کاتێ (بەلدوینی چوارەم) شای (بيت المقدس) نەخۆش کەوتو پەکی خست لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا، (جای لوزجنان)ی زاوای کرد بە جێگری خۆی کە (بەلدوین) دەسەڵاتی بەسەردا نەبوو، هەڵساویستی ئازایەتی خۆی پیشان بدات لە بەرامبەر فەرەنگەکانداو بەرەو گوندی (قوله) لە نزیك (عەین جالوت) هێرشی برد کە چەند ساڵێ دوای تێشکانی (تەتەر)ەکان دەنگو دۆی هەیە.

(سەلاحەددین) زانی کە (وەصی – جێنشین)ی نوێ ئازایەتی خۆی دەنوێنێ‌و، ئەویش ویستی وانەیەکی بداتێ کە قەت لە یادی نەچێت، بە سوپایەك چووە سەری کەلە سەروی سوپای ئەوەوە بێت، هەواڵ بۆ (جای لوزجنان) هات‌و لە هیکڕا ترسی کەوتە دڵو، ئەو خوێن گەرمییە عەنتەرییەی هەیبوو کاتێ دەیوت بەرەو (دیمەشق) دەچم بۆ ڕووخاندنی (سەلاحەددین) لە یادی کردو ڕای کردو هەڵات.

(سەلاحەددین) بە چاکی زانی دەست بە سوپاکەیەوە بگرێ بۆ جەنگێکی مەترسیدارتر، چونکە مەسەلەی (لوزجنان) کە بینی ترسەنۆکانەهەڵات‌و بۆی دەرچوو بە لایەوە گرنگ نەما.

حاجیەکانی ماڵی خوا ترسی (ئەرنات)یان لەسەر بوو، هەموویان دەستەو دوعا ڕاوەستابوون لە خودا دەپاڕانەوە کە بەڵای ئەم خوێن ڕێژە کەللەڕەقەیان لەسەر لاببات، لە هیکڕا هەواڵی سەرکەوتنی (حسام الدین لؤلؤ)یان بەرگوێ کەوت‌و، خۆشی هاتبوو بۆ وەرزی حەج‌و هەندێ ئەو دیلانەشی پێ بوو، کە پێشتر بەر هەڵستی یان کردبوو لەبەرچاوی ئەوکەسانەدا کوشتنی کە، لە جەنگەکەی پێشتر ڕایان کردبوو تا ببێ بەپەندو وانە بۆ ئەوانەی کە بیانەوێ ڕێگا بە حاجیانی ماڵی خودا بگرن!

وەڵامەکی یەکلاکراوەش بوو بۆ (ئەرنات) تا ئاکامی خراپەکاریانی پیشان بدات، (سەلاحەددین) سوێندی خوارد کە بۆخۆی بەدەستی خۆی لەگەڵیدا دابەزێ!

وەك بڵێی وایزانیبێ کە ئەم پاڵەوانە مسوڵمانە سوێندەکەی لەبەرچاوی خەڵکی تەنیا بۆ ترساندن بووەو لەو کەسانەیە کە لەبەرامبەر خەڵکی دا سوێند خواردنەکەی بە هەند وەرناگرێ‌و، تەنیا مەبەستی تۆقاندنەو هیچی تر!!

(سەلاحەددین) بیری لە تراژیدیاو کڵۆڵی حاجیە دورکەوتوەکان دەکردەوە بە دەستی ئەم ڕێگرەوە، ماوەییەکی درێژ (کەرەك)ی گەمارۆدا، بەڵام فریاگوزاری‌و کۆمەکییەك بەدوا یەکەکانی ئەوروپییەکان یارمەتی بەرهەڵستی

فەرەنگەکانیدا، ئەم پاڵەوانە لە هەڵوێستەکەی ورد بۆوەو بینی کە (کەرەك) بەم زوانە دەروخێ وەك دیارە کە میرنشینەکانی دەوروبەری دەڕوخێنو، ئەنجا پێویستە یەکەمجار سەری ئەژدیها پان بکات....... هەر ئەوەش ڕودەدات.

# چەند گومانێ بێ ڕێگە پێدان باس دەکرێن

چەندە سەیرە کە زۆر بڕیار بێ وردبوونەوە دەدرێن، چەند سەیرە ئەوەندە ئاسان بێ کە بابایەکی لێکۆڵەر هەواڵێکی پیاو گەورەییێ دەخوێنێتەوە هیچ شاعیرەك شانسی نەبوو بێ لای ئەو ڕابمێنێ، یان دەرگای بەڕوی ئەدیبەکدا داخستبێ و هەڵسێ ئەوە بکاتە بڕیارەکی گشتی لە ڕێبازی خۆیداو سەرکۆنەی بکات کە ئەو جەنگی لەگەڵ ئەدیبەکانو بیرتیژاندا کردووە.

ئێمە دەزانین کە ئەو ڕەوشەی (سەلاحەددین) لەناویدا ژیاوە بوواری نەداوە کە دیاریو بەخشیش بە شاعیرانو هەڵبەستەران بدات،کە کارو کاسبیان پێهەڵاگوتنو مەدحە لە وانەی، کەستایشی مرۆڤ دەکەنو سەرزەنشتەو سەرکۆنەی دوژمنەکەی دەکەن، ئەنجا زۆر نابات هەڵو مەرجیان دەگۆڕێو، ئەوانەی جاران لێیان دەخوێندو دادەبەزینە سەریان ستایشیان دەکەنو، ئەوانەی ستایشو مەدحیان دەکردن لێی دەخوێنن، ئەمە لە ڕێگای سەدان شاعیرەوە دەزانین لە مێژودا، ئەنجا لەکاتێکدا بڕیار لەسەر (سەلاحەددین) دەردەکەین کە پێشوازی لە شاعیرانی دەوڵەتەکەی نەکردووە کارەکان بە تەرازوی ڕاستی خۆی ناکێشین! (١) ئەم پیاوە خەڵکەکەی خۆی

---

١) سەرباری ئەمەش ماڵی مسوڵمانانە، نابێ دینارێکی بە فیڕۆ بدرێت، ئەگینا لەگەڵ لێ پرسینەوەی خواییدا بەرەوڕوو دەبێتەوە لە (انیس المؤمنین/ صفوة سعد الله)دا هاتووە: {جارێك پوری-پلکی- عومەری کوڕی عبدالعزیز هاتە ماڵی ئەوو داوای ماڵی زیاتری دەکرد لە بەیتولمالدا، کاتێ چوە ژور بینی نیسکێنەو پیاز دەخوات، وتی: ئەی عومەر ماڵی زیاترم دەوێ لە (بیت المال)؟ عومەر — خوا لێی ڕازی بێ- لەسەر خواردنەکەی هەڵساو درهەمێکی زیوی هێناو سوری کردەوەو لەناو تورەکەکی چنراوی ناو وتی: ها بگرە ئەمە زیادەیە. کاتێ گرتی دەستی سوتاو بوراوە، کاتێ هۆشی هاتەوە بەر وتی: پورم ئەگەر ئەوە حاڵی تۆبێ لەگەڵ ئاگری دنیادا دەبێ حاڵی تۆو من چۆن بێ لەگەڵ ئاگری خوادا لە پەسلاندا؟ (ل: ٦٤). قورئانی

تەنگەتاو دەکرد کە ئەوەی لە توانایاندا کۆی بکەنەوە بۆ ئامادەکردنی کەشتییەگەلەکانو، ئامادەکردنی تفاقی جەنگیو، بەهێز کردنی کەتیبە خەباتگێڕەکان! ئایا کەسێك دەرهەمو دیناریّ لە قورگی گەلەکەی خۆی دەربێنێ چاوەڕێی ئەوەی لێدەکریّ کە بە خۆڕایی بە فیڕۆی بداتو بە زێدەڕەوی بیدات بە شاعیرانو بیکا بە دیاری بۆ وەفدەکان!

(سەلاحەددین) قەت گەورەی خەباتگێڕان نیە گەر تفاقی شەڕ بە کەسانیّ بدات کە قسەو کردەوەیان وەك یەك نیە تەنیا بۆ ڕازیکردنی دڵی ئەوان! ئەو کەسەی لەڕەوشتی چاخەکە بیّ ئاگابیّ هەم لە کلۆڵی سەرکردە، ئەنجا سەرکۆنەشی بکات کە لەگەڵ شاعیرانو ئەدیبان چاوچنۆك بووە، ئەو کەسە لە جێگاکانی حوکمی مێژوویی دورە، چونکە کەس ناتوانیّ ئەم شوێنانە بگریّ، کەسانی بیر تیژ نەبیّ کە بزانیّ چۆن گومانو شتە نادیارەکانی دەوروبەری هەڵبسەنگێنیّ، ئەنجا لە بنجو بنەوانەوە ڕای خۆی بدات.

دەڵێن: (سەلاحەددین) هەر بەوە نەوەستاوە، دژایەتی لەگەڵ شاعیراندا بکات، بەڵکو شاعیرانی بەهرەوەری وەکو (عمارە- الیمنی) کوشتووەو، شاعیری خاوەن ئیلهام بە ناوی (ابن عینین) شاربەدەر کردووەو، فەیلەسوفی (سەهرەوەردی) کوشتووەو، بۆی نەبووە ئەم کارانە دژ بە پێشەوایانی ئەدەبو بیری هاوچەرخ دا بکات، ئەوانەی باس لە مێژووی ئەوانە دەکەن کە توشی سزای ئەو هاتوون، بەبیّ ئاگابوون لەو کارانەی کردویانەو، ناشیانەویّ ڕووداوەکان بە لۆژیکی بێلایەنیو ویژدانەوە شی بکەنەوە، بەڵکو حوکم بە ڕۆژانەکی سۆزایەتی دەدەن. مێژونووسیش

---

مەزن دەفەرمویّ ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ (الزلزلة/ ٧-٨)، واتە: کیّ کێشی گەردیلەییّ چاکە بکات دەیبینێتەوەو، کیّ کێشی گەردیلەییّ خراپە بکات دەیبینێتەوە. یەك گەردیلە بە پێی کیمیای نویّ تیرەکەی (١ / ١٠٠ ملیۆن کم) ئەمەش دادگەری ڕەهای کۆمەڵایەتی خواییە کە لە دواڕۆژدا پەیرەو دەکرێتو ئەگەر بەشەکی کەم لەم دنیایەدا لەم دادگەرییە پەیرەوکرابایە لەکێشە ئابوریەکان ڕزگارمان دەبوو! (وەرگێڕ)

قازییەکی پاکە ناوبژەکی خاوێنە، دەبێ قـازیو ناوبژیکـەریش لـەکاتی بڕیاردانـدا سۆزی خۆی بەولاوە بنێو تەنیا پشت بەبەڵگەو نیشانە ببەستێت.

لێرەدا بەکورتی ئەم سێ کەسانە دەخەینەڕو، تا بزانین (سەلاحەددین) چۆن ژیـر بووە لە کردارەکانیداو، نەیتوانیوە سنور ببەزێنێ، تا جڵەوی لە دەست نەڕواتەدەر:

(عمارە الیمنی): یەکێ بووە لە گەورە شاعیرانی دەوڵـەتی فـاتیمیو ئـەییوبی، شاعیرو فەقیهزان بووەو، لێکۆڵەربووەو، حەزی کردووە سوننی بـێ لەسـەر ڕێبـازی شافعی بێو، لە چاخی فاتیمی دا بە ئاشکرا لەسەر ئەمە پێی داگرتووە.

. فەرمانڕەواش لە دڵسۆزی ئەو ڕازی بووەو دوژمنی ئـەویش ڕێـزی گرتـووەو بـە دڵی بووە، چونکە لەکاتی قسەکردن ڕوپامایی‌و دورویی نـەکردووەو باوکیـشی لـە پیاوە ماقوڵەکانی (یەمـەن) بـووەو، سـەردەمێ بلیمـەتی ئـەوی بینیـوەو وریـای کردۆتەوە کە نەکەیت لە هیچ مـسوڵمانێ بخوێنی‌و هـەجو بکـەیت، ئـەنجا چـووە سەردانی حەج‌و، هەجوەکانی بە میری (مەککە) گەیشت‌و میر بینی کە مرۆڤـەکی بەڕێزەو، ئەمەش وای لێکرد نامەیەکی سیاسـی پێـدا بنێرێ بـۆ (میـسر)و، لـە (میسر)دا ئەسـتێرەی ئـەو دەرەوشـایەوە، چـونکە وەزیـری ئـەوێی ئەوکاتـە کـە کارەکانی هەڵدەسوڕاند جەنابی (صالح تولائیعی کوڕی ڕوززەیك) بوو کە شاعیرێکی بەهرەمەند بوو کە دولایەنی مەزنی تێدا دیاربوو: لایەنی کارامەیی لـە جەنگـداو، لایەنی بەهرەوەری شیعری لە جەنگی (البیان) داو، زانی (عـمارە) مافی خۆی هەیە بۆیە لەناو دەست‌و پەیوەندی خۆیدا بەرزترین پایەی دایە.

ئەو ڕێزەی لە (عمارە)دا باس دەکرێ یەکێ لەوانە ئەوەبو کاتێ بینی لەو کـۆڕو دەست‌و پەیوەندەدا جنێوبـە (ئەبوبـەکرو عومـەر) دەوتـرێو بـە خـراپ نـاوە زەد دەکرێن‌و چۆن ئەو شیعانەی سنور بەزێنی‌و غلـو دەکـەن جنێویـان پێـدەڵێن، ئـەو لەکاتی ئەم دیتنەدا بە توڕەیی لە کۆڕەکە چووە دەرەو خەڵکەکەش زانیان کە بەچی توڕەبووە، بۆیە لای شا (صلاح) پاشە ملە زمانیان لێدا زانیـان کـە لێـی بەڕقـدا دەچێ، بەڵام وەزیری دڵـسۆز بـە نـەرمی بـانگی کـرد لێـی پرسـی بۆچـی لێمـان

دوردەکەویەوە؟ ئەویش لە وشەکانی گەیشت‌و وەڵامی دایەوە کە ئەو فەرمانی خوا بەجێ دێنێ کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾(الانعام- ٦٨)، واتە: ئەگەر ئەوانەت بەرچاوکەوت کە لەمەڕ ئایەت‌و نیشانەی ئێمەدا دەکەونە قسەو باس بە خراپە، تا دەچنە ناو قسەو باسێکی ترەوە ڕویان لێ وەربگێڕە، ئەگەر شەیتان لەیادت بباتەوە هەر کە هاتەوەیادت لەگەڵ گەلی ستەمکاراندا دامەنیشە.

ئەنجا صالح پێکەنی وتکای لێکرد بێ سەرزەنشت بگەڕێتەوە، ئەویش زانی ئەم گاڵتە جاڕیە دوبارە دەبێتەوە، بۆیە گۆشەگیری کردو بە قاسیدی شای وت من وردە بەردو زیخ لە لەشمدایە ئازاری بە ردەوامم دەدات‌و ناتوانم بگەڕێمەوە. وەزیری شاعیر پیاوەتی تێدا بوو مەردبو، زانی ئەم جۆرە سوننی یە لەو جۆرە کەسانەیە کە چاکەی لەگەڵدا دەکرێ بۆیە بەم شیعرەی ستایش دەکات‌و بۆی ڕەوانە دەکات:

قل لفقيه عمارة:

یاخیر من اضحی یؤلف خطبة وخطابا

الق الائمة شافعین فلن تری الا لدینا سنة وکتابا

ئەگەر ڕێزمان لە ڕەوشتی (عمارە) گرتبێ گیانی ئەم وەزیرەش پێویستی بە هەمان ڕێزلێنان هەیە[1].

لە ڕازیکردنی (عمارە)دا ئەوە دەردەکەوێ کە وەزیریش بۆچونی وابووە، نابێ هێرش بکرێتە سەر خەلیفە باشەکان، بەڵام ئەو ناتوانێ ئەو زمانانەی هەجو دەکەن بیانگرێت.

---

١) ئەوەی لە ئیسلامدا هاتووەو نکۆڵی لێ ناکرێ ئەوەیە کە جنێودان‌و شەڕکردن لەگەڵ مسوڵماندا گوناهی گەورەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {سباب المسلم فسوق وقتاله كفر} رواه الترمذي والنسائي. واتە جنێودان بە مسوڵمان فاسقییەو، شەڕکردن لەگەڵیدا کوفرە. (وەرگێڕ)

ئەنجا ئەو سەردەمی (طلائع بن روزیك) دوای هاتو (شاور) هاتە شوێنی ودەیزانی کە ئەو پەیوەندی بە دوژمنی ئەوەوە هەبووە، بۆیە بانگی دانیشتنی خۆی کردو، (عمارە) بە چاکی زانی ستایشی فەرمانڕەوا یەکە بکات، بەڵام ڕێبازی ئەوانەی نەگرت کە سەرزەنشتی سەردەمی وەزیری ڕابردو دەکەن کە بە شوێن فیتەی هەموو کەس دەکەون، بەڵکو ڕێزی خۆی پاراستو ئاماژەی بە چاخی ڕابردو کرد کە جێگای ڕێزلێنانەو دەڵێ:

زالــت ليالي رزيك وانصــرمت والمــدح والزم فيها غير منصــرم
ولم يكونوا عــــــدوا ذل جانبـــه وانما غرقوا فى ســيلـك العرم
وما قصدت بتعظيمي عداك سوى لم يرضى فضلك الا ان يسد فمي

ئەم هەڵبەستانە ڕێڕەوەکی جوانو مەبەستەکی باشیان هەیەو مرۆڤی پاکژو پیاوو مەرد نەبێ نایانڵێت، ئەوانەی چوبون سەرکۆنەی بنەماڵەی (روززیك) یاندەکرد بۆ ڕازیکردنی دڵی (شاور) لە ڕقان ڕەنگیان تێك چوو کە هەر ئەوانەش بوون ڕابردو ستایشو مەدحی ئەوانیان دەکرد، کاتێ (شاور) بەڕوی (عەمارە) دابزەی هاتیو، سوپاسی وەفاداری ئەوی کرد هەستیان بە شلۆقیو تێك چونەکی زۆر کرد! ئەمەش کارێك بوو ناچاربوو بیکات، تا بە هێمنو سنگ گوشاد وەسفی بکرێت.

ئەنجا سەردەمی (شاور) ڕۆییو چەرخی (سەلاحەددین) هاتو ئومێدی دەکرد لای (سەلاحەددین) بەهرەو شانسی خۆی دەستکەوێ، چۆن لای (ابن ڕوززیك)و (شاور) دەستی کەوتبوو، بەڵام (سەلاحەددین) بوواری پێ هەڵا گوتنی شاعیرەکانی نەبوو، چونکە سەرقاڵی گرفتو ئاستەنگی گەورەبوو، (سەلاحەددین) لە پلەی شیعر بێئاگا نەبوو، ویستیاری ئەدەبو تامەزرۆی شیعرو هەڵبەست بوو، دیوانی شیعری خوێن گەرمی جەنگی دەرخ کردبوو کە کاتی خۆی لەسەردەمی هەرزەکاری سەرەتاییدا لە (حەلەب) لەهەندێ پیرەمێردو پیاوەگەرەکانی وەرگرتبو ئەو چەند هەڵبەستەکی بە چاکی دەزانیو تا لە دژوارترین کاتی جەنگدا دەیوتەوە،

دەگێڕنەوە لە یەکێ لە جەنگەکاندا یاداشتێکی کچە بچوکەکەی هاتەوە یاد ئەم هەڵبەستەی شاعیرێکی وت:

ذكرتك والخطي يخطر بيننا
وقد نهلت منا المثقفة السمر

ئەمە هەڵبەستەکە لە ڕەوشتی سەخاوەتیو دڵ گەورەیی یەوە هەڵدەقوڵێ کە لە هەستی شاعیرەکەو ئەوکەسەی شاهیدی لەسەر دەداتو دەیلێتەوە دێتە دەرەوە!!

ئەم پاشایەی کارەساتی گەورە تۆقی دابو، کە ئەرکی قوڕس ماندووی کردووە، ئەو پارەیەی نیە کە بیدات بەوانەی پێی هەلا دەڵێن، ئەم نموونەیە هەموو ئەو ئارەزوانە دادەپۆشێ کە ڕەنگە لە ڕێگەی مەدحو پێ هەلاوتنی شاعیرانو چاك زانینی نووسەرانەوە بڕواتە ناو دەرونییەوە، بەلاّم ئەم هەڵبەستەکی تێ دەگرێو ئاشکرای دەکات کە دەوڵەتی فاتیمی چۆن گوێیان بە ئەوداوەو، چاویان لێی بووە:

وزرت ملوك النيل اذ زاد نيلهم
فَأُحمِد مُرتادى واخصبَ مرتعي
ملوكٌ رَعوالي حرمةً صار نبتها
هشيما رعته النائبات ومارُعي
مذاهبهم في الجود مذهب سنة
وان خالفوني في اعتقاد التشيّع

(سەلاحەددین لەسەر پلانی خۆی ڕۆیشت لە بایەخدان بەجەنگو وەکو ئیمڕۆ دەوترێ دەنگ لەدەنگی ئەو بەرزتر نەبوو، پاشان خەلافەتی فاتیمی ڕوخا وەك ڕابردوو ئاماژەمان پێکردو، دوو شوێنەواری جیا لەیەکتری پەیدا کردو، هەبوو لە خەڵکی پێشوازی لەم واقیعە بینراوە کردو هیوای سەرکەوتنی بۆ خواست دور لە

سەردەمی پلانگێڕیو تاکتیك گێڕان، هەبووپێی ناخۆش بوو ئەم سەردەمە نوێیە دابێو سەردەمێ بڕوخێ کە سەرەتاکەی گەشەکردوو گەشاوەبو، ئەنجا پاش ئەوەی خەلافەتەکە لاواز بوو ببووە یارییەك بە دەست دەسەلاتدارانەوە لە وەزیران، یەکێ لەوانە (عمارە) بوو کە خۆی شافعی بوو خۆشەویستی فاتیمیەکان هانیدا کە شینیان بۆ بکاتو بۆیان بسوتێو خەم بخواتو، گوێی بەڕەخنەی پیاوانی (سەلاحەددین) نەدا بەڵکو تازییە باری یەکی پڕ لە تانەو هەڕەشەی نارد وەك بلێی لە ئاکامەکەی ترسی نییە، لەم شین گێڕی نامەیەدا دەڵێ:

والله لـآ فـاز بيـن الحشـر مبغـضكم
ولا نجـا من عـذاب الله غيـر ولـي
ولا رأى جنّـة الله التـي خلقـت
من خان عهد الامام العاضد ابن علي
أئمتـي و هـداتي والذخيـرة لـي
اذا ارتهنت بما قدمـت من عمـل
ولو تضـاعفت الاقـوال واتسـعت
ماكنـت فيهـم بحمـد الله بالخجِـلِ
ياعاذلـي فـي هواي ابناء فاطمـة
لـك الملامـة ان قصرت فـي عـذلـي
بالله زُر ساحة القصرين وابـكِ معـي
عليهمـا لـآ على صفيـن والجمـل
وقل لأهليهما: والله ما التحمـت
فيكـم قروحي ولا جرحـي بمندمـلِ
لـهفي ولـهف بنـي الآمال قاطبـة
على فجيعتنا، فـي اكـرم الـدولِ

ئەم شيعرە كە هێرش دەكاتە سەر (سەلاحەددين)و دەوڵەتەكەى ئەو، هۆيەكە بۆئەوەى كە ئەو كەسانەى دەوڵەتەكەيان ڕماندووە تۆڵەى لێ بكەنەوەو، دوريش نيە (سەلاحەددين) توڕەبكاتو، هەرنەبێ تا بە شيعرەكانى كارنەكاتە سەر دڵى خەڵك بيگرێو زيندانى بكات، بەلاّم (سەلاحەددين) نەرمى كێشاو، وازى لە شاعيرەكە هێنا كە هەناسەى بداتو لە دڵى خۆيدا واى دانا كە ئەو كەسەى دڵ بە ئازارو خەمە دەبێ شوێنەك بدۆزێتەوە هەناسەى تێدا بدات، ئەنجا لە شيعرێكەوە بێ بيلێ يان نامەيەكەوە بێ ڕەوانە بكرێ، شيعرو پەخشانەكانيش هەر لە سنورى خەم بەرێ كردنو دڵى خۆدانەوە دانەما بۆوە، ئەگەر (عمارە) سەيرى مەترسى قسەكانى كردبايە سوپاسى خواى ئەكرد كە بەساغى دەربازى بووەو، گۆشەگيرى هەڵدەبژارد، بەلاّم كارێكى ترى كرد كە مرۆڤى هۆشيار ئەگەر سنگى فراوانيش بێ چاوپۆشى تێدا ناكات، ئەوە بوو لەگەڵ كۆمەڵێ لە هەوادارانى خۆى چەند كۆنگرەيەكى يەك بە دواى يەكيان بەستو لە ئاكامدا بڕيارياندا كە پەيوەندى بە شاى (قودس)و شاى (قوستەنتينى) يەوە بكەن، تا وڵات داگيربكەنو هێرشێكى لەناوبەر بكەنە سەر وەزارەت. (سەلاحەددين)و سوپايەكەى، كە خەريكى كارى (ميسر) بوون پلانەكە بۆ شوێنێكى تريش سەرى كێشا، كە پەيوەندى كردن بووبە (الباطنيية) ەوە لە (شام)دا تا خۆيەخشێ بنێرن شێر لە لانەى خۆيدا بێ ترس تيرۆر بكات.

شانسى (سەلاحەددين) وابو يەكێ لەوانەى ئامادەى ئەم كۆڕە بوو سەر بە (سەلاحەددين) بوو، پاڵەوان لێكۆڵينەوەى لەسەر هەموو شتێ دانا كە ڕودەدات كۆڕ لە دواى كۆڕدا، تا توانى پەيامنێرى پيلانچيان دەست گيربكات كە نامەيەكى نا پاكى كردنى پێ بوو، ئايا دواى ئەم نا پاكييە چى لە (سەلاحەددين) چاوەڕێ دەكرێ؟ ئەو (عمارە)ى لێ گەڕابوو كە چى دەڵێ لە شيعر بيلێتو، هەڵوێستەكان بووروژێنێ كە شيوەنى دەوڵەتى هەڵگرتووە ڕقو كينە دەجولێنێو هەڵدەگيرسێنێو ڕەوانە دەكات!

گومان لەوەدانییە كە لەناو ئەم شاندەی سەلاحەدیندا كە سانێ هەبووبێ كە هاندەری بۆ بێ دژبە (عمارە)، بەڵام (سەلاحەددین) خۆی سڵ نەكردو دانی بە خۆیدا گرت، ئەنجا پلانەكی لێ كرا كە پلانی دۆستایەتی كردن بوو لەگەڵ فەرەنگدا كە دوژمنی ئیسلام بوون بەر لەوەی دوژمنی (سەلاحەددین) بن!

پێویستە كە تۆڵە بكاتەوەو، لە دانیشتنەكی خێرا دا دادگایی بكرێن كە ئاشكرا بووە لە شەودا چ پلانێكیان دارشتبوو، لە سێدارەبدرێتو هەڵواسرێنو بكرێن بەپەند بۆ كەسانی تر، ئاوەها (عمارە) سەری لێ شێواو لایەنی ئەوەی گرت كە لە دوژمنی من بێنێتە ناو خۆو تا خۆیو (سەلاحەددین)یش لەناو ببات!!

خۆزگە (سەلاحەددین) هەر سەرەتا بەندی كردبایەو، بوواری نەدابایە شینی خۆی ڕاگەیەنیو بەو گرتنە لە پیلان گێڕان چەپا لە دەدراو، ئەوكاتە لەم بەڵایە رزگاری دەبوو!!

(سەلاحەددین) ستەمی لەوانە نەكرد كە لەدژی دەوڵەت پلانیان گێڕاو پەیمانیان لەگەڵ فەرەنگدا بەست بۆ داگیركردنی دەوڵەت، دیسانەوە ستەمی لە (محمد بن نصر بن عنین)ی نەكرد، كاتێ بڕیاریدا دوربخرێتەوە لە وڵات، ئەم شاعیرە لێ خوێندنی (الهجو) وەكو هۆیەك بەكار دەهێنا بۆ تۆقاندنو چاو ترساندنی دەوڵەمەندەكانو پلە داران، لەسەر پیاوە گەورەكان دەڕۆیشتنو داوای بەخشیشی لێیان دەكرد، هەر كە بەخشیشیان لەوە كەمتر بووایە كە داوای كردووە ئەوانەی هیوایەتیان نەهێناوەتە دی، بەڵێ خوێندن پرپیشكی ڕق خۆی بۆ دەناردنو، وای دەزانی كە ڕۆژانی ناخۆشی (جەریر)و (الاخطل)و (الفرزدوق) دەگەڕێتەوە كە شیعرەكانیان بە (المناقضة) ناسراوە، دەهات پەلاماری شاعیرانی تری سەردەمی خۆی دەدا، تا بە خراپ ناوزەدیان بكاو باسی ئەو لەناو ئەو خەلكەدا بڵاوبێتەوە، بەڵام ئەو بێدەنگی لێكرد، ئەنجا هەڵێكوتایە سەر سەرۆكانی دەوڵەتو قازیەكانو كاربەدەستەكانی، بەڵكو تا خودی (سەلاحەددین) لەم پەلامارە شیعرییە بێبەش نەبو ڕەخنەی لە ناتەواویەكی سروشتی گرت لەو داو وەكو جنێوێك هەڵی داو، ئەمەش سوكایەتی

پێکردنه کەو پێویسته لێی بپێچرێتەوە، بەڵام (عادل) بەسەریدا ڕابردو گوێی بەم نەزانییه نەدا، ئەنجا دەستیکرد بەڵێ خوێندن لە کەسانی تر لەوانە میرزا (الکاتب)و وەزیرو سەرکردە، لەو هەجوە دا باسی مەسەلەی ناشیرینی دەکرد کە قەڵەم ناتوانێ بیانووسێت، سوکترین سزای ئەوە بوو کە بگیرێت، چونکە کەسانی بێ تاوانی تۆمەت بار کردبوو، ئاسانترین بڕیار کە لەو کاتە لەسەری دەرکرا ئەوە بوو دارکاری بووختان کردنی (حد القذف) لیّ بدرێت، بەلام (سەلاحەددین) دەستوری دا کە لەولاتی ئەودا دوربخرێتەوەو، ئەوەبو بۆ (هیند) دورخرایەوە!

کەواتە: چۆن مرۆڤی بە ویژدان دەڵێ (سەلاحەددین) ستەمی لێکردووە؟! ئەگەر (ابن عنین) لەسەردەمی کەسانی بەر لە (سەلاحەددین) ژیاباوەکو (شاور)و (ضرغام) و، ئەو قسانەی پێ گوتبان بێ دادگاییکردن لەسەریان دەدراو، لاشەکەشی لە دەشتدا بێ شاردنەوە فڕێ دەدراو، ئەمەش لەگەڵ کەسانێکدا کراوە کە دەیەکی ئەو هەجویان نەکردبوو!

ماوەی هەجوەکە درێژەی نەکێشاو بۆ (دیمەشق) گەڕایەوەو، سەردانی (قاهیرە)ی کردو، (سەلاحەددین) دیاری وای دایە کە کەس ئەودیاریەی پێ نەدابوو، ئەنجا شا (عیسا)ی گەورە لێی خۆش بوو، ئەو هەجوەی کردبویە سەر خێزانی چاوی لێپۆشی، بەڵکو کردییە وەزیری خۆی! بەڵام نەیتوانی دەوام بکات، چونکە کاری وەزارەت لە کاری قەڵەم جیاوازە، (المتنبي) بە شیعرەکانی خۆی لە خۆی بایی بوو، ویستی ببێ بە میر بۆیە قسەی لەگەڵ (کافور) کردو وتی:

وغير كثير ان يزورك راجل
فيرجع ملكا للعراقين واليا

واتە: (زۆرنییە گەر پیادەیێ سەردانت بکاتو ببێ بە شایەکی عێراق وەکو والی). وەکافور بوو، سامانو ماڵی پێبەخشی، ئەویش لە جیاتیان هەجوی کردو لێی خوێند، چونکە نەیکرد بە والی عێراق! (کافور) زانی ئەگەر ئەو بشیکا بە

وەزیر بە كارى دەوڵەت هەڵناسىٚ كە بیخاتە ژێر فـەرمانى خۆیـەوەو، ئـەو لەمـەڕ ئەودا حەقى بەدەست بـوو، بۆیـە وا دەڵـێم چـونكە سـەرنەكەوتنى (ابـن عـیین)و داواكردنى چاو پۆشى بەڵگەیەكە لەسەرئەوە، كەكاربەدەستان حەزیان نەكردووە كار بدەنە دەست كەسىٚ كە شایانى ئەوە نەبێت! كەواتە هەڵوێستى (سـەلاحەددین) لـە (ابن عیین) حیسابى هێمنىو بەخشندەیىو لێبوردنى لێدەكرىٚ، كەواتە: چۆن دەڵىٚ: ئەو حەقى ئەم ئەدیبەى پێشێل كردووە، كە لە بەخشیش بىٚ بەشى كردووە.

قسەمان لەمەڕ فەیلەسوفى گەنجى شەهید (يحيى كـوڕى حـسین سـەهرەوەردى) ماوە كە ڕەخنە لە (سەلاحەددین) گـیراوە ئـەو تەسـلیمى بـە كوڕەكـەى دەكاتو فەرمانى پێدەكات لە (دیمەشقدا) كە شـا (صـالح) بـوو وازى لـىٚ بێنـىٚو بیداتـە دەسـتى دادگـا، زانراوەكـە (سـەهرە وەردى) قـسەى واى كـردووە كـە تێڕوانینـى نادیاریان هەبووەو، ماناى (الحلول – الاتحاد – الوحـدە الوجـود)ى بەخـشیوە كـە فەقیهەكان لە دژیدا جەنگ دەكەنو، بگۆكەیان بەبىٚ باوەڕ ناودەبەن.

هەواڵ گەیشتە (سەلاحەددین) كە (صالح)ى كوڕى فەیلەسـوفەكى هەڵبـژاردووە كردویە بە هاورىٚ، كە قـسەكانى پێـچەوانەى زانیارییـە ئیـسلامیەكانەو، فـەقىٚو مەلاكانى دیمەشق كەوتونە مەقۆ مەقۆ لەمەڕ كوڕەكەیدا كە بەم چەشنە ڕێزى لـەم تاوانبارە خراپكارە گرتووەو پێشوازى لێكردووە، ئەم فەقىٚو مەلایانە نامـەیان بـۆ (سەلاحەددین) ناردو، (سەلاحەددین) ناچاركرا كە بڕیارى دادگاییكردنى بـدات لـە كۆڕەكى ئاشكرادا، تا حەقیقەتى كارى ئـەو ئاشـكرا ببـىٚ، (سـەلاحەددین) تـەنیا فەرمانى بە دادگایى كردنـى بـە ئاشـكرایى داو، فـەرمانى بـە كوڕەكەشـى داو، كوڕەكەشـى بـە ناچـارییەوە فـەرمانى بـاوكى وەڵام دایـەوەو، قـازى دیمەشـقیش نەیدەتوانى كتێبێكانى ئـەم فەیلەسـوفە بخوێنێتـەوەو بڕواتـە نـاو بـنجو بنـەوانى فەلسەفى قوڵى ئەوەوە، لەناو ئـەو ڕسـتانەدا كـە كردنـى بەبابـەتى شـەڕە قـسەو دەمەتەقىٚ ئەوە بوو، كە دەڵىٚ: (خودا بە توانایە كە پێغەمبـەرىٚ دروسـت بكـات.

قازیش ڕوی لە (یەحیا) دەكاتو دەڵێ: (تۆ باست كردووە كە خوا دەتوانێ پێغەمبەرێ دروست بكات، ئەمەش مەحاڵە دوای محمد ﷺ هیچ پێغەمبەرێ نایەت.

(سەهرەوەردی): (توانای خوا بێ سنوورەو كە فەرمووی بەشێ ببە هیچ شتێ ناتوانێ ڕێگای پێ بگرێت).

قازی وتی: خوا بەسەر هەموو شتێ توانایە، بەڵام ناتوانێ پێغەمبەرێ دروست بكات، ئەمە مەحاڵە.

(سەهرەوەردی) وتی: ئایا مەحاڵی دروستكردنەكە بە ڕەهایی‌یە یان نە؟، قازی نەیتوانی لەم پرسیارە تێبگات، نەخوازەلا، كە بتوانێ وەڵامی بداتەوە، چونكە ئەم فەیلەسوفە دەیویست بڵێ: لێرەدا توانای هەیە بەهێزو، توانای هەیە بەكردارو، دەتوانێ بەهێز پێغەمبەرێ دروست بكات، بەڵام بەكردار ئەمە قەدەغەكراوە، چونكە خوا لەمەڕ پێغەمبەرەكەی دەفەرموێ: ئەو دوا پێغەمبەرە، ئەمە بوو مەبەستی ئەو لە دروستكردنی ڕەها (المطلق)و دروستكردنی پەیوەست كراوە (المقيد).

لە بۆچونەكی ستەمكارانەدا، قازی فتوای كوشتنیدا، كە بە فەیلەسوفی زندیق ناوزەدی كردو، شا (صالح) وەكو باوكی ئاماژەی پێدا بوو ناچار بوو حوكمەكە جێ بەجێ بكات!

لێرەدا دەپرسین كێ فەیلەسوفەكەی كوشت، (سەلاحەددین) یان قازی ستەمكار؟!.

ئەو كەسانەی لە سەر ئەم شتەیە شت دەنووسن بۆ ئەو ڕایە دەچن كە (سەلاحەددین) دژ بە فەلسەفە جەنگاوە، كەچی (سەلاحەددین) نەیتوانیوە كە بپرژێتە سەر فەلسەفەو كێشەكانی، بەڵكو تەنیا گوێی بە ئەوانەدا، تاوانەكەش لەسەر ئەستۆی ئەم قازیەیە كە بەبێ توانستیو ئامادەیی حوكمەكەی دەركرد.

# رۆژی حیتین (الحطین)

جەنگی (حطین) بەشێکی گەورەی لەشیکردنەوەی مێژوونووسانی فەرەنگی گرتووە، چونکە هۆشیاری یەکی یەکلاکەرەوە بوو بۆ کۆتا هاتنی ڕۆڵی خاچ پەرستی لە خۆرهەڵاتداو خەون و ئاواتی ئەوروپایی نەهێنایە دی کە ئەوانەی ئەم جەنگە ستەمکارانەیان هەڵگیرساند دڵنیا بوون کە سەردەکەون[1].

ئەگەر لە موتورییەکان کەسێك هەبوبێ هەوڵی دابێ بریسکەی سەرسوڕهێنەری سەرکەوتنی (سەلاحەددین) بکوژێنێتەوە، لەکاتێکدا ئەو سوپایەی لەلایەن خاچیەکان بۆ ئەم مەبەستە کۆکرابوونەوە تێك شکاند، بەو پاساوەی کە چەند هۆکارێ بەشدارییان کردووە لە شکاندنی خاچ پەرستەکاندا بە بێ ئەوەی پەیوەندییان بە شەڕەوە هەبوبێ، ئەوەی بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە ئەوەیە وەکو دەیزانین کە ئەم پاڵاوانە جەنگییە خۆی بارودۆخی پەیوەست بە جەنگی یەوە

(١) بۆ زانین صەلیبیەکان لە فەرموودەدا ئاماژەیان بۆ کراوەو چەند جارێ پەلاماری جیهان دەدەن، دواجار ئەمەیانە کە پێغەمبەر ﷺ پێشبینی دەکات و دەفەرموێ: {ستصالحون الروم صلحا أمنا، فتغزعون انتم وهم من وراءکم، فتنصرون وتغنمون و تسلمون، ثم ترجعون حتى تنزلوا بمرج ذي تلول، فيرفع رجل من اهل النصرانية الصليب فيقول: غلب الصليب، فيغضب رجل من المسلمين فيدقه، فعند ذلك تغدر الروم وتجمع للملحمة} رواه ابو داود {٤٢٩٢-٤٢٩٣} واتە: ئایندە ڕێکەوتنەکی ئاشتیانە لەگەڵ ڕومدا مۆر دەکەن ئێوەو ئەوان {بە هاوپەیمانی) لەگەڵ دوژمنی دەجەنگن و سەردەکەوت تالآن دەگرن و، سەرفراز دەبن، پاشان دەگەڕێنەوەو، دادەبەزنە ناوچەکی مێرگاوی تەپۆلکاوی، پیاوێکی نەسرانی خاچ هەڵدەگرێ و دەڵێ: خاچ سەرکەوت، ئەنجا یەکێ لە مسوڵمانان هەڵدەستێ و لێی دەدات، ئەوکاتە ڕۆم ستەم دەکەن و بۆ داستانەکە کۆدەبنەوە}. ئەم (داستانە — الملحمة) لە فەرموودەی تردا بە (الملحمة الکبری) ناسراوە. بڕوانە (سنن ابی داود/ الفتن). بۆ نموونە هاتووە: الملحمة الکبری وفتح القسطنتينية وخروج الدجال في سبعة اشهر} واتە: داستانە گەورەکەو ڕزگاری قوستەنتینییەو هاتنی دەججال لە (٧) مانگدایە. (وەرگێڕ)

هەڵدەسەنگاندو، ئەو هۆیانەی دەزانی کە دەبنە هۆی شکست پێهێنانی دوژمنەکەی، ئەنجا هەڵدەستا ئەو هۆیانەی دەکردن بەئامێرێ بۆ سەرکەوتنی خۆی.

ئەوەبوو، (سەلاحەددین) کارامایی ڕامیاری ژیرانەی هێنایەدی. لەگەڵ ئەو تێبینییەشدا کە مستەر (چرچڵ)ی سیاسەتمەدارو فێڵبازی گەورە وتویەتی لەشی کردنەوەی جێگا کەدا کە زۆری سوپای مسوڵمانان هۆکاری سەرکەوتنە کەبووە، ئەمەش بەوە وەڵامی دەدرێتەوە ئەگەر هاتبایە سوپای خاچ هەڵگران لە میرنشینەکانی جیاجیای فەڕەنگیدا بە جوانی سەرکردایەتییان کرابایە بە ڕێکیو نەخشەکی تۆکمەدار بەرەو جەنگ بەڕێ کرابان ژمارەیان لە لەشکری سەلاحەددین پتر بووە. زانراویشە کە کەشتیەکانی فەڕەنگی بە درێژایی ڕۆژانی داگیرکردنی خاچ هەڵگرێ لە کۆمەکی بەردەوام دانەبڕاون.

ئەوانەی هەڵمەتەکانی خاچ پەرستی بە (٧) دانە لە قەڵەم دەدەن[1] تەنیا مەبەستیان لەو جەنگە ڕەسمییانەیە، کە پادشایەکانی بە شێوەی میری دەرکەوتوون پێشڕەوی یان کردووە، هەرچی کەشتییەکانی ڕابردو بوو کە کلێسا بەرێوەی دەبردنو بەردەوام ڕەوانەی دەکردنو ڕەوانەکراوانی خۆیان بۆ تەواوی (ئەوروپا) دەنارد لە باشورەوە بۆ باکور کە مژدەی لێخۆشبوونیان ڕادەگەیاند لە گوناهەکان بۆ

---

١) لە کتێبی (صلاح الدین الایوبی/ ولید نویهض) (ل: ١٢٢) ئاماژە بە گرنترین هەڵمەتی خاچیەکان دەکات، ئەمانە بەشێکن لەوانە:
١- دەست پێکردنی هەڵمەتەکان لە ئەندەلوسو ڕوخانی (طلیطلة) وتولیدو لە ناوەراستی ئیسپانیادا (١٠٣١- ١٠٨٥ ز)
٢- پاپا ئەربانی دووەم دوای کۆنگرەی کلیرمونت لە ساڵی (١٠٩٥ ز)دا ناردنی پەلاماردانی بڕیاردا.
٣- هەڵمەتی دووەم لە (١١٤٦ ز)دا دەستی پێکردو لە پێکانی ئامانجی دا سەرنەکەوتو وڵاتی پورتوگالی لە (١١٤٧-١١٤٩ ز) دامەزراند.
٤- هەڵمەتی سێیەم لە (١١٨٧)دا لە گێڕانەوەی قودسدا سەرناکەوێت.
٥- هەڵمەتی چوارەم لە ڕێڕەوی خۆی لادەداتو بەرەو بێزەنتی دەڕواتو قوستەنتینییە دەگرێت.
٦- هەڵمەتی پێنجەم (دمیاط) لە (میسر) داگیر دەکات.
ئاماژە بە هەڵمەتی تریش دەکات، بەڵام ئێمە تەنیا ئەم چەند نموونانەمان لێوەرگرت. (وەرگێڕ)

ئەوانەی سواری کەشتی دەبن‌و کۆچ دەکەن ئەم کەشتی یانەش بەردەوام لە کۆمەکی دان دانەبڕاون، مەگەر یەکێ کە درەنگ بگاتە جێ.

کەواتە (سەلاحەددین) لە بەرامبەر سوپای کیشوەری (ئەوروپا) چی بکات کە تەنیا سوپای شام‌و میسری لەگەڵدا بووە لە شەڕدا، ئەگەر کۆمەکی‌و فریا گوزاری لە عێراق‌و کەنداودا بۆ هاتبایە ئەوە چەند جارێك بووە[1]. ئەم پاڵەوانە بێ وێنەیە لە نامەیەکیدا کە بۆ خەلیفەی عەبباسی نارد سکاڵای کرد بە دەسەڵاتی گیانی خۆی هەوڵ بدات کە میرانی مسوڵمان هانبدات کە بە پەلەو بێ دواکەوتن بە فریایە وە بچن، لە (بەندی) داهاتوودا[2] بەشێکی ئەم نامەیە باس دەکەین، لەم سکاڵانامەیەدا باسیکردووە کە دەریا ڕۆژانە دەیان کەشتی دەنێرێ‌و، ئەگەر خاچ هەڵگران (١٠) کەشتی لەدەست بدەن لە جەنگی ئەودا ئەوان (١٠٠) کەشتی تریان بۆ دەنێرنەوە!!

بەڵام ئەو بە سوپایەکی سنوردار شەڕەکات بێنەوەی قەرەبوی شەهیدانی بکرێتەوە.گەر هاتبایە میرنشینەکانی خاچ پەرستی پڕ لە بەکرێ گیراوی ئەم لاو ئەولا نەبوایەو لەڕوی زۆریشەوە لە دەنکە چەوەکان پتر نەبوان مانای وایە کە ئەم داوایەی باس لە زۆری سوپای ئیسلامی دەکات ئەوکاتە لە بواری لە پێشتردا بایەخی دەبووا، بۆیە باسکردنی ئەم زۆرییە شوێنی ڕەچاوکردنە، ئەگەر بشوترێ

---

١) لە کتێبی (الکرد فی دائرة المعارف الاسلامیة/ جماعة من المستشرقین/ ت: حمید ریبوار/ ل ٥٥)دا هاتووە، کە: (زۆربەی سوپاو لەشکری ئەیوبییەکان تورك بوون‌و ژمارەکی زۆریش کوردی تێدا بووە. لە ساڵی (١١٨٧ ز)دا (صلاح الدین) داوای لە کوردەکانی ناوچەی باکوری ڕوباری دیجلە کرد بۆ خەباتکردن، هێزی جەزیرە بێرو بەوێدا بڵاوبونەوە بە تایبەتی لە ساڵی (١١٨٨ ز)دا، بەڵام هێزی دیاربەکرو زۆر لە هۆزەکان زۆربەی کاتەکان شانبەشانی (صلاح الدین) جەنگی گەرمیان دەکرد، دیسان زۆربەی پلە داران‌و بەرپرسانی عەسکەری لە کورد بوون، هەروەها کاروبارەکانی بەرزیش لەو دەوڵەتە ئەیوبییەدا بەدەست کوردەوە بوون}. لەوانە وەکو ڕابڕدوو باسمانکردن (سوڵتان مظفر الدین)ی هەولێرو (ئەبو هەیجاء) ناسراو بە (میر حسام الدین)و زۆری تر سەربازی کوڕو ئامۆزاکانی‌و برایەکانی کە بەشداری جەنگی (حطین)یان کردووە، وەکولە (مشاهیر الکردو کردستان)و (اربیل بین الماضي والحاضر)دا هاتووە. (وەرگێڕ)

٢) بەناوی نیشانی: (پەژارەکانی پاڵەوانێ / شجون بطل).

هەموو سوپاكە نەچوونە پێش، پرسیارەكى دەمكوتكەر پەیدا دەكات كە دەپرسێ: جا چۆن لە جەنگى مردنو ژیاندا نەچوونە پێشەوە بۆ جەنگ؟ وە بۆ چى ئەگەر وایە لە ولاتى خۆیانەوە هاتوون؟!

بەلام هۆیەكانى دەورى كەش وهەواى جەنگەكە كە شیكارانى ئەورووپى دەكەن بە پاشاو، بەكورتى ئەمەیان بووە لەسەر میرنشینى (بیت المقدس)دا لە نێوان ئەوانەى چاویان تێبڕى بوو لە سەركارانى میرنشینەكانى صەلیبىو ئەوكەسەى بە فەرمانى (بلدوين الرابع) بە شوێن گر (الوصى)[1] دانرابو، كاتێ كە (جان لوزجنان)ى شوێن گرى ئەوسیفەتانەى تێدا نەچەسپابوو كە شایستەى بكات بۆ سەرۆكایەتى كردن، كاتێ بە چەند جەنگێكى دۆڕاو هەڵساو شكۆى سیاسى پێ لەق بوو، شاى نەخۆشیش كەبەكار تێكردنى ڕاوێژكارانى لە هەڵبژاردنى ئەوداو بە شوێن گرو ڕاسپێراو هەڵەى كرد، هەولێدا خوشكەكەى تەلاق بدات، تا پەیوەندى گەرمى بە خانەوادەى شاوەنەمێنێت.

پاشان (بەلەدوین (٤) مردو (بەلەدوین (٥) هاتە جێگاى كە شایەكى منداڵكار بوو، لەژێر ڕاسپاردەیى (ڕیمۆند ٣). شاى (تەرابلوس) ئەم دەستنیشان كردنە، دوژمنكارى لە نێوان ئەوو (وەصى) ڕابردودا پەیدا كرد كە دوو میرنشینى سەربەخودى خۆى دەست لێ كێشایەوەو، خوشكەكەى (بەلەدوین ٤) لە ڕێگاى (قودس) ەوە پەناى بردەبەر (هیقل)و داواى مافى مێردەكى لێكردەوە لەمەڕ ڕكێفى ئەو بەسەر (بیت المقدس) داو، بە پەلەتاجى شاهانەى نایەسەر خۆىو

---

١) وشەى (الوصى) یان (ولى العهد) بەماناى شوێن گردێ، لە دواى مردنى سەركردەدا. لە قورئانو فەرموودەشدا هاتووە: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَنُ دَاوُدَ﴾ (النمل- ١٦)، واتە: بە میراتگرتنى پێغەمبەرایەتىو زانست.

لە (الاحكام السلطانية)دا (الماوردى)دا (سەركردایەتى بە دوو شێوە دادەمەزرێ: یەكەم كە خەڵكى بەرپرسو ڕاوێژكارى هەڵى بژێرن، یان سەرۆكێكى بەر لە خۆى دایبنێت) جگە لەوەش هەڵبژاردنى خوایى هەیە بۆ ڕەوانەكراوانى خوایى. ﴿ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾ (الحج- ٧٥)، واتە: خوا هەڵبژاردە لە فریشتەو لە خەڵكى هەڵدەبژێرێت (وەرگێڕ)

مێردەکەی‌و وەصیەت‌و ڕاسپاردەی (ریموند)ی (٣)ی شکاندو، ئەوەی دواییان بینی کە ئەو لەگەڵ دەسەڵاتی سەرۆکی ئایینی بەر یەکتری دەکەون، بۆیە ئەوەی هەڵبژارد کە بە تورەیی یەوە بۆ (تەڕابلوس) بگەڕێتەوە، ئەمەش بووە شوێنی ڕازی بوونی ڕکابەرەکەی کە (ریموند) بوو لە ترسی ئەوەی کە دەسەڵات بەسەر (بیت المقدس)و (طرابلوس) دابگرێ لەیەك کاتدا، بۆیە بە پەلەچون بەیعەتیان بە (جان لوزجنان)ەوە کرد!

ئەمەش هەمووی مانای وایە قسەی فەرەنگەکان نەکەوتە یەك‌و ناکۆك بوون‌و، بوونە چەند گروپ‌و تاقمێك‌و، هەر پاڵەوانێکی بە ئاگا لە شوێنی (سەلاحەددین) بووایە پێویست بوو ئاگاداری ئەم ناکۆکی‌و لێك ترازانە بووایەو، پێویست بوو بۆ هێنانەدی پەیامە باشەکەی سودو کەڵکی لێ وەربگرێت! هەرچی (ارناط) بوو لەمەبێ ئاگا بوو، بۆیە چوو پەیمانی ئاگربەستی بەستراو لەگەڵ (سەلاحەددین) یدا شکانداو، هات شوێنی خۆی لە (کەرەك)[1] دەست بەسەردا گرت کە لەسەر ڕێگای کاروانی حاجیەکاندا بوو کە لە (میسر)و (شام) ەوە بۆ (حیجاز) دەچون‌و، ئەو حاجیانەی ڕوت دەکردن‌و بە توندترین‌و ڕەقترین شێوە دارکاری دەکردن وەکو پێشتر باسمانکرد. لەبەر ئەمەش هەڵەیەکی هەمان چەشنی کردو، ئەنجا کاری کرد بۆ ئاشت کردنەوەی (سەلاحەددین) بە دانهێنانی ئاشکرای بە هەڵەکەی داو، پێویست بوونی ڕیزگرتن لە ئاگربەستەکە (الهدنة) لەمەودوادا، بەڵام سەر لە نوێ بە شێوەیەکی خراپتر پەیمانەکەی شکاندەوەو، هەستا ناوی پێغەمبەریش ﷺ بەسوك ناوزەد کرد لەگەڵیدا.

---

١) کەرەك: لە (المنجد في الاعلام)دا شارێکە لە (ئەردەن)و کۆنە بە (کیر مواب) ناسراوەو کۆن قەڵایەکی قایمی (مروا بين) بووەو لە (١١٧٧) خاچ پەرست داگیری دەکەن‌و لە (١١١٨)دا (صلاح الدين) قەڵاکەی دەگرێ‌و تا ساڵی (١٩١٠) هەر لە سەرەتای چاخی مەسیحیدا بارەگای مەترانی بووە، (١٣٠٩) بنکەی مەمالیك دەبێ، لە ساڵی (١٨٤٠) ئیبراهیم پاشا داگیری دەکات و، قەڵاکەی بە سەر ڕێگای حەج‌و بازرگانیدا دەیڕوانی. (وەرگێڕ)

(سەلاحەددین) ئامادەنەبو لەگەڵ کابرایەکی هەڵشەی وەکو ئەودا، بۆ مەبەستی ئەوەی لە میرنشینی بچوکی خۆی دایبەزێنێ، جەنگێکی بە جیایی لەگەڵ ئەودا بکات. بەڵکو خەمی گەورەی ئەوە بوو کار بۆ جەنگێکی زل بکات کە هەموویان بێنە جەنگی ئەوەوەو سەرەنجامەکەشی یەکلاکراوەو بە دەنگو دۆبێت، ئەوەندەی بە پێویست زانی کە پەیامنێرێ بۆ شای (قودس) ڕەوانەبکاتو داوای لێ بکات کە بۆ ڕەوانەکردنەوەی ئەو ماڵو کەرستانەی (ئەرنات) لە حاجیەکانی سەندبوو کار بکات، ئەو دیلانەش کە لە وڵات دورکەوتنەوە بۆ غەیری مەسەلەی شەڕکردن ئازاد بکات.

(ئەرنات) وایزانی کە ئەم پاڵەوانە ئامادەنییە بۆی دابەزێتو لوتی بەرزبوو ناوەندیاری (الوساطة) شای خستە ئەولاوەو قسەی نابەجێ بۆ (سەلاحەددین) گەڕایەوە کە ئەم تاوانبارە دەرحەق بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کردبوی، ئەویش سوێندی لێ خوارد کە دەبێ بە شمشێری خۆی تۆڵەی لێ بکاتەوەو شمشێری بڵند کرد، بەڵام نەك بۆ ئەوە کە داخوازیەکەی ڕەفزکردبێ، بەڵکو بۆ ڕێزنان لە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ! ئەنجا بێ دواکەوتن سوپایەکی گەورەی ئامادەباش کرد بۆ بەرەو ڕوبونەوەیەکی یەکلا کەرەوەو، یەکەم خەمی ئەوەبو لەشکرێ ڕەوانەی (بسڕا) بکات، بۆ پارێزگاری کردن لە کاروانو قافڵەی حاجیەکان کە دێن، لەترسی ئەوەی (ئەرنات)ی دوژمنی خوا ناپاکی بکات لەگەڵیاندا، وەکو (ابن شداد) باسیکردوە بە ئاواتی خۆی گەیی،و، قافڵەکە بە چاودێری خوایی ڕۆیشت. ئەم پاڵەوانە بە باشی زانی (ئەرنات) تەمبێ بکاتو چووە (کەرەك) کە (١٢٠٠٠) سەربازی لەگەڵدا بوو، لەگەڵیدا کەوتە شەڕو درەختەکانی بڕین، ئەمەش لە (الشوبك)دا! (ئەرنات) خۆی حەشاردا‌و شاردەوەو غیرەتی نەگرت لە شوێنێکی تایبەتی دا لەگەڵ (سەلاحەددین) دەبەرێکرا بچێت.

(سەلاحەددین) بە دەسەڵات گرتن بەسەر (کەرەك)و (شوبك)دا نەوەستا، بەڵکو بە ئەنجامدانی نەخشەیێ هەڵسا، کە لەمەوبەر ئامادەی کردبو، لەوکاتەوە کە زانی

ناکۆکیو ناتەبایی لەناو سەرۆك فەرەنگەکاندا هەیە چاوەڕوانی کاتەکی دەکرد ئەنجامی بدات، هەر لەوکاتەوە کە سانێ هاتن بۆ داواکردنی پشتیوانی لە دژی ناحەزەکەیدا، تا خۆی پێ قایم بکات، ئەو هەواڵی نارد بۆ (دورگە)و (شام)و (میسر) بۆ داواکردنی لەشکرەکەی، دەستی بە هیچ نەکرد، تا ئەوانەی داوای کردبون بە تەواوی تەییار بوونو بە ڕۆیشتن بەرەو (الطبریة) دەستی پێکرد کە شارێکە بە دەر یاچەکەدا درێژ دەبێتەوە هەر بەم ناوەوە ناونراوە. ئەمەش بەشێکە لە بەرگری کە هیچ کەسێ خۆیە دەستەوە نادات، هەتا ئەم خەباتگێرە هەوڵ ئەدات، چونکە قەڵاکە کە قایمو پتەوەو، چەند شورەیەکی هەیە، کەلەناوەڕاستی دەریاچە کە (البحیرة)دا درێژدەبێتەوەو دەوری دەدات، فەرەنگەکان زانییان کە چەنگەکە لە سەرپێیەو ئەوەی ئاگربەستەکەشی شکاندووە (ئەرنات)ە نەك (سەلاحەددین)و ئێستا بەرەو ڕوبوونەوەپێویستە، شای (قودس) بەباشی زانی بە پەلە داوای جەنگ بکات، چونکە (تەبەریە) لە ژێر ڕکێفی ئەو دایەو لە (قودس)یشەوە نزیکەو لە نێوان سەعاتێكو سەعاتەکی تردا سوپای مسوڵمانان هەڵی دەکوتێتە سەر!

یەکەم کەس کە بە پیر بانگەوازەکەوە چو (ئەرنات) بوو، کەویستی ڕێزو بە های خۆی بگێڕێتەوە کە ڕابردو بەهۆی شکانی لە (کەرەك)و (شوبك) لە دەستی دابوو، (هرقل) بە ڕێگای (قودس)دا پەیامی بۆ میری (تەڕابلوس)[1] و (ئەنتاکیە)[2]

---

١) طرابلوس: شارێکە لە لوبنان.

٢) ئەنتاکیا: شارێکە لەسەر (عاصی) یەو بە مۆزەخانەو مەڵبەندە کشتوکاڵییەکەی ناوبانگی دەرکردوە (سلوقس (١) نیکاتور) لە (٣٠٧ پ ز) بنیاتی ناوە، تا داگیرکردنی ڕۆمانی (٦٤ پ ز) بۆتە پایتەختی سلجوقییەکان و، بارگەکی گرنگی شارستانی هەلەنسی بووە هونەرو ئاوابی تێدا گەشە کردوە، یەکەمجار مەسیحییەکان ناوی مەسیحییەتیان تێدا بردووەو کورسی ڕەسوڵی لێدانراو لەوانەش پەترۆسی ڕەسول تا چووە ڕۆما، فارس لە (٥٤٠) وێرانی کردووە، لە (٦٣٦) مسوڵمانان ڕزگاریان کردووە، لە (١٠٩٨) خاچ پەرست داگیریان کرد، وە لە (١٥١٧)دا کەوتۆتە دەست عوسمانیەکانو دەستیکردووە بە دواکەوتن. (المنجد في الاعلام). وە (نعیم بن حماد) فەرموودەی هێناوە تەوە کە (تابوت السکینة) لەوێدا حەشاردراوەو ئایندە دەدۆزرێتەوە.

ناردو هەڕەشەی كرد كە هەركەسێ سستی بكات لەودوانە كە لە مەترسی دان بێ بەشیان دەكات‌و خۆشی ئەم دروشمە پیرۆزەی خۆی هەڵگرتبوو (خاچی خاچەكان)، گوایە ئەمە تەختەیەكە مەسیحی لەسەر لەدار دراوە! وەستاو چاوەڕوانی سوپای كرد كە لە داهاتودا بێت، هەتا ژمارەیان خۆی لە (٥٠) هەزار كەس داو لە دورەوە لە دەوری (تەبەریە)دا خڕبوونەوە بێئەوەی لێی نزیك ببنەوە.

لێرەدا بەڵگەی ئەم كەسە هەرەس دێنێ كە وتی: لەشكری مسوڵمانان لەبەر زۆری ژمارەیان سەركەوتن، چونكە لەشكری (سەلاحەددین) لەم جەنگەدا نەدەگەیشتە ئەو ڕادەیە، بۆیە سوڵتان هەوڵی دا وكۆنگرەی ڕاوێژی بەست‌و بڕواكەی هانیدا، كە هەتا كاتی نوێژی هەینی چاوەڕێ بكات، تا هەموو نوێژكەران بە هاوارەوە نزا بكەن...... ڕەنگە ساتی وەڵامدانەوە بێت، لە شەوی (شەممە)دا نەخشەیەكی جەنگی سەركەوتوانەی كێشاو بە سوپاوە ڕوباری (ئەردەن)ی بڕی بۆ باشوری دەریاچەكەو سوپاكەی ڕەوانەی (سەفورییە)[1] كرد كە شوێنی كۆبونەوەی خاچ پەرستان بوو، زانی كە ئەوان سەرگەردانن و لەسەر ڕایەك كۆنابنەوە، ئەم سەرگەردانییەی بە هەل وەرگرت‌و، ئەنجا بۆ (تەبەرییە) كەوتە ڕێگاو، دوای جەنگێكی كورت خایەن كۆنترۆڵی كرد، بەڵام قەڵا قایمكەكانی بە شورەی سەخت یان ڕێگر بوون لە داگیركردنیداو، خێزانی (ڕیموند) لەناویدا بوو، كە یەكێ بوو لە كچە میرەكان لەگەڵ منداڵەكانی‌و دەست‌و پێوەندەكانیداو هاواری فریاكەوتنی بۆ سوپای خاچ پەرست نارد، (ڕیموند) زانی داواكردنی فریاكەوتنی لەلایەن خێزانی یەوەمانای چییە، بۆیە هانی لەشكرەكەی دا كە قەڵایەكە ڕزگاربكەن‌و دەست پێشخەری بكەن بۆ هێرش بردن‌و، هیچ چارەیێ نەبو بۆ تێك هەڵچون.

(ڕیموند) لە نیازیدا نەبو جەنگێكی یەك لاكەرەوە لەگەڵ سوپای مسوڵماناندا بكات، چونكە لە دەسەڵاتی (سەلاحەددین) تێدەگەیی لەو هەڵویستەدا، بەڵكو

---

١) سەفورییە: (المنجد في الاعلام)دا گوندێكە لە فەلەستین لە باكوری خۆرئاوای (ناسری)یەو لە (١١٩٦ ز)دا صلاح الدين لە خاچ هەڵگرانی سەندەوە. (وەرگێڕ)

خەمی ئەوەبو کاربۆ قەڵاکە بکاتو بەس! بەڵام کۆنگرەی میرەکان بە سەرۆکایەتی شای (قودس) وەڵامی پێشنیاری (ئەرنات)ی دایەوە، کە ناچارییە دەبێ هێرش بکرێتە سەر مسوڵمانانو چاودێری (سەلاحەددین) لە دورەوە جموجۆڵی سوپای خاچ پەرستیان بینی، کە بەرەو شوێنی ئەوان دێن.

ئەم پاڵەوانە لەوپەڕی خۆسازکردن دابو بۆ دابەزینو دەستیکرد بە داگیرکردنی شوێنە ئاوییەکانو کانیاوە جیاجیاکان لەو زەوییە وشكو ڕوتەدا، چونکە دەیزانی لەشکری تینو توانای خۆگرتنی نیە لەسەر شەڕکردنو ئاو لەو جەنگەدا هۆکاری بە دیهێنانی سەرکەوتن دەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا مانگی (تەمموزە)و گەرما لە قرچەدایەو لە ساڵانی ڕابردوشدا گەرمایی پترە، ئەنجا گەردەلولو ڕەشە بای گڕ گەرم هەڵدەکات، ئەو هۆکارانە (سەلاحەددین) گرنگی پێدان، بەڵام فەرەنگەکان لە ڕیزی پێشەوەی ڕەچاوکردنەکانیان دانە ناو، کەوا چاك بوو شوێنی خۆیان بەجێ نەهێڵنو ماندوبوونی ئەم ڕێگایە نەگرنەبەر کە ڕەشەبای گڕاوی گەرمی لێوە هەڵدەکاتو تا (سەلاحەددین) بێزار بکەن کە ئەو پەلامارە دەست پێدەکاتو ئەو ڕێگایە ئاستەنگە بگرێتە بەرو پیاوانی ئەو ماندوبن بەرلەوەی هەر دوو سوپاکان پێك بپرپێنو، ئەوکاتە ئەوپەڕی توانای هێرش بردنی نەدەما، بەڵکو ئەوان ئەوەیان هەڵبژارد وەکو (ئەرنات) ئاماژەی پێکرد ئەم بیابانە ببڕن، تا جەنگەکە لە نزیکترین کاتدا کۆتایی پێ بێنن.

(سەلاحەددین) بینی کە لەتیراسای سوپای هێرشبەردا ئاگر هەڵبکاتو، ئەم ڕەشەبایە ئەم گەرمی یەیان بۆ بگوازێتەوەو، ئەمەش زیاتر یان تینو دەکاتو هیچ سەرچاوەی کانی یەکیشیان دەست ناکەوێ کە تێری لێ بخۆنەوە، چونکە سوپای مسوڵمانان ئەم بیرانەیان لەبەردەمی ئەواندا وێران کردووە. (د. احمد بیلی) لەمبارەوە دەڵێت: فەرەنگەکان هەوڵیاندا کە لە پەلامارەکەیاندا ئەم پلانە یە پیادە بکەن کە بە دەستی خۆیان دایان ڕشتبوو، ڕێگا لە سوڵتانو لەشکرەکەی بگرنو دەست بەسەر کارێزو سەرچاوەکاندا بگرن، کاریان ئەوە بوو هەرکە هەنگاوەکیان هەڵدەهێنا دەکەوتنە ژێر ئاگری دوژمنیانەوە، نەیانتوانی بەردەوامو سەقام گیربن،

هەندێ لە تیپەکانیان گەمارۆ دەدرانو بەرەو گرتوخانەکان دەبران سەرباری ئەوەی کە فەرەنگەکان زۆریان پێویستی بە ئاو هەبوو لە مەیدانی جەنگداو، بۆ دەست بەسەر داگرتنی هەولّی خۆیاندا، بەلاّم کەوتنە ناو خراپترین زیانی کردەوەکانی خۆیانەوە، گەرمی خۆریش لەم ڕۆژە گەرمو بەتینەدا زیاتر تەنگاوی کردن، نە هیچ دارو درەختێ هەبوو بچنە ژێر سێبەریەوە، نە ئاوێ هەبوو تینوەتی خۆی پێ بشکێننو، ئەم کارەساتە گەورانە لە مەترسی سوپای مسولّمانان لەسەریان توندتر بوو، بۆیە ناچاربوون پاشەکەشە بکەن، تا پلانەکی تردا بڕێژن. بەلّێ تیپێ لە لەشکرەکە هەر زوو پاشەکشەی کردو مسولّمانان بە پلانێ لێی حالّی بوونو بەباشیان نەزانی، کە شوێنیان بکەون، بەلّکو بەچاکیان زانی لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە، تا هەلّوێستەکە ئاشکرا دەبێ، لێرەدا (سەلاحەددین) فەرمانی دا سوپاکە لە چادرو تاولّەکانیاندا تا بەرەبەیان پشو بدەن، دوای ئەوەی سوپاکەی لەسەر پێیانو قاچیان لە پاسەوانیدا بوون، هەموو ئەو شتانە هیوای سەرکەوتنیان پێ دەبەخشی، کاتێ مسولّمانان شەوەکە حەسانەوە سولّتان فەرمانی هێرشکردنیدا بۆ سەر فەرەنگەکان لە قرچەی گەرمی نیوەڕۆداو، پاش ماوەکانیان کە ماندو هیلاكو تینوبویون بە گردو تەپۆلکەکانی (حیتتین)دا پاشەکشەیان کردو، ڕاستو چەپ کوژراویان لێهەلّدەوەرا، هەریەکە خەمی رزگاربوونی خۆی هەبوو نەك بەرگریکردنو بەرەنگار بوونەوە.

ئەوانەی پشتەوە دەیانزانی کارەساتێکە، کە دەیانگرێتەوە بۆیە ڕایان کردو، ئەنجا پاشماوەی تری خاچ پەرستان بۆ دوای گردو تەپۆلکەکانی (حیتتین) ڕایانکرد کە دەیانویست لە شوێنێکی بێترسدا پێی خۆیان بچەقێننو، نەیانتوانی بەرگری گەرمەساتی زۆرانبازی بگرنو بەهەموو تاقەتو توانای خۆیان چادرێکیان بۆ (شا) هەلّدابوو،کە لەناویدا جەنگێکی دور لە بلّێسەی خۆر هەلّدەسوڕاو ژمارەکی چڕو زۆری سوپا دەوری دابو، وەك بلّێی وایان دانابوو پاراستنی ئەم چادرە تاقانە چارەسەرە، کە لە تواناد بێت.

مسولّمانان دەیانزانی کە کەواندنی چادرەکەو پەرتەوازە کردنی پاسەوانانی دەورەکەی جەنگەکە یەکلا دەکاتەوە، بۆیە ئازاو دلێرانە هەڵیانکوتایە سەرو سەخترین جەنگی لێ کەوتەوەو، خاچ پەرستان توانیان دوجار مسولّمانان پەرچ بدەنەوەو، جاری سێیەمین دەوری چادریان چوڵ کردو شا کەسی بەدەورەوە نەماو ئاوارەو سەرگەردان بوو، وەك بڵێی خۆ بەدەستەوەدانی خۆی بە بێهودەیی‌یەوە لە بەردەوامی ئەم جەنگەدا بە نائومێدییەوە ڕابگەیەنێت.

لێرەوە سەرکردەکانی پێشڕەو پەلاماری شوێنی پاشایانداو هەرچی کەوتە ژێر دەستیان لە پلەدارانو شکۆداران بە دیلیان گرتن کە (شا) و(ئەرنات)و برای شاشیان لەگەڵدا بو!.

لە چادرەکەی ڕماوی خاچ پەرستاندا مسولّمانان چادرەکی گەورەیان بۆ (سەلاحەددین) هەڵداو، لەناویدا بە نوێژی سوپاس گوزاری بۆ خوا کردو میرو زانایانی دەستو پەیوەندیشی بە دوایداو، لە قنوتو ملکەچی شوکربژێریدا دەستیان هەڵبڕیبو، کاتێ خودا ئەم سەرکەوتنەی پێ بەخشین(سەلاحەددین) دیلەکانی بە کۆتو زنجیرەوە نمایش کرد، کەلەوپەڕی ماندوێتیو شەکەتێ دا بوون بەهۆی گەرمی تینوەتیو تالّی تێ شکان. یەك سەربازی مسولّمان (چل) کەسی کەلە پچەکراوی بەدەستەوە بوو کە بەیەك پەتك بەسترابوونەوەو بەرەو ئەو ئاپۆڕەیە کۆکراوەیەی لە چادری سولّتاندا بوون لێیان دەخوڕین.

لەوپەڕی سەرشۆڕیو داماویدا شای قودس (جای لوزنان)و (جیار دی ریدفورت) لەپێشەوە لێدەخوڕان، هەم (ئەرنات) خاوەنی قەلاّتی (کەڕەك) بەرەو کۆڕو دانیشتنی (سەلاحەددین) لە چادرەکەیدا بردیان، سولّتان هەڵسا (شا)ی لە تەنیشت خۆیدا ڕۆناو (ئەرنات)و (جیرار) لە تەنیشتی ئەودا دانیشتن، سولّتان بینی پادشا خەریکە لە تینوان دەخنکێ[1]، قاپە بەفراوەکی دایە دەست تا تێر بوو خواردیەوەو، پاش ماوەکەی دایە دەست (ئەرنات)، سولّتان (سەلاحەددین) هاواری

١) ئەوزەنگ= گیانلا (وەرگێڕ)

كرد: ئەم نەفرین لێكراوە بە ڕوخسەتی من ئاوی نەخواردەوە هەتا دڵنیا دەبیٚو پێویستە هەر ئێستا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بكرێ، (سەلاحەددین) تاوانباری دەكات بە شكاندنی پەیمانو ڕشتنی خوێنی حەججانی بێچەكدا، بە ناشیرینی‌یەوە وتی: ئەمە نەریتی شایەكانە، (سەلاحەددین)یش شمشێرەكی لێدا دوكەرتی كرد، (جای لوزجنان) تۆقیو وایزانی ئەو جارە نۆرەی ئەو دێت!! بەڵام (سەلاحەددین) پێكەنیو دڵنیای كردو پێی وت: قەت خوی شایان نەبووە شایان بكوژن! بەڵام ئەم سنوری خۆی بەزاندبو كە جنێوی بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دابوو، وتبوی: كە ئەو ئایندەیەكی نزیك جەستەكەی دەسوتێنیٚ، منیش ئەوەم نەزركردبۆ خوداو، ئێستاش هێنامەدی.

بێگومان جەنگەكە بە بەزینو سەرشۆڕی خاچ یەكان تەواو بوو، بۆ ئەو هەموو سەرشۆڕییە لەم وشەی مێژوونوس (ئەبو شامە)م ڕەوانتر دەستناكەوێ كە ئاكامی جەنگەكەی ڕاڤەكردووەو، بەسەر سوڕمانەوە وتویەتی: (كێ كوژراوانی (حیتتین)ی بەرچاوكەوتبایە دەیوت یەك نەفەر دیل نەبووەو، كێش ژمارەی دیلەكانی بینیبایە دەیوت یەك كەس نەكوژراوە، لەبەر بوونی زۆرییان لە هەردولادا).

شتێكی تریش كە مێژونوسی فەرەنگی خۆشیان تێبینی یان كردووە ئەوەیە كە سەركەوتن (سەلاحەددین)ی بێئاگاو مەست نەكرد،كە لە ئەركی پیاوەتیو مەردایەتی دوربخاتەوە، بەڵكو بە ملكەچیو هێمنی یەوە وەڵامی دایەوە كە ببێ بە نموونە لەناو هاوشەكانیدا. ڕوی لە قەڵای (تەبەرییە) كرد كە شاژن (شیگا)ی خێزانی (ریموند)ی لەناودا بوو، لەوپەڕی بێزاری دابوو، دوای ئەوەی زانی چی بەسەر فەرەنگدا هاتووە لە گردەكانی (حیتتین)دا بەتەواوی هیوای بەردابوو دەستی بە خۆدا بەردابۆوە، بەگریانو لالانەوە چووەپێش (سەلاحەددین) ئامانی لێ خۆاستو ئەویش دڵنیای كرد، ئەویش هێوربۆوە، ئەنجا فەرمانی پێدا كە بڕواتەوە لای مێردەكەیو منداڵەكانیو خزمانی كێ هەڵدەبژێرێ لە پیاوانو، كاری بۆ ئەوە كرد كە كەس لە ڕێگادا نەڕواتە سەر ڕێگایو ئەو لە ژێر پاسی ئەودایەو هیچ زێرو

چەکەکی کە پێیان بوولێی نەگێڕانەوە[١].

(سەلاحەددین) نەیویست جارێ هێرشی (بەیتولمەقدس) دەست پێ بکـات، ئـەو دەیتوانی لەوترس‌و تۆقینەدا کە خاچ یەکانی گرتبـۆوە پـەلاماری شـارەکە بـدات، بەڵام ئەوەی بە باشتر دانا کە دەست بەسـەر ئازوقـەی دەریـایی دابگـرێ، چـونکە ڕێگرتن لەمە ئاستەنگ لە بەرامبەر ئەو پەلەمارانەدا دروست دەکات کە لـە خـۆر ئاوا دێن، بۆیە ڕوی کردە (عەکا)و، (جوسلین) فەرمانداری ئەوێ کلیلەکانی بۆ نارد بەومەرجەی خەڵکەکە بێ ترس بن، ئەنجا لە مانەوەو بارکردن سەرپشکیان بکـات، ئەویش بە قسەی ئەوی کرد، (سـەلاحەددین)[٢] مەبەسـتی لەمـەدا ئـازاد کردنـی دیلەکانی مسوڵمانان بوو لە (عەکا) کە پتر لە (٤٠٠٠) دیلی تێدابوو.

بەهۆی ئەوەی کە زانرابوو گیانی لێبوردنی هەیە، وڵاتـانی دەوروبـەری ئـەوێش ئەوەیان بەچاك زانـی، کـە خۆبەدەسـتەوە بـدەن، ئـەوەبوو دەسـتی گـرت بەسـەر (الناصرة)و (قيسارية)و (حيفا)و (صفورية)و، (فولـة)و (شـقين)و (طـور)و قـەڵای تردا، ئەنجا دەستی بەسەر (جبيل)دا گرت. ڕەنگە ڕەخنەی یەکەم لـەم مامەڵەیـەی سوڵتان ئەوە بێ، کە لە کاتێکدا ئەوانەی بە تەواوی بێ قەیدو بەنـد ئـازاد کـردن،

---

١) زۆرمان بیستووە کە زۆر لە قیادەو سەرکردەکان لە کاتی ئەم مانەوەدا و، لە کاتی میوانداری‌و دانوسـاندا لەگەڵ ناحەزانیاندا بە دزییەوە لەناوبراون‌و ئەم ئەمانەتیان شـکاندووە، بـەڵام (صـلاح الـدين) مـەرد بـوو خـاوەنی قـسەی خـۆی بـوو، ناپـاك نـەبوو. خـودا دەفـەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ﴾(التوبة- ٦). واتە: ئەگەر یەکێ لە هاوبەشی پەیداکەران داوای پـەنای کـرد پـەنای بـدە. ئەمەیـە ڕەوشتی پێغەمبەرو ﷺ پیاوانی ئەو!

(دیل) لە ئیسلامدا مامەڵەی مرۆڤانەی لەگەڵدا دەکرێ و، ئازار نادرێ‌و ناکوژرێ: ﴿فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً﴾ (محمد-٤). دیل بە بارمتەیان بەمنـەت بەسـەردا کـردن ئـازاد دەکـرێ. ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾ (الانسان- ٨)، واتە: (خواردن دەبەخشن لەسەر خۆشەویستی ئەو (خـودا) بە هەژارو هەتیو دیل) لێرەدا خودا ستایشی عەلی‌و فاتیمیە دەکات (ڕەزای خوایان لێ بێت).

٢) بێگومان ئەمە ڕەخنە نیە بۆ (صلاح الـدين) چـونکە ئـەو پیـاوەتی‌و ئـەرکی ئـایینی‌و مرۆڤانـەی خـۆی بەجێهێناوە، ئەوانەش کە پەیمان دەشکێنن ئەوە لە زانیاری کەسیدا نیە خودا خۆی ئاگادارە. (وەرگێڕ)

بووە هۆى ڕاكردنيان بۆ شارى (صور)، تا لەوێ هەموو كۆببنەوەو ببنە شوێنێكى مەترسيدار. ئەمەش جەنگێكى ترى هێنايە كايەوە كە ڕەنگ بوو نەيهێشتبايە! ئەوانە هەمان كەسانى ڕابردوو بوون![1]

١)(الناصرة) لە شورى جەليلى فەلەستينەوە شارى مەريەمە. (قيسارية) لە نێوان (حيفا)و (يافا)دايە، (صفورية) دەكەوێتە باكورى خۆرئاواى (الناصرە)و گوندێكە لە ئەوێدا (شەقيف) قەلآيەكەو (طور) چيايەكە لە (سينا)و چياى موسايە كە لە قورئانى مەزندا هاتووەو، سورەتێ بەم ناوە ناونراوە. لە (المنجد فى الاعلام/ بەكورتكردنەوەو وەرگێراوە) وەلە مێژوى كوردو كوردستان/شكرالله بابان/ ل ١٢٤)دا هاتووە/ چاپى٢٠٠٤ (لەساڵى ٥٨٣ ز)دا جارێكى تر لە نێوان ئەهلى سەليبو سولّتان (صلاح الدين) جەنگ قەوما كە پاش ماوەيەكى درێژ سەليبەكان تێشكان بە شوێنيا شارەكانى نابلوسو حەيفاو ناسرەو عەسقەلانو قيساريەو چەند دێى تر كەوتە دەست لەشكرى (سەلاحەددين)ەوە. (وەرگێر).

# میری کەشتیگەل (الاسطول)

## (١)

کاتێك شای قودس هەواڵی (ئەرناتی) شای (کەرەك)ی پێگەیشت کە زۆر شوێنی دەوری میرنشینی ئەوی داگیرکردووەو خاچ هەڵگرانی ناوی ئاوارە کردونو خەڵکی نەیاری کوشتووەو خانووەکانی خاپوورو وێران کردون، تا لە تەختەکانو دارەکانیان کەشتیگەل دروست بکات،تا لە (ئەیلە)و (عیزاب)دا هێرش بکاتە سەر مسوڵمانان! بەداچلە کیوی‌و جاڕسی لەسەر تەخت دانیشت، کاتێ پەنا بەرانی شاربەدەری بینی جادەو کۆڵانی (قودس) یان پڕ کردووەو بە شوێن جێگادا دەگەڕێن‌و ماڵو سامانیان بە تاڵان براوەو کەل‌وپەلی خانوبەرەیان نەماوە وەك بوومەلەرزەیێ لە خانوبەرەی دابن‌و ئەوان لەدەرەوەی ماڵ بووبن‌و، ڕوت‌و ڕەجاڵ هاتونەدەر، هەناسەی پڕ لەکینەو ڕقی هەڵکێشا!.

پاشا بە گەورەی ڕاوێژکارانی خۆی وت: من لەوە حاڵی دەبم کە (ئەرنات) بیەوێ بچێ خانوبەرەی مسوڵمانان بڕۆخێنێ‌و خەڵکەکەی بە دیلی ببات‌و خواردن‌و پۆشاك‌و کەل‌وپەلەکان ببات، بەڵام لەوەتێ ناگەم چۆن بابایەکی خاچ هەڵگر کە خۆی بانگێشەی ئەوە بکات کە هاتووە بۆ پاراستنی هاو ئاینەکانی‌و دابینکردنی ئاسایشیان لە گاورەکان دەستی دەڕوات، توشی ئەم کارەساتەیان بکات‌و لە ماڵو حاڵی خۆیان دەربەدەر بکات ڕابکەن بۆ (قودس)و (ئەنتاکیە)و (حیتتین) وەکو

ئاژەڵی ئاوارەیان لـێ بێت، پاشان دەڵێ: من سەرکردەی خاچپەرستەکانم! ئایا ئەمە شێتی نیە؟ ڕاوێژکاری مەزن وتی: کەی (ئەرنات) لە بانگەوازیەکەیدا دڵسۆز بووە؟ ئەو جەربەزەیە لە میرنشینی یەك دەپرسێ، کـە ئـەو سـەرۆکایەتی بکـاتو، ئـەو پێویستی بە ماڵ هەیە، بۆیە سوپای خۆی بۆ دورگەی (قوبرس) ڕەوانەکردووەو هەر کەسـێکی مەسـیحی لـە هاوئـاینی خـۆی ویـستبێ بەرهەڵـستی ئـەو بکـات کوشتویەتیو منداڵو ژنی بە دیل گرتون، تا بارمتەی زۆری دەست بکەوێو زۆر لە ڕەهبانەکانیشی کوشتووە! ئەنجا بـە تالاّنـەوە بـۆ (کـەرەك) گەڕایـەوە، تـا لەگـەڵ دوژمنانی (مەسـیح)دا بجـەنگێت! هـەر لـەم ڕۆژەوە خـاچ هـەڵگران ڕقیـان لێـی دەبێتەوە، بە چەتەو ڕێگر لە قەڵەمی دەدەن!

ڕاوێژکار وتی: گەورەم ئەمە چاوەڕوانکراوەو خەریکە گومانی تێدانەکەم، بـەڵام ئاگربەستی نێوان ئێمەو (سەلاحەددین) بەردەوامەو ئەو دەزانێ تـۆ بـە ئاشـکرایی دەستدرێژیی ناکەیە سەرو دڵنیاش نیە کە (ئـەرنات) دەسـتی تـۆی تێـدا هـەبێو ئایندەش دەکەوێتە ناو بەڵای خۆیەوە کە ناژمێردرێتو بـەڵا، چـەرخانی بـەدەوردا دەدا بێ بیرکردنەوەلە ئاکامەکان! چەند ڕۆژێ لەمەو پێش لەگەڵ کەسـێ دانیـشتم لەو پەناهێندانە کە هاتبوونە (قودس)و نیشانەی زیرەکیو دانایيم پێوە بینیو لای (ئەرنات) پلە داربونو پاشان کە بینیبوی ماڵی مەسیحیان تێك دەدات وەك ئەوەی دوژمن بن رایکردبوو، پێم وت: مەبەستی (ئەرنات) لەم کەشـتیگەلە دەریـایی یـە چییە، کە لەدارو تەختەی خانوەکـانو کەلوپـەلی (ئەیلـە) دەکـاتو لـە لوتکـەی (محمد) (راس محمد)ەوە دەڕوات بـە باشـوری (سـینا)دا تـا لەگـەڵ گـەمارۆدراوانی دورگەکە دا بجەنگێتو ئەوانە لە هەڵوێستەکی تەنگـە تـاو دان، چـونکە ئـامرازی جەنگیان نیە کە بەرپەرچی دەستدرێژیەکان بدەنەوە، وایان بە خەیاڵدا هـاتووە کـە دەریا بەربەستەکی قایمە لە پـەلامارەکانی ئـەوانیان چـەپاڵە دەداتو، لـە شـوێنی ئارامیان دڵنیا بوون! من تۆزقاڵێ بەزەیی لە دڵـی (ئـەرناط)دا نـابینمو، خـەڵکی دورگەکە (الجزیرة) لەبن دەردێنێت، ئەگەر دەسکەوتو تـالاّنی زۆریـش خڕکاتـەوە،

هەرماوەیەکە، هەواڵ بە (سەلاحەددین) دەگات! هەر کە زانییەوە ئەم ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوە ڕوویداوە، بێ چاوەڕوان کردن لەبەردەمی خۆماندا دەیبینین.

پادشای وتی: ئێمە لەسەر دەرگای جەنگێکی گەرمین! برادەرانمان لە (ئەنتاکیە)و (حیتتین)و (عەسقەلان)دا.

سەر شۆڕمان دەکەن، (ئەرناط) ڕادەکاتو خۆی ون دەکات کە بە شوێنیشی نەزانین، ئێمەش بەتەنیا لە گۆڕەپانی کێشەدا دەمێنینەوە! ئێستا زەنگ لێی داوەو، پێویستە خۆمانی بۆ ئامادە بکەین، سەرکردەکانمان بۆ کۆبکەوە تا کار لە هەموو بوارەکاندا تاوتوێ بکەین.

# (٢)

(سەلاحەددین) لە یەکێ لە جەنگەکانیدا لە (موصڵ)دا، هەواڵی بۆ هات کە لە دورگەی (ئەیلە)دا کەشتیگەلی جەنگی هێرش دەکەنەسەر مسوڵمانان، پاشان هەندێ کەشتییەکانیان بەرەو (دەریای سور) دەڕۆن ڕێگە لە حاجیەکان دەگرنو، سەدان کەسیان کوشتووەو، دەستیان بەسەر کەشتی بازرگانیدا گرتووە کە تفاقو پێویستی لە خواردنو کاڵا تێدابووەو! سەدان کەس لە قوڵایی دەریاکەدا خنکاون کە بەرگرییان لەخۆ کردووەو بێ چەك بوون! بابای سەرەڕۆ ڕایماڵیون! هەواڵی ئەم کارەساتە بە (سەلاحەددین) گەیشتو، ئەویش لە سەقامگیری چەسپاوی خۆی دەسبەردار نەبوو، بەڵکو دەستبەجێ نامەی بۆ شا (عادل)ی برای ڕەوانەکرد لە (میسر)دا، تا وەکو کەشتیگەلی دەریایی ئامادە بکات کە پاڵەوانی شارەزا (حسام الدین لؤلؤ) بەڕێوەی ببات، کەمتەرخەمی نەکات لە خەرجی ئامادەکردنی ئەم کەشتیگەلە (الاسطول)ەدا چەندی تێبچێت، بەڵکو دیوانەکی تایبەت دروست بکرێ بەناوی دیوانی دەریایی! پێویستەکانو تەواوکاریەکان لەگەڵیدا ئامادە بکات. وە بە زویی (سەلاحەددین) بۆ (میسر) دەگەڕێتەوە، تا ببینێ ئایا کەشتییەکان ئامادەکراون بۆ پەلامارەکی بە پەلە!

هێشتا پاڵەوانی ئەیبوبی لە بارەگای خۆیدا ئۆقرەی نەگرتبوو کە هەواڵ هات کە (ئەرنات) حاجیەکانی کوشتووەو کاروانەکانی داگیر کردووە! زمان درێژی کردووە بەرارمبەر بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ و بە زمانی پیسی وتویەتی جەستەی پێغەمبەر دەسوتێنمو، کەسیش نیە لەمەم یاساغ بکات!! بۆ ئەو مەبەستە نیازیەتی مەدینە داگیر بکات.

لێرەدا ئاگر لە چاوەکانی (سەلاحەددین) دەرپاری، لەناو لەشکرێ لە سوپاکەی شمشێری بەرەو ئاسمان بەرزکردۆتەوەو، سوێندی خوارد هەر کە (ئەرنات)ی بەردەست کەوێ بەدەستی خۆی بیکوژێت، بۆ تۆڵەسەندن لەم کارە دزێوو ناشیرنەی!
لەسوێندی خۆشی پاشگەزنابێتەوەو هەر لە ئێستاوە بۆ ئەنجامدانی هەوڵدەدات، بەناو خەڵکەکەیداو هاواری کرد، دوای ئەوەی ئەوەمان بەرگوێ کەوت دانیشتنمان لە (موصل)دا بۆ نییە.

پەیامی (سەلاحەددین) بە پەلە بەشا (عادل) گەیشتو بۆ ئامادەکردنی (الحاجب حسام الدین) دەست پێشخەری کرد، تا پیرۆزبایی لێ بکات کە کراوەبە سەرۆکی کەشتیگەلی جەنگیو هەواڵی پێدا کە ئەو جێگای متمانەی (سەلاحەددین)ە لە ئازایەتی دلێرانەیدا، (حسام الدین) پاڵەوانی بە هەلوێست بوو گیانی خوێن گەرمیو سوربوون دایگرتبوو، سوێندی لای ئەو خوارد کە ئارام ناگرێ هەتا پێش هەنگی کەشتیگەلی ئیسلامی بەرەو جەنگێکی سەرکەوتوو نەکات لەم نزیکانەدا.

ونبوونی (حسام الدین) لە شوێنی خۆی درێژەی کێشا، زۆربەی کاتی خۆی بە چاودێری کردنی ئامادەکردنی کەشتی جەنگی یەوە بەسەر دەبرد، دایکی زۆر بۆی نیگەرانو شپرزەبوو هەواڵی بۆ نارد لەوەتی لە ماڵ چۆتە دەرو ئەم ماوە زۆرەی بەسەر چووە ئۆقرەیان لێ هەلگیراوەو ترسناکی گرنگی پێدانی جەنگی یەکەی چەندێك بێ ڕێگای ئەوەی لێ ناگرێ هەرنەبێ مانگی ڕۆژێ بگەڕێتەوە ناو ماڵو حاڵی خۆیو بەدیتنی ماڵو منداڵی کامەران دەبێو ئەوانیش هەربەو کامەران دەبن.

(حسام الدین) لە دڵەوە وەلامی دایکی ناداتەوەو، بەلام سەردانی ئەو دەکاتو بە زەردەخەنەوە گوێ بۆ سەرزەنشتەی دایکیو، هەم بۆ سەرکۆنەی ژنەکەی دەگرێت، بە باشی زانی کە لە هەندێ کاری گرنگی خۆیدا هەردوکیان بەشدار بکات، بە نەرمیو هێوری پێ وتن: لە (عیذاب)دا حاجیەکانی کەعبە توشی کوشتن بوونو چەند تیپەکی خاچیەکان پەلاماری حاجی بێ چەكو شەڕیان داوە، کە

ویستویانە بۆ ماڵی خودا بچن، پیاوەکانیان کوشتونو ژنەکانشیان بەدیل گرتونو کردونیان بە کەنیزەو ماڵو سامانیان بەتالان بردوونو ڕێگای حەج گیراوە، نەوەك ئەم هێرشە دووبارە بێتەوە، (ئەرناط)ی دژی خودا لە (کەرەك)ەوە کەشتی شەڕ ڕەوانە دەکات بە تفاقەوە بۆ کوشتنی حاجیەبراکانمانو منیش بڕیارم داوە کە پەرچدانەوەی ئەم خۆ بەزلزانو ملهوڕە بدەمەوە ئەگەر گیانی خۆشم پێشکەش بە خودا بکەم.

(حسام الدین) واقی وڕما لە دایکی کاتێ بینی بەگریانو هاوار هەڵسایە سەرپێو وتی: سوپاسو ستایش بۆ خودا، مژدەی یەکەم جار هاتە دیو مژدەی دووەمیش بەویستی خودا هەر دێتەدی، خۆشحاڵی من بە تۆ ئەی کوڕەکەم بێ سنورە، ئەگەر خودا تەمەنم درێژبکات کە بەهەردوو چاوی خۆم هەردوو مژدەکان ببینم ناتوانم بە تەواوی سوپاسگوزاری ببم.

(حسام) وتی: ئەی دایکە لە قسەکەت حاڵی نابم، ئەوە بۆ چی نهێنی ناودڵت لەمن دەشاریەوە کە هانم دەدات بۆ هەوڵدان لە پێناوی خوادا؟ توخوا دایەگیان ئەودو مژدەیەم پێ ڕاگەیەنە!!

دایکی وتی: ئەی (حسام) کاتێ لە دایك بوویت (٣) ڕۆژان نوزەت نەدەهات، منیش گەلاّ خەمم پێوە هەڵگرتو شەوانەم بەگریانو شین بەڕێ دەکردو لە خودا دەپاڕامەوەو دەستم بەرەو ئاسمان بەرزدەکردەوەو لە خودا دەپاڕامەوە کە بەقسەت بخاتو دوای نوێژ لە ڕکوعو کوڕنوشدا دەپاڕامەوەو دوعاو نزام تێدا درێژ دەکردنەوە، پاشان شەوێ لە شەوان نوێژی بەیانیم کردو سوکە خەوێ بەسەرچاومدا هاتو من بیرم لە تۆو نەخۆشی تۆ دەکردەوە لە خەومدا پیرەمێردەکی بەشانو شەوکەتم بینی دەمو چاوێکی نورانی هەبوون، تۆی هەڵگرتبوو لەسەر دەستی داینابویو ماچی کردیتو، پاشان ڕوی لەمن کردو وتی: مژدەبێ ئەی بەندەی خودا ئەم کوڕەی تۆ ئاینده ماڵی خودا دەپارێزیو خەڵکی لە (عەرەفات)دا لە (ئاپۆڕەی

گەورە)دا بەناوی ئەو هاوار دەکەن[1]. منیش گورج ڕاپەڕیمو هاوارم کردەتۆو زمانت کەم کەمە کەوتە قسەکردنو لە دڵی خۆمدا وتم: ڕەنگە هەردوو مژدەکان وەك دوخێ بێنە دیو بەهاتنەدییان بەختەوەر دەبم، کاتێ بۆ تێکۆشان چوویە دەر لەگەڵ (سەلاحەددین)دا لە ئاراستەی تۆم دەپرسیو دەمزانی کە تۆ لە(دیمەشق)و (مەقدیس) و(حەلەب)و (موصل) دا تێدەکوشی، لە دڵی خۆم دا دەمپرسی دەبێ کەنگێ لە (مەککە)دا تێبکۆشێ، تا مژدەی یەکەم بێتەدی؟ ئەوەی من حەزم دەکرد بەرچاوم نەدەکەوت! تۆش ئیمڕۆ دەڵێی: حەجحاجەکان ڕێگایان لێ گیراوەو تۆش ئامادەی بۆ هەڵبەستنی کەشتییەکان، تادەستی دەستدرێژکاران بگرێتلئەی (حسام)! گەر ئەمە هاتەدیو، بەرگریت لە حاجیەکان کردو، ڕێگا بە هەوڵی تۆ ئاسایشی بۆ گەڕایەوە ئەمە یەکێ لە مژدەکان دەبێت!

ڕوی حسام لە خۆشیان گەش بووبو لەوپەڕی خۆشحاڵیدا، کە لە چالاکی ئەودا دەردەکەوت وتی: وەڵڵاهی دایکە ئەمە خۆشترین مژدەیە کە من لە تۆی ببیستمو دڵنیام کە خودای شکۆدار یارمەتیم دەدات بۆ سەردوژمنم، ئەگەر ئەمە هاتەدیو ڕێگای ماڵی خوا ئاسایی بۆوە ئەوە بەختیاری من تەواوبووەو شانسو بەشی خۆم لە ژین وەرگرتووە!

قەت هەوڵ بۆ ئاواتی دنیایی نادەم، جگە لە بەختەوەرکردنی میوانانی ماڵی خودا نەبێت.

---

١) خوای گەورە دەربارەی خەونیخوایيو مژدەی خوابی دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ﴾ (القصص-٧)، واتە: ڕامانگەیان بە دایکی موسا. یان ﴿وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ﴾ (ال عمران-٤٢)، واتە: کاتێ فریشتەکان وتیان: ئەی مەریەم خودا هەڵی بژاردویت. وە لە فەرمودەی ڕاستدا هاتووە: {الرؤيا من الله والحلم من الشيطان} متفق عليه. الؤلؤ والمرجان/ محمد فواد باقي/ كتاب الرؤيا/ ١٤٥٦. واتە خەونی ڕاست لە خواوەیە و، خەونی ناخۆش لە شەیتانەوەیە. {الرؤيا المؤمن جزء من ستة واربعين جزءا من النبوة} متفق عليه / هەمان سەرچاوە / ١٤٥٨. واتە: خەونی ڕەوانی بڕوادار ١ لەسەر ٤٦ بەشی پێغەمبەرایەتییە. (وەرگێڕ)

ژنەکەی وتی: ئەی (حەسسام) لەوڕۆ بەدواوە ئەگەر تۆ دواش بکەوی توڕەنابم و دایکیشت بۆت دەپاڕێتەوەو تۆش دوای هەر نوێژێ (ئامین) بۆ نزاکانی بکە! لە دەریادا بەچەکەوە بجەنگەو، ئێمەش لە ماڵەوەدا بە پاڕانەوە دەجەنگین.

پاڵەوان بە هێمنی یەکی ئارامەوە وتی: لەسەر بەرەکەتی خودا.

## (٣)

هەواڵی نهێنی لەمەڕ دوژمنی داگیرکەردا یەکێ بوو لەو هۆکارانەی کە (حسام الدین) پلانو نەخشەی جەنگی خۆی بۆ هێرش بردن لەسەر بنیات نابو، زانی کە (سەلاحەددین) ئەوەی بەباش دەزانێ، کە کەشتیگەلەکە لەیەك شوێندا کۆبکاتەوە نەك بیانکات بە دوبەرەی دور لەیەکتربیەوە، کە دوژمن بتوانێ بەوپەڕتەوازەیی یە هێرشی بۆ ئاسان ببێت.

هەواڵی پێگەیی، کە ئەو نەخشەیەی (سەلاحەددین) نکۆڵی لێکردبوو ئێستا (ئەرنات) پێوەی هەڵساوە کە کەشتیگەلەکەی کردووە بە دوکەرتەوەو، کەرتێ دورگەی (ئەیلە)ی گەمارۆ بدات، کە هەموو تفاقەکی لێ قەدەغە بکات، ئەنجا لە ئاوی لێ مەنع بکات، کە بێ ئەو ژیان نابێت، تا دانیشتوانی ناچاربن خۆ بەدەستەوە بدەن، بە کەرتەکی تر کەشتیگەلی (دەریای سور)ی تۆق بدات، کە لە (عیذاب)ەوە دێنو حاجی یان هەڵدەگرن بەرەو (مەککە)، ئەوانە بە دەست (ئەرنات)ەوە توشی بەڵایەك بوون کە توکی سەر سپی دەکات، کە کەوتۆتە کوشتنی بێهودەی هەژارانو گەدایان، چونکە مسوڵمانانن.

کاتێ (ئەرنات) بینی (دەریای سور) بۆتە موڵکی سوپاکەی ئەویش هیوای زۆر بوو، دەستدرێژەکانی سنوریان پساندو دەستی بەسەردوو کەشتی دا داگرت، کەلە (یەمەن)ەوە دەهاتن ئازوقەیان بۆ خەڵکی (مەککە)و (مەدینە) هەڵگرتبوو، ئەنجا هاتو شکانیو هێرشی بردە سەر کاروانی حاجیەکان، نەك هەر بۆ تاڵانو ڕاوو ڕوت کردنیان، بەڵکو تا شمشێر لە گەردەنی ئەم بێ چەکانەدا بەکاربێنێ! ئەم جۆرە کارەساتە هەر لەوکاتەدا ئیسلام حەجی داناوە وێنەی نەبووە.

قەت بیری لەمە نەدەکردەوە کە ئایندە کەشتیگەلەکی مسولمانان شوێنی دەکەوێت......بەڵکو ئەو شای بێوێنەی دەریایە، بۆیە (حسام) بەوپەڕی نهێنییەوە بە سەرجەم کەشتیگەلیەوە چووە دورگەی (ئەیلە)و لەناکاودا هێرشی بردەسەر خاچپەرستان، چونکە کاتێ بینیان کەشتیگەلی (میسری) بەرەورویان دێ، وایان زانی کەشتی (ئەوروپین) لە خۆرئاواوە بۆ کۆمەکی ئەوان هاتوون.. کارەساتە کە واقعی بوو، چونکە هێرشی کەشتیگەلی (میسری) سەرجەم ئەو کەشتییانەی تێکشکاند کە (ئەیلە)یان گەمارۆدابو، مسولمانان دابەزینە ناو دورگەکە، تا مژدەی سەرکەوتنی ئایینی خودا بە گەمارۆدراوان ڕابگەیەنن و ئاوو خواردنیان بۆ ببەن بۆ کوژاندنەوەی کوڵو جۆشیان.

دوای ئەم سەرکەوتنە، (حسام الدین) ساتێ پشوی نەدا، بەڵکو بەتەواوی کەشتیگەلیەوە لە (عیذاب)ەوە بەرەو (دەریای سور) کەوتەڕێ تا شوێن پێی کەشتیگەلی (ئەرناط) بکەوێ کە هەرگیز چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد ئەمەی ببینێت، نەخشەی (حسام الدین) ئەوەندە کاراوقایم بوو ڕێگای سەرکەوتنی بۆ ئاسان کردو، توانی بەبێ ئاگایی‌یەوە سەرجەم کەشتیگەلی خاچیەکان تەفرو تونا بکات، ئەنجا مسولمانان چوونە وشکانییەوە تا شوێن ئەو خاچیانە بکەون کە بۆ دەست گرتن بە کاروانەکاندا چالاکی یان نواندووەو، کارەساتی کوشتاریان قەوماندووە، خاوەنەکانی شەهید کردووە، ئەوان ڕۆڵیان خێرایە، چونکە ئەم تۆخمە کتوپڕەیە هەموو بەرەنگارییەکی خاچییەکانی پەك خستووە.

(حسام) لە دیلە ئازاد بووکانی بیست، کە(ئەرنات) لە ڕێگادا باسی کردووە کە ئەو لە ڕێگا دایە بەرەو(مەدینە)، تا گۆڕی پاکی پێغەمبەر هەڵداتەوەو، خاوەنەکەشی ناتوانێ لەکاتی پەلاماردانیدا بەرگری لە گۆڕەکەی خۆی بکات.

(حسام) بەم قسەیە فرمێسکی بەچاودا هاتەخوار کە هەڕەشەیەکی تاوانکارانە بوو، پاشان قسەی دایکی هاتەوە یادو زانی قسەی پیرەمێردە پیرۆزەکە ڕاست و دروستە کە لەمەڕ منداڵە بچوکەکە وتویەتی، نەیویست دوای ئەم سەرکەوتنە بۆ

(میسر) بگەڕێتەوە، هەتا لەگەڵ ئەوانەی لە سزای (ئەرنات) رزگاربوون حەج نەکات، لە هەموو دروشمێکی حەجدا پێشوازی لە سەرکردەی رزگارکەر کرا، ئەنجا هاتە سەر (عەرەفە)و مسوڵمانانی بینی بە کامەرانیو شادیەوە دەهاتنە پێشوازی لێکردنی، لەم ڕۆژەدا کە ڕۆژی (مەشهود)ە دەستیان بەنزا بەرزکردەوەو، ئەویش لە خۆشیان چاوی پڕ لە فرمێسك بوونو لەدڵی خۆیدا دەیوت ئەمەیان مژدەی دووەمە.

دەسەلاتی کەشتیگەلی خاچیەکان دوای بڕایەوە، دوای ئەوەی بەدەستی (حسام الدین) تێك شکان، هەواڵی ئەم سەرکەوتنە بە (میسر) گەیشتەوەو بینرا کە کەشتییەکان لەکاتی گەڕانەوەدا پڕن لە دیلو بە کەلەپچەکراوی بە شەقامو ڕێگاکانی (ئیسکەندەرونە)و (قاهیر)دا پیشان دەدرێنو سواری وشتر دەکرێنو پاشەو پاش سوارکراون کە نەریتی ئەو سەردەمە وابووە بۆ تێ شکاوەکان ..... (الفاضل) وتاری لە گۆڕەپانی قەلادا پێشکەش کردو پیرۆزباییو دەست خۆشی سەرکەوتنی لێکردنو بەزمانی (سەلاحەددین) ڕادەچڵەکاندو، (حسام الدین) بۆ لای دایکیو خێزانی بە پەلەگەڕایەوە، تا بەکامەرانییەوە مژدەیان پێ بدات، کە بڵێ دایکە گیان! هەردوو مژدەکان هاتنەدی!!

# بەیتـولـمەقدیـس

(متنبـي) هۆنەر دەڵـێ:

**كل حلم اتى بغير اقتدار حجة لاجى اليها اللئام**

(سەلاحەددین) لەسەر نەرمو نیانی ڕاهاتبوو، ئەم دیاردەیەشی لەزۆر هەڵوێستدا دەردەكەوت كە ڕابردوی ئەوی دەگرتەوە، بەڵام ئەم نەرمیو هێوریەی دوای جەنگی (حطین)ی لێدەركەوت شوێنی سەر سوڕمانی دوژمنانی بووبەر لەوەی جێگای سـەر سوڕمانی ڕكابەرەكانی بێ، بەو جوانكاریە سەیرانە لـەناو نووسـەرانی ئـەوروپی دا ناوی بە چاك ڕۆیشتو، جوامێریو پیاوەتیو نـەرمی ئـەویان لـە چـەند جـارێكی دووبارە بووەوەدا لەگەڵ ڕەفتاری شـایەكانی نـەیاری ئـەودا بـەراورد كـرد كـە بـە جلوبەرگی شاهانە خۆیان دەڕازاندەوە، هیچ وێچونەكیان لە نێوان شای بەبـەزەییو كابرایەكی هەلپەرستی تەماعكاردا نەدەبینیو، زۆر لەوانە لـە ڕەفتـاری قێزەونـی (ئەرنات) خۆیان نەناس دەكرد، بەڵكو بە (شۆڕەسواری دز) نازناوی بۆ دانابو [1].

بەلای منەوە ئەم وەسفەیە دژایەتی یان پێكەوە هەیە، چونكە لكانـدنی واتـای شۆڕەسواری بە كەسێكی ناپاكو پەیمانكشكێن لە هەموو بە لێنێكدا بێدەنگییەكی ستەمكارانەیە، شۆڕەسواری (الفروسية) تەنیا هەر ئازایەتی نیە، بەڵكو جوامێریو پیاوەتیو مەردایەتیشە، ڕێگروچەتە بە ئازاو دلێر وەسف دەكرێ، بـەڵام كـەس بـە شاسوارو شۆڕەسوار وەسفی ناكات.

---

١) الناصر صلاح الدين/ ل ١٦٥.

(سەلاحەددین) پاش جەنگی (حطین) لە دوندی سەرکەوتن دابوو، شاکانی فەرەنگی وەکو لێخوڕینی مەڕو ماڵات بۆ لای ئەو لێدەخوڕان، کەچی چاوپۆشی لێیان کردو لێیان بووراو بە چاوی سۆزو بەزەییەوە سەیری دیلەکانی کرد، وەك بڵێی دیلی مسوڵمانان بن نەك دوژمن، نکۆڵیش لەمە ناکەین کە هەندێ کارەساتی دڵتەزێن لە ئاکامی ئەم لێبوردنەدا ڕوویدا کە شوێنی ڕەخنەی ئەو کەسانەیە ژیاننامەی (سەلاحەددین) یان تاوتوێ کردووە، بەڵام ئەو ڕەخنانە سنورەکی مام ناوەند دەگرن، هەمان ڕەخنە بەرەڕەوی ئیمام عەلیش – خوا لێی ڕازی بێ – و (نورالدین محمود) بۆتەوە نەمدیوە ڕەخنەو سەرکۆنە کردنێ وەك لێرەدا هاتووە بەرامبەر بە هیچ کەسێ بەرزکرابێتەوە کە ڕەخنەی لێ گیرابێ، جار هەیە سەرکردەکە بەڕێزو وەجاخ زادەو جوامێرە جەنگەکە ناباتەوەو دەستەواژەی شکۆو ڕێزی بۆ ڕەوانە دەکرێ، جاریش هەیە سەرکردەیێ جەنگەکە دەباتەوە، کەچی لای ڕەخنەگرانی خراپەکارو چەتەیە، مەسەلەکە لێرەدا وەرگرتنی شوێنەکانو سەرکەوتنی سەرکردە نییە، بەڵکو لە سەروی هەموویەوە مەسەلەی هۆکارو نیازو مەبەستە.

یەکێ لەو سەرکردانەی لە جەنگی (حطین)دا دەسگیر کرا (بالیانی دووەم) بوو، پەنای بردەبەر (سەلاحەددین)و خۆی بەسەر پێڵاوەکانیدادا کە ئازادی بکات، سوڵتانیش تێشکانو داماویو سەرشۆڕی ئەو کاری تێکردو پەیمانی دایە کە بڕواتە بارەگای دەسەڵاتی ئەو لە (قودس)داو خۆیو منداڵو سامانی کۆبکاتەوەو بۆ میرنشینەکی تری ڕاگوازێت.

(بالیان) لێبوردنی سوڵتانی بڕوا نەکردو، ئەویش کەوتە سەردەستیو ماچی کرد، بەڵام کاتێك گەیشتە (بیت المقدس) وەك وەڵامدانەوەیەکی ئارەزومەندی فەرەنگەکانی، ناوی پەیمان شکاندنی خۆی ڕاگەیاندو، بەوە فریوی خوارد کە خەڵکەکی زۆر کۆبکاتەوە کە وەستانی خۆی لەبەرامبەر (سەلاحەددین)دا ئاشکرا بکاتو، وایزانی خولی داهاتو جەنگەکە دەباتەوە، هەڵسا بە کۆکردنەوەی پیاوو

هەتا منداڵیش کە تەمەنیان لە (٢٥) ساڵی دابێ لە بازرگانو پیشەچی ڕوی کردە کلێسای (القیامة) هەرچی شتی گران بەهاو گەوهەر بوو، یان ئەو خشڵەی بە خاچەکانو پەیکەرەکانەوە کرابوو دەستی بەسەرداگرتنو قاپو زێڕو هەمووی کردن بە پارە، تا پێویستی سوپا بەکرێ گیراوەکەی دابین بکات لە ناوەوەو دەرەوەی (قودس)دا، تا سوپایەکی گەورە پێکەوەبنێو بۆ بەرەو ڕوبوونەوەی (سەلاحەددین) ئامادە باشی بکات.

سوڵتان زانی کە ئەم دیلە ئازاد کراوە چی بۆ داڕشتووە، ئەو نەیویست لەکاتی خوێن گەرمی سوپاکەیدا پەلاماری خۆی دەست پێ بکات، بەڵکو وای خۆ نواند کە قەت بیر لە رزگارکردنی (قودس) ناکاتەوەو خۆی لێ بێئاگا کرد، ڕوی لە شارەکانی سەر کەنارەکان کردو شار بەشار رزگاری کردن، چونکە پێشبینی ئەوەی دەکرد دوورنیە کە لەشکرێکی زۆر لە خۆرئاوە لە ڕێگای دەریاوە بێو بێتە ئەو کەنارانەوە بۆ تۆڵە سەندنەوەی جەنگی (حطين)و، ئەگەر شارەکانی سەر کەنارەکان بڕوخێن ئەوە زەبرو زەنگێکە بۆ ئەوانەی دێنو، پچڕاندنی پەیوەندی دەریاییە لە نێوان هاتوانو گەمارۆدراواندا.

ئەنجا پەیوەندی (شام) بە (میسر)ەوە خێراتر دەبێت، چونکە دوای ستاندنەوەی ئەم شارانە لە دەستی فەڕەنگەکان ڕێگای نێوان ئەم دوو هەرێمەیە ئاسایش تر دەبێتو، وەك پێش داگیرکرانەکە پێویستی بە پاسەوانی توند نابێت.

ئەمە لەمەڕ هەندێ شاری سەر کەنارەکان، بەڵام (عەککا) لەناو ئەوانەدا لەژێر دەسەڵاتی (جوسلين)دا بوو کە لە کارەساتی جەنگی ڕابردو دەربازی بووبوو ترسی سوپای مسوڵمانانی هەر هەبوو، بۆیە ئەوەی هەڵبژارد کە شارەکە بە (ڕیموندی سێیەم)بسپێرێت کە میری (طرابلوس) بوو خۆی رزگار بکات، بەڵام (سەلاحەددین) بەر لە ئەنجامدانی مەبەستەکەی دا دەستی خۆی بینیو ئەو نەیویست مقاوەمەیەکی گەورە نیشان بدات، بۆیە کلیلەکانی ناو شاری بۆ سوڵتان نارد بەو مەرجەی خەڵکی لە گیانوماڵو سامانیان دڵنیا بکات، سوڵتان پابەندی خۆی بۆ

بەڵێنی خۆی ڕاگەیاند، بەڵام کۆمەڵێ لە جەنگاوەرانی ناو عەککا پێیان خۆش نەبو ئەوەندە بە ئاسانی (جولسین) خۆیەدەستەوە بدات، بۆیە سەرەتا لەسەر جەنگ سوربوو، پاشان زانی کە بێگومان دەبەزێت بۆیە ئاگری بەردایە دانیشتوانیو بیناو خانوو بەرەکانیو، ترسو تۆقین بە فراوانی کەوتە ناو خەڵکەوە، فەڕەنگەکان ڕویان لەوانە کردو دەیانپرسی: ئایا گەر (سەلاحەددین)یش وڵاتی گرت وەك ئێوەی کاولو وێران دەکاتو دەیسوتێنێ؟ ئەگەر ئەم ڕوداوە سەرچاوەی کارەساتێکی گشتی بێ بە چ عەقڵو ژیرییەکەوە کاولکاری دەکەن؟.

(سەلاحەددین) توانی بێ بەرەنگاربوونەوە (عەککا) داگیر بکاتو بڕواتە ناویەوە کە ئەو کاول کارییەی بینی پێی ناخۆش بوو، بەلێبوردن دڵی خەڵکی ڕازی کردو، سەروماڵی پاراستن، ئەو توانی بەهۆی گرتنی شارەکە (٤) هەزار دیلی مسوڵمانان ئازاد بکات، کەلەبەر دەستی دوژمندا بە ئازاری دیلی یەوە دەیانناڵاندو زۆر ڕووداوو کارەساتی ناخۆشیان دەگێڕاوە، کە لەلایەن ئەوانەوە توشیان هاتووە، ناوی تاوانبارانیان دیاری کردو، کردارە قێزەونو پڕلە ڕقەکانیان ژمارد، بەڵام (سەلاحەددین) ویستی ڕێبازی لێبوردەیی خۆی ڕەچاو بکاتو تۆڵە لە تاوانبار نەستێنێت.

هەرچەند (عکا)و (الناصرة)و (قیسارية)و (حیفا)و (صفورية)و (قعليا) بە ئاسانی بوونە دەستکەوتی (سەلاحەددین)، بەڵام لێرەدا قەڵایەکی سەخت هەیە بە ناوی (توبنین) کە ئازوقەکی زۆری لەناودا هەیەو، بە خۆشی خۆی تەسلیم نەبوو، بەڵکو سەرکردەیەکی (سەلاحەددین) کە پاڵەوانێکی دلێر بوو بەناوی (حسام الدين لاجين)و کە کوڕەزای خۆی بوو شەکەتی یەکی زۆری هاتە پێش بۆ گرتنی، تاوای لێهات داوای فریاکەوتن لە سوڵتان بکاتو ئەویش سوربوو لەسەر چوونی خۆی بۆ لای قەڵاکەو گەمارۆکە قایمتر بکاتو لێدانەکە توندتر بکات، ئەنجا قەڵاکە خۆی دایە دەستو (سەلاحەددین) پیاوەتیو جوامێری پاڵەوانەتی خۆی مەزندەکردو، بواری دان کە بێترس بێنە دەرەوە.

(سەلاحەددين) هێرشەكەى گەياندە (بەيروت)و توانى بەتەواوى كۆنترۆڵى بكات، وەكو (ابن الاثير) باس دەكات: قايمترين ولاتى كەنارى ئەو بوو لە (شام)دا. سولتان نەيويست خۆى سارد بكاتەوە، بەڵكو بەردەوام بوو لە ڕۆيشتن، تا گەيشت بە (جوبەيل)و دەسەلاتى بەسەردا گرتو شوێنى سەركردايەتى بە خۆشى خۆ يان تەسليم بوون، لەگەڵ ئەم سەركەوتنە يەك بەدواى يەكدا، چاو پۆشى (سەلاحەددين) ئەوەندە فراوان بوو، تا ئاگاى لەو ئاكامە مەترسيدارە گرنگانە نەما، ئەمەش لەكاتێكدا كە ڕێگاى بە فەرەنگەكاندا، لە شارە رزگاربووەكاندا بە زەخيرەو چەكەوە بێننەوەو، هەركەسێ چووە شوێنێكى تر چەكى خۆى دەبرد، تا لە داهاتوودا لە ئاپۆرەيەكى يەككرتوودا كۆببنەوە. دەبوايە (سەلاحەددين) چەكيان لىَ دامالىَ، ئەگەر دەرۆيشتن بۆ شوێنێكى تر چەكى لێكردبانەوە، ئەگەر پارەو ماليشيان بردبايە! ئەمە رەخنەيەكى دەركەوتووە كە ئاراستەى (سەلاحەددين) دەكرێ، بەلام رەنگە بيرى لەوە كردبێتەوە كە سەركەوتنى داهاتووى لە (قودس)دا كۆتايى بە هەموو مقاوەمەو بەرهەڵستى يەك دێنێ كە ئەوانە بيانەوێ پێوەى هەڵبستن، بەڵكو رەنگە ئاگاى لەو هەموو تفاقو گەنجينە يە نەبوبێ كە لە چاڵەكانى شاردراوەتەوە، لەوانەيە وايزانيبێ ئەگەر ئەوانە ئەو تفاقەيان هەبايە بەرهەڵستييەكى دلێرانەيان كردبايەو، خۆيە بەدەستەوە دانيان هەڵنەبژاردبايە!

(سەلاحەددين) كاتێ هەندێ شارى (فەلەستين)ى رزگاركرد بەرەو (بيت المقدس) كە وتە ڕێگا، ئەم (بيت المقدس)ە هەر لە جەنگى (حطين)ەوە مەبەستى يەكەم بوو، بەلام نەيويست لە هيكرا پەلامارى بدات، بۆ پاراستنى گيانەكانو، هەم بەپلەى يەكەم بۆ ڕێزگرتن لەو شوێنە پيرۆزە ئاينييەنەى لەوێدا هەيە، پاشان پەيامنێرى بۆ (باليان) نارد كە بەڵێنى رابردوى بخاتەوە يادو، پێشنيارى كرد كە بەچەند مەرجەكى بێمەترسى لە شار تەسليم بكات كە هەمان ئەو مەرجانە بوون فەرەنگەكان لە شارەكانى هاوسێى ئەودايە پەسەنديان كردن، گرنگترين مەرجيان دلنيايى لە گيانو ماڵو ئافرەتو منداڵو، ڕێگەدان بە كۆچكردن بۆ كەسێ نەيەوێ

(بیت المقدس) بمێنێتەوە، بەلام (بالیان) لەسەر هەلوێستی خۆی سەقام گیرو
وربوو، ئەمە هەلوێستەکی جوان بوو بۆ (سەلاحەددین) کە نامەیەکی لە لایەن
ی (بالیان)ەوە پێگەیشت بە ناوی شاژن (ماریاکومنین) کە داوای لێدەکات
سەوانی بۆ دابین بکات، تا بە خۆیو دەستو پەیوەندییەوە لە (بیت المقدس)ەوە
(تەرابلس) کۆچ بکات! هەرچەندە سولتان دەیزانی کە نامە کە بە ئاماژەی
ێردە فێلبازەکەیەتی، کە(بالیان)ەو بە پلانی ئەوە بۆ سووربوون لە سەر ژنو
ندالی خۆی، لەکاتی هەلگیرسانی ئاگری شەڕدا (سەلاحەددین)یش نامەکە
سەند دەکاتو، وەلامی شاژن دەداتەوەو داوای لێدەکات کە ڕایگەیەنێ سولتان
ستەنگ لەبەرامەر ڕێگای هیچ کۆچکەرێ دانانێ لە ژنو مندالو پیر کە
یانەوێ لە شار بڕۆنەدەر، چونکە ئەوان ئەهلی جەنگ نینو ئەو شەڕی لەگەل
ەسێکدا دەکات کە شمشێری لەڕوویدا بەرزبکاتەوە.

زیرەکانەترین شت کە بەرەو ڕووی (سەلاحەددین) بۆوە لەکاتی ڕاگەیاندنی ئەودا
ەوەبو کە خاچ پەرستێ هاتە پێشیو لێی پرسی: ئەگەر سولتان بەو چەشنە
بوردەیی خۆی ڕادەگەیەنێ ئەی بۆچی ئامادەبووە بۆ (قودس)؟

وایزانی وەلامی ئەم پرسیارە گرانەو، جەنابی (سەلاحەددین) دەخاتە
استەنگەوە لە بەرامبەر ڕەوشتی ڕونو شەفافیدا.

بە هەموو هێمنی یەکەوە (سەلاحەددین) بە پرسیارکەری وت: ئایا ئەمە شاری
ێوەیە، یان ئێوە هاتوون لە خاوەکانی ئەوانتان زەوت کردووەو، لە ڕۆژێکی شومدا
وباری خوێندان تێدا هەلسان ئێوەش بە پێخۆشبوونو بە دل بوونەوە دەیگێڕنەوە؟!
رسیارکەر وەستاو نەیدەزانی چی بلێ.

(سەلاحەددین) وتی: بڕۆ بەبێ ترسو، کەس یەخەت ناگرێو، بەو کەسانەش
لێ کە تۆی ناردووە: ئێمە لە ئەورووپادا لەگەلتاندا ناجەنگین کەشتی ئێمە دەریا
ابڕێت تا لە زێدی خۆتاندا بێزارتان بکەین، بەلام ئێوە لەگەل خەلکی مەدەنی

کەوتنە دەستدرێژیکاری‌و، لە پەیامی ئێمەشدا هاتووە کە دەبێ وەڵامی دەستدرێژی بدەینەوە. (سەلاحەددین) دەستیکرد بە گەڕان بە دەوروبەری شارداو، بینی لە زۆربەی لایەکانیدا بەرهەڵستی خۆی دەست پێکردووەو، تفاق‌و سوپای لەناوخۆدا کۆکردۆتەوە بۆ ئامادەباشی بۆ بەرەورووبوونەوە، هەموو خەمی ئەوەبوو کە دەبێ سەرکەوتن بەدەست بێنێ‌و زیانی گیانیشی کەم بێ‌و زۆر نەبێ، هێوری‌و شێنەیی نواند، تا دەروازەیەکی تا ڕاددەیێ ئاسان بدۆزێتەوە بۆچونە ناو شارەکەو، ئەنجا لای باکوری بەچاك زانی‌و، هەوڵیدا بۆچونە ناوی.

(بالیان)، کە زانی دوای ئەوەی مسوڵمان چونە ناو جەرگەی پایتەختەوە، مقاوەمە بۆ ئەوو سەرکردەکانی فەڕەنگیش ئاستەنگ‌و دژوارە، بۆیە کاری بۆ پەیوەندی (دبلۆماسی) کرد بە سەرکردایەتی سوپای ئیسلامییەوە بۆ جولاندنی بەزەیی (سەلاحەددین)، چەند دانووساندنەکی دژوار بەڕێوەچوو کۆتایی بەوە هات کە دەبێ فەڕەنگەکان (قودس) چۆڵ بکەن‌و لە بەرامبەردا رزگارانە بدەن کە بڕیار دراوە، دەبێ پیاو (١٠) دینار بدات‌و ژن (٥) دینار بدات‌و منداڵ (١) دینار بدات، بەڵام هەژاران دەبێ (بالیان) رزگارانەکەیان بۆ بدات‌و بەو بڕە پارەیەی سوڵتان ڕازی بکات‌و لە ماوەی (٤٠) ڕۆژدا دەبێ ئەنجام بدرێت!

ئەم گەلەیە کەوتە خۆی بۆ رزگارکردنی گیانیان‌و کەل‌و پەلی گرانیان بە پارەکی کەم فرۆشتەوە لەبەر گرانی هەڵگرتنی یاندا بە ڕێگادا. گەشتی چۆڵکردنیان دەست پێکرد!!

مێژونووسانی فەڕەنگی چەند بەراودکارییەکان لە نێوان ڕەفتاری (سەلاحەددین)دا لەکاتی پاشایەتی (قودس)داو ڕەفتاری فەڕەنگەکاندا داناوە، کاتێ هەر لەو ڕۆژەوە ئەوان داگیریان کرد بوو قەسابخانەیان تێدا دانابو، هەندێکم لە بەندی یەکەمی ئەم کتێبەدا لەمەڕ کارەسات‌و بەڵاکانی ئەوان باس کردووەو ئاماژەی پێ ناکەمەوە.

دیسان مێژوونووسانی فەرەنگی لێبوردەیی (سەلاحەددین) یان تۆمارکردووە کاتێ لێخۆشبوونی گشتی بۆ هەژارانی فەرەنگی دەردەکات بەهۆی بەزەیی هاتنەوەی بە نەبوونیو گەدایییاندا، (عادل) شای براکەشی هەمان کاری کردو رزگارانەی بۆ سەدان کەس لە ماڵی تایبەتی خۆی بۆ دانان. ئەمەش جیاوازیەکی زۆرە کە شا (عادل) بارمتەی کۆمەڵەکی زۆر لە خاچ پەرستان بدات بە ماڵی خۆی، کەچی (هیرەقل) شای (قودس) کە (بەطرەیەرەکی) ئاییینی هەرەگەورەی شارە بوو ئەم کارە ناکاتو هەرچی بارو گەنجینەی زێڕو ئاڵتونی کلێسایە کۆی دەکاتەوە لەپێشخۆیەوە دەیگوازێتەوە، پاشان (١٠) دینار رزگارانەی خۆی دەداتو بەس، هەڵوێستی ڕەقی ئەو ڕێگەی ئەوەی پێنادات کە بەزەیی بە هاوئاییینەکانی خۆیدا بێتەوەو هەندێ لە پارەکانی خۆیان پێ بدات کە هەڵی گرتووە، کەچی ئەو خەزێنەو گەنجینانەی بە ئارەقی کۆششی ئەوان کۆکردۆتەوە، هەندێ لەوەی لەم بارەوە باس کراوە دەگوازمەوە[1].

﴿کابرایەك بە سوڵتانی وت: (بەطرەیەرەکی) بە ماڵو گەنجینەوە دەرچووە، تا بڵێی زۆرەو ئەوە بۆ بارمتەی هەژارانو گەدایان خەرجی نەکردووە، وەکو (ئەستانلی) دەڵێ: بۆچی ماڵی ئەم دوو ڕەزیلە زەوت ناکەیت تا کاروباری مسوڵمانانی پێ بەهێزو بکەیت؟ سوڵتان وتی: جگە لە (١٠) دینار زۆرتری لێ وەرناگرمو بەڵێنی خۆم ناشکێنم﴾.

(ئەستانلی) کە مێژونووسەکی فەرەنگیە دەڵێ: (کارەکە گەیشتە ئەوە کە سوڵتانی مسوڵمان وانەیەکی فێری ڕاهیبەکی مەسیحی بکات لە مانای چاکەو خێرکردندا). وە (سەلاحەددین) وەنەبێ تەنیا ڕزگارانە (فیدیە)ی لەسەر هەژارانی فەرەنگی هەڵگرت، بەڵکو ئەوەی لە دەستی دابوو پێی دان، کاتێ بینی زۆرێ لەوانە باوکی، یان دایکی، یان نەخۆشەکی نزیکی لە پشتی کردووە، دیمەنەکە کاری لەدڵی کردو، فەرمانی بە هێنانی وڵاخ کردو بەسەریدا دابەشکردنو، فەرمانی بە

[1] حياة صلاح الدين الايوبى/ د: احمد البيلى/ ل ١٧٦.

ماڵو دارایی کردو پێی بەخشین! بەڵام (سیبیل)ی شاژن بە گریانەوە هاتە لای داوای لێکرد بە مێردی بگاتەوە لە (نابلوس)دا، ئەویش بێدڵی نەکردو لەگەڵ چەند پاسەوانەکی خۆیدا گەیاندیە شوێنی مەبەستو، زۆرێك لە ژنو منداڵی لەگەڵدا بوو، نەیویست ڕێگەیان پێ‌بگرێ. بەڕاستی ئەوان، پەیان بە لێبوردەیی ئەو برد سەرلەنوێ بەگریانەوە گەڕانەوە لایو پێیان وت: تۆ ڕێگەی ڕۆیشتنت پێدایین بێ فیدیەو ڕزگارانەو، مێردەکانمان لە (بیت المقدس)ن، هەروەها براکانمان کە پارەی ڕزگارانەیان نیەو ئەوانەش تفاقو چەکی ئێمەن لە ژیانو ڕۆژانەی ئێمەداو، زۆربەشیان دیلی تۆنەو ئەگەر ئەو چاکەمان لە ڕاستـڕا بکەیتو ئازادیان بکەی ئەوە ڕێزی ئێمە چەپاڵە دەدەیو ئێمەش بە بێی ئەوان ژیانمان مسۆگەر نابێ، ئەنجا لەبەر ژانو خەم دەستیان بە گریان کردو (سەلاحەددین) بەزەیی پێیاندا هاتو ئەویش زۆر گریا بە قسەکانیانو فەرمانیدا کە کوڕەکان بۆ دایکیان بگێڕنەوەو مێردی ژنەکانیش تەسلیم بە ژنەکان بکەنەوە، ئەمە هەڵوێستەکی پڕ لە بەزەیی بوو کە قەڵەم ناتوانێ حەقی خۆی پێ بدات.

ئەگەر ئەوە لەگەڵ هەڵوێستەکی تری خاچ پەرستەکی تری بەراورد بکەین، کە یەکێ لە فەڕەنگەکان لێی گێڕاوەتەوەو، (ئەمیر عەلی) گواستویەوەو، (د. البیلی) وەریگێڕاوە، دەڵێ: (ژمارەیەك) لەو مەسیحییانەی[1] یانەی (قودس) یان بەجێهێشت بۆ (ئەنتاکیا) چون، بەڵام میری ئەوێ میوانداری نەکردن، بەڵکو دەریکردن، ئەنجا لە وڵاتی مسوڵماندا بەسەر دەمو چاودا کەوتنو، بە هەموو پێشوازییەکەوە وەریان گرتن.

بەڵام هەبوو لەناو فەڕەنگدا نەك هەر براکەی خۆیان دەرکرد، بەڵکو شوێنییان کەوتو هەرچییەکی لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان لە قودسەوە لێیان سەندن، تا هەندێ لەوانە برسییەتی تەنگی پێ هەڵچنینو لە بێ‌هێزیان لەناو قەدی ڕێگادا کەوتنو چاوەڕوانی مردن بوون، ژن هەبوو منداڵی خۆی دەخستە دەریاوە تا بمرێو

١) مەسیحی لە کوردەواریدا گاور، یان فەلە ناوزەد کراون - وەرگێڕ -

بە ئازاری برسیەتییەوە نەناڵێنێ، چونکە توانای نیە ڕزگاری بکات، دوای ئەوەش وەکو شێتو هاری لێدەهاتو دەکەوتە گریانو لە خۆدانو نەفرینی لە هاو دینەکانی خۆی دەکرد!!

لێبوردەیی (سەلاحەددین) لەناو فەرەنگدا بڵاوبۆوە، دیسانەوە بەزەیی ئەو بە بێوەژناندا بەتایبەتی بووکێکی گەنج هاتە لای، کە لە قەڵای (برزیە) گەمارۆ درابوو، وتی: ئەو دەبێ بە هاوسەری گەنجێ، کە لای ئەو دیل کراوەو، کاتی زەماوەندەکەشی ئەگەر دیل نەبوایە دوێنێ بووە، ئەنجا گریا سوڵتانیش فەرمانی ئازادکردنیداو بە بوکەکەی بەخشیو، هەندێ سامانی پێدا!! بەڵام بەسەرهاتی ئەم دایکەی منداڵەکەی بە باوەشیەوە دەدزرێو، منداڵ ڕفێنەکان بۆ شوێنێك هەڵدێن کە ناتوانێ لێیان بستێنێتەوە، بەباشی زانی داوای فریاکەوتن لە (سەلاحەددین) بکات، ئەویش فەرمانیدا بە سۆراغکردنی ئەو منداڵەو، ئەو ژنەی لە چادری خۆیدا زۆر بەڕێزەوە داینیشاند، تا توانی بۆی بگێڕتەوە........ ئەم بەسەر هاتو داستانە سەرچاوەیەکی هونەری ئیلهامی قەڵەمی زۆرێك لە خۆرئاواییەکانە، ڕەنگە ئەدیبی گەورە مامۆستا (علي الطنطاوي) یەکەم کەس بێ لە نووسەرانی عەرەب کە بە شێوازی ئاشکرای خۆی لەسەر پەڕەکانی (الرسالة)دا پەردەی لەسەر لادابێ بە ناونیشانی (هیلانەو لویس)و دوایش بووەتە کۆمەکییەك بۆ شانۆی ئیزاعەیی کە جەماوەر گوێ بیستێ دەبێت، ئەگەر شوێنەوارەکانی (سەلاحەددین) بە کەسێ بەخشرابایە کە بەو هونەرە سەرەنج ڕاکێشە دەریخستبایە پێویستی بەو وەرگێرانە لاوازو نزمانە نەدەبو،کە بێشەرمانە بۆمان بڵاودەکرێنەوە.

لەو هەلە (فرصة) نەبینراوەدا کە مسوڵمانانی گرتەوە (سەلاحەددین) نەیویست (نورالدین زنکی) مامۆستاو سەرکردەی لەیاد بکات، کاتێ دەیزانی ئەو دوانگە (مینبەر)ەکی بۆ مزگەوتی (ئەقصا) ئامادەکردووە لەکاتی رزگارکردنیدا، بۆ ئامادەکردنی مینبەرەکە هەوڵیدا، تا ئارەزوەکەی شۆڕەسواری شەهید بێنێتەجێ! ئەنجا داوای لە گەورەترین وتار بێژی وڵات کرد، کە یەکەم کەس بێ بڕواتە سەر

مینبەرەکەو بە بەیانکردنی خۆی شادمانی ئەو سەرکەوتنە تۆمار بکات، زانی کە قازی (محی الدین محمد کوڕی علي) ناسراوبە (ابن زکي) باشترین کەسە ئەم جێگایە بگرێت، کەسێکی نارد بە شوێنیدا بانگی بکات، لە ڕۆژی هەینی یەکەمینی ڕۆژی سەرکەوتنەکەدا، (ابن زکي) چووە سەر مینبەری (نورالدین)و وتارەکی داو هەڵوێستی جەماوەری مسوڵمانی دەرخستو، دیسانەوە سەدان شیعرو هەڵبەست ئەم هەڵوێستانەی خستە ڕو کە لە بەندی داهاتوودا ئاماژە بە نموونەیێ لەوانە دەکەین..... وتارەکەش زۆر درێژە، چونکە شوێنەکە وتاری درێژی هەڵدەگرت، تا ئەو هەڵوێستە ڕاستگۆیانە دەربخات کە لەدڵی گوێ گراندا دەورویژێ، ئەمەش چەند بڕگەیەکی وتارەکەیە:

(ئەمە ئەم ڕزگارییە بوو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرانەوەو، نزیکە لەسەر دەستی ئێوە ڕزگاری تری لەم شێوەیەش لەلایەن خواوە بێتەدی خۆشحاڵی خەڵکی دەوڵەمەند زۆتریێ لە خەڵکی هەژارو تۆزاوی، ئەوە[1] نیە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَا....﴾(الإسراء- ١)، واتە: بێگەردی بۆ ئەو خوایەی شەوڕۆیی بە بەندەی خۆی کرد لە مزگەوتی (حرام)ەوە بۆ مزگەوتی (ئەقصا).

ئایا ئەوە ئەو ماڵە خوایی‌یە نیە کە خوداوەند لە پێناو ئەودا (خۆر)ی بۆ (یوشع) ڕاگرت، تا رزگارکردنەکەی ئاسان بکات[1]. ئایا ئەو ماڵە نیە کە خوا

١) ئەم ڕووداوە وەستانی خۆر لە مێژودا (السید سابق) لە (العقائد الاسلامیة)دا (ل: ١٢١ ڕونی کردۆتەوە کە زانای ڕوسی (ئیمانویل فلیسکوفسکی) سروشت ناس ئەوەی سەلماندووە کە لەسەردەمی یوشعدا نیازەکێ نزیك کەوتۆتەوە، نزیکبونەوەی نیازکی گەورەش زۆر دیاردە پەیدا دەکات وەکو هێوا شکردنەوەی خێرایی زەوی کە خەڵکی وابزانن خۆر وەستاوە ...}ئەم ڕوداوە لە (صحیح البخاری)دا گەڕاوەتەوە کە (پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران غەزای کردو لە ئاوەدانیەکەدا نوێژی ئێوارەی کرد، یان لە نزیکی ئەودا، بە خۆری فەرموو: تۆ فەرمان پێکراوی منیش فەرمان پێکراوم خوایە بۆمان ڕابگرە، خوداوەنــــــد ڕایگرت تا بۆی ڕزگارکرد ...) ئەمەش موعجیزەیەکی مێژویی ناودیارە لە ئیسلام بەر لە زانستدا هەواڵی لێداوە! ئایندەش لە ئاخر زەمانداهەمان یاسا دوبارە دەبێتەوە!

فەرمان بە موسا دەکات گەلەکەی هۆشیار بکاتەوە بە رزگارکردنیو تەنیا دوو کەس وەڵامیان دایەوەو، خاوەنەکەی لەبەر ئەو، ڕقو خەشمی لێگرتنو خستنیە ناو ئاوارەییەوە[1]. سوپاس وستایشی خوا بکەن کە ئەو کارەی جولەکەکان سستی یان لێکرد ئێوە قۆڵتان بۆ هەڵماڵی، کەچی ڕێزیان بەسەر هەموو دنیادا پێدرابوو، خودا سەری خستن کەچی گەلانی بەر لە ئێوە لە رابردوی دوردا لەمەدا سەرشۆڕ بوون تێیدا، بزانن خوا ڕەحمتان پێ بکات ئەمە هەلێکە بیقۆزنەوەو نێچیرەکە هەڵمەتی ببەنە سەر، کارەکان بە داهاتووەکانەوەیە، دەسکەوتەکان بە گەنجینەکانییەوەیە، ﴿...وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾[2](الانفال– ٦٥).

هەندێکی لەوەی وتار بێژەکە باسیکردووە، وێنەی جوانی دیمەنەکەو شکۆی جێگاکەو، مەزنیو ترسناکی هەڵوێستەکە دەکێشێت .

١) ئاماژە بۆ ئایەتەکانی (٢١– ٢٦)ی سورەتی (المائدة) دەکات. (وەرگێڕ)

٢) واتە: (ئەگەر ئێوە بیست کەسی خۆڕاگرتان هەبێ بەسەر دوسەد کەسدا سەردەکەوێو، ئەگەر سەد کەس بن بەسەر هەر هەزار کەس لەو بێباوەڕانەدا زاڵ دەبن کە ئەوان گەلێکی تێنەگەیشتوو ناڕۆشەنبیرن).

نموونەی مێژوویی زۆرە کە ڕاستی ئەم ئایەتە دەسەلمێنێ وەکو جەنگی بەدروحونەینو غەزاکانی تری پێغەمبەر ﷺ کە هەمیشە سوپای مسوڵمانان هەر چەندە کەمتر بوون، بەڵام خۆڕاگرتربوون بۆیە سەرکەوتن هەر بۆ ئەوان بووە، تەنیا لە (ئوحود) نەبێ هەندێ لە مسوڵمانان خۆڕاگرییان نەکرد!

نموونەی مێژوویی تر دوانزە سوارەی مەریوانە کە (پیرەمێرد) کتێبەکی بەم ناوە نووسیوەو بەسەر (١٢) هەزار کەسی سوپای نەیاردا سەردەکەون، چونکە خۆڕاگردەبن!

# جەنگەکانی (عەککا)

(عبدالرحمان الناصر) لە کۆتایەکانی تەمەنیدا دانیشت، دوای ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست هێناو، بۆ سەرکەوتنەکەش خەبات‌و ڕەنجەکی زۆری دا تا خەریك بوو خۆی لەسەر دابنێت‌و، گەلەکەی بینی ئازادو پەرێشانی جەرگ بڕی بەدەم‌و چاوەوە دیارەو، وەك بڵێی هیچ سەرکەوتنەکی بەدەست نەهێنابێ وایە، یەکێ لە دانیشتوانی کۆڕەکەی بە سەرسوڕمانەوە پرسی: ئەی میری مسوڵمانان بیر لەچی دەکەیەوە؟

(ناصر) وتی: من (٥٠) ساڵ‌و نیوە حوکمم کرد بیرم لە تەواوی ڕۆژە خۆشەکانی ئەو ماوە درێژە کردەوە، تەنیا (١٤) ڕۆژم بینی، کە ئێستا دەتوانن بیانژمێرم!![1]

ئەوەی (عبدالرحمن الناصر) باسیکردووە لەو ڕەنج‌و ئازارەی کێشاویەتی لەگەڵ کێشەکاندا بە درێژایی تەمەنی، ڕەنگە پاڵەوانی جوامێر (سەلاحەددین)یش هەمان قسە بکات، لەگەڵ گوێ نەدانیش بە جیاوازی ئاشکرای نێوان کاتی هەردوو پیاوەکەدا، (سەلاحەددین) هەر لەوکاتەوە شمشێری بۆ خودا هەڵگرتووە بۆ خەبات کردن تەماعی هێوری‌و پشودانی نەبووە! دوای ڕزگاری قودس شیرینی سەرکەوتنی چێشت، بەڵام وەکو مرۆڤەکانی بە پەلە نایچێژێ، کە هیچ کێشێ بۆ دوارۆژ

١) (عبدالرحمن الناصر (٢٧٧ز-٣٥٠ ك/ ٩٦١ز-٣٥٠ ك) یەکەم خەلیفەی ئومەوی یە لە ئەندەلوس لە قورتەبە پەیدا بووەو مردووەو، بۆ ڕێك خستنەوەو ئاشتی ڕەگەزەکانی ناوخۆ کاری کردووە، بەسەر (ابن حفصون)دا زاڵ بوو، هێرشی مەسیحی یەتی ڕاگرتووەو، لە باکوری ئەفریقیا شەڕی لەگەڵ فاتیمییەکان کردووەو بە (امیر المؤمنین) ناویان بردووە... هتد. (المنجد في الاعلام / لويس معلوف) (وەرگێڕ)

دانانێت، بەڵکو وەکو کەسێك چەشتی کە پاڵەوانێکی بەئەزموونەو دەزانێ کە تەواوی (ئەوروپا) لەکاتی بیستنی گیرانی (قودس)دا کە (سەلاحەددین) ئێستا حوکمی دەکات‌و ئەوان بەقسەی خۆیان شەڕیان بۆ کردووە هەموویان لەترسان ڕادەپەڕن‌و لەشکرەکان لە خۆرهەڵات‌و خۆرئاواداو باکورو باشوری (ئەوروپا)دا بۆ تۆڵەسەندنەوە دەردەپەڕن، ئەگەر ئەو مەسیحی یانەی لە خۆرهەڵاتدا ماونەوە بەر هەڵستی نەکەن، ئەوکاتە ئەو کۆمەکی یە زلەی دێ، خاچ پەرستەکان دەکاتە هێزەکی لە ئاسا بەدەرو دەتوانن بەرەنگاری سوپای (سەلاحەددین) ببنەوە، کەبێ چاوەڕێکردنی هیچ کۆمەکی یەك دەجەنگێت...... (سەلاحەددین) پەی بەمە دەبات بۆیە سەر بۆ ئاسمان بەرزدەکاتەوەو داوای یارمەتی لەخوا دەکات، چونکە لە تەنگانەدا بەس ئەوی هەیە.

گومانی (سەلاحەددین) هاتەدی و، هەڵمەتی سێیەمی خاچیەکان بۆ سەر خۆرهەڵات دەستی پێکردەوەو (فەریدیەریك) شای (ئەڵمان)و (ڕێچارد) شای ئینگلیز ناسراو بە (قلب الاسد)و (فیلیپ ئۆگوست) سەرکردایەتییان دەکرد، ئەمانە (٣) پادشا بوون هەریەکەیان دەیویست لە خۆرهەڵات‌و خۆرئاوادا ناو دەربکات‌و، هەریەکەیان یەك شتیان لەناخی خۆدا حەشار دابوو، بۆ ئەوەبوو سوپاکەی ئەو بە دنیای مەسیحیدا ناوی بڕوات، تا لەکاتی زانینی ئەوەدا کە ئەو پارێزەری پاوانی مەسیحە، (ئەوروپا) ببێتە گوێ لەمستی ئەو![١]

---

١) لە ٢٧ ڕەجەب/ ٥٨٣ ك/ ٢ ئەکتۆبەر/ ١١٨٧ز دا (صلاح الدین) بۆ قودس دەڕوات‌و دوای گەمارۆیەکی کورت چووە ناوی‌و بە شێوەیەکی مرۆیانە لەگەڵیاندا جوڵاوە پێچەوانەی خاچیەکان کەبەر لە (٨٠)و قسور ساڵ داگیریان کردبوو، وتاری هەینی لەم شارە ڕزگارەدا خوێندەوە دوای ئەوەی ماوەکی زۆر بوو قەدەغە کرابوو) ماهیه حروب الصلیبیه/ د: قاسم عبده قاسم/ کویت/ ل ١٤٤. وە لە /١١ مایۆ/ ١١٨٩ز دا هێزی ئیمپراتۆری ئەڵمانی فەردیك بە بروسابەر لە هێزی فەڕەنسا و ئینگلیزی کەوتە ڕێگا، هێزی ئەڵمان بە وشکانیدا هات کە ڕابردوو هێزەکانی هێرشی یەکەم پێیدا هاتبوون، بەڵام ئیمپراتۆر لە یەکێ لە دەریاکانی ئاسیای بچوکدا خنکا لە (١٠ یولیو/ ١١٩٠) ئەمەش زیانەکی گەورەبوو بەر خاچیەکان کەوت بەر لە بە ئامانج گەیشتنیانداو، ئەڵمان بەس وەکو هێما لە هەڵمەتی سێیەمی خاچیکاندا بەشداری کرد. بەڵام

تۆزقاڵێ خۆم دەوستێنم بۆ ئەوانەی مێژوی جەنگی خاچییەکانییان نووسیوەو بە (۷) هێرش دایاننــاوە کــە ژمارەیــەکی کەمــە..... ئەمــەش هەڵەیەکــە بــەلام چ هەڵەیەك، چونکە ئەم هێرش‌و پەلامارە ئەوانەن کە پاشــایەکان خۆیــان بــەڕێوەیان بردون، بەلام ئەو لەشکرانەی بێ سەرپەرشتی پادشایەکی تایبەتی هــاتوون بــەهۆی کاریگەری بانگەوازیەکانی کلێسـاو کەشـیش‌و ڕەهبانــەکان، بەدرێــژایی ئــەو ڕۆژە ڕەشانە کۆمەکیان لــێ نەگێراونەتەوە[1].

ئەگەر لە نەریتی مێژوونووســی فەڕەنگیــدا هەڵمــەتی یەکــەمین لــە ســەرەتای جەنگەکانی خاچی یەکاندا پێشەکی هاتبێ‌و، هەڵمەتی دووەم دوای شکانی (الرها) هاتبێ لەسەر دەستی (عماد الدین زنکی) پاڵەوان‌و، هەڵمەتی ســێیەم ئێــستا کــە دوای ئازادی (قودس) هاتۆتەپێش، زیاتر لەو سێ هەڵمەتانە بە دەریادا هاتوون بــۆ کەنارەکانی عەرەبی کە پسانەوەی نەبێت، پێویستە لەسەر ئەوانــەی مێــژوی خــاچ هەلگری دەنووسنەوە لە ڕۆشنایی ئەم (۷) هەڵمەتە کوتکراوەیەدا بە سەرنجەوە بــە حیسابی خۆیاندا بچنەوە[2].

سوپای هەر سێ شاکان بەرەو خۆرهەلات هێرشی هێناو، گومانی (سەلاحەددین) ڕاست دەرچوو، کاتێ ئەم هەواڵە مەترسیدارەی بــۆ هــات قــەلای (شــەقیف)ی لــە (الجبل)دا گەمارۆداو، زانی کە وەختەکەی هاتووەو، هەموو هۆشیارییەکان ئامــاژە بۆ ئەوە دەکەن دوژمن بەرەو (عەککا) دێ، ئەو (عــەککا) ییــەی بەســەری دا زاڵ بوو، نەیویست فەڕەنگەکانی تێدا شار بەدەر بکات بەڵکو چاوی لێی یان پۆشـیەو، وایزانی کە ئەم لێبوردنە لە کۆڵ زیانی مقاوەمــەی ئــەوانیان دەکاتــەوە، ئەوکاتــە

رێچاردی یەکەم شای ئینگلیز (قلب الاسد)و فیلیپ ئۆگستین شای فەرنسا لە ڕێگای دەریاوە بــە جیــاوازی هاتنە (صقلیە)... هەمان سەرچاوە: (ل: ١٤٥) (وەرگێڕ).

۱) هەڵمەتی حەوتەمی لە (١٢٤٨-١٢٥٤) دەست پێدەکات، وە هەڵمەتی (۸)و (۹) هەیە کە لە (۱۲۷۰ز)و (١٢٧١-١٢٧٢ ز) دەست پێدەکات هەڵمەتی (۸) لویسی (۹) دەیکــات‌و هەڵمــەتی (۹) مــیر ئــەدواردی یەکەم دەیکات. (موسوعة الحروب / هیثم هلال / ل: ١٩٧ – ١٩٨). وەرگێڕ

۲) کتێبی (موسوعە الحروب/ هثیم هلال) ئاماژە بە (۹) هەڵمەتی خاچ پەرستان دەکات. (وەرگێڕ).

فەرمانیدا کە کۆنگرەی ڕاوێژی جەنگ کۆببنەوە ڕایەکانی لە هەموو لایەکانییەوە هەڵسەنگێنن‌و، کۆنگرەکە لە نێوان دوو کاردا بوو: یان دەبێ سوپای مسوڵمانان دەربچن بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی هێرشبەران لە کەنارەکەدا بەرلەوەی بگەنە شورەکانی (عەککا)، ئەمەش بیروبۆچوونی (سەلاحەددین) بوو، یان لەشکر بەرەو (عەککا) دەربچێ‌و ئەوێ بکرێتە مەیدانی جەنگ، ئەمەش ڕای زۆرینەی کۆنگرەکە بوو. (سەلاحەددین) وریایی دایە هاوڕێیانی کە دەست بەم ڕایەوە بگرن، چونکە ئەگەر ئەم خەڵکە بەسەرجەم هێزی تەواویانەوە بۆ (عەککا) بڕۆن، ئەوکاتە شوێنێکی شیاو بۆ جەنگ هەڵدەبژێرن‌و، ئەوکاتە دەبنە خاوەن ڕا لە تیراساکردنی جەنگەکەداو، سوپای توندو تۆڵیان لە دەوری شورەی (عەککا)دا چڕ دەکەنەوەو گەمارۆ دەخەنە سەر شار کە زۆرینەی ناویان مسوڵمانن‌و، هەرچی یارمەتییان بدات بۆ ژیان پێیان ناگات، بەڵام ڕەنگە نەیارەکانی ناوی هەرچی بیانەوێ لە هاو ئاینی خۆیان پێیان دەگات‌و بۆ جەنگ کردن لەگەڵ گەمارۆ دراواندا بەهێز دەبن‌و، ئەم شارە توشی دوو کارەسات دەبێت: کارەساتی ناو خۆو کارەساتی دەرەکی.

ئەمە بۆچونی (سەلاحەددین) بوو بەڵام کەس گوێی بۆ نەگرت‌و وازی لە پەلاماردانی کەنارەکانی هێنا، تا بەرپەرچی ئەو تەوژمەیە بداتەوە، بە سوپاکەوە بەرەو (عەککا) کەوتە ڕێ‌و، داوای کۆمەکی جەنگی کرد لە (میسر)و (شام) تا ببێ بە یاریدەری ئەو لەم ڕەشەباو گەردەلوولەدا!! بەڵام دەریا پڕ بوو لە کەشتی فەڕەنگی‌و هەزاران هەزار سەربازو، هەزاران هەزار تفاقی هەڵگرتبوو، بەو کەشتیگەلانە خاچ پەرستان گەمارۆی شاریان زامن کرد، کەکەس نەتوانێ فریای بکەوێ‌و ئاستەنگ لەبەرامبەر ئەو کەسانە پەیدا بکەن کە بەدەنگ (سەلاحەددین)ەوە بێن لەخۆ بەخشەکان بۆ پەلاماردان، ئەم پاڵەوانە مەترسی هەڵوێستەکەی پەی بێبردو، خەمی یەکەمی ئەوەبوو کەلێنێ لە شورەی (عەککا)دا بدۆزێتەوە کە تێیدا بووەستێ‌و پێویستیەکانی شاری لێوە بێت‌و گەمارۆ دراوەکان بتوانن بەرەنگار ببنەوە، مێژوونووسانی ئەمە دەڵێن: لەم تەنگانەیەدا سێ ڕۆژان

لەتکە نانێ نەچووە دەمیەوە، چونکە زۆر خەمو پەرێشان دڵی ڕاگرتبوو، بەردەوام مانگو نیوێ ئەو تێك پرژانە لە نێوان هەردوولادا درێژەی کێشا، تا خاچ هەڵگران هەموو تەقەڵای خۆیان کۆکردەوە بۆ کردارەکی یەکالاکەرەوە، جەنگێکی تۆقێنەر ڕوویدا کە ئاکامەی سەرکەوتنی سوپای مسوڵمانانی بە دواوە بوو، بەلاّم دوای شەهید بوونی هەزاران کەس لە مسوڵمانان بێ قەرەبوو کردنەوە.

(سەلاحەددین) دوای هێور بوونەوەی شەڕەکە پاڵەوانەکانی کۆکردەوەو ڕای وابو دەست لە شەڕ نەکێشێتەوەوەو دەوام بکات، چونکە (عەککا) هێشتاکە تۆقکراوەو، ئەگەر خاچییەکان سوپاش بکێشننەوە هەر کاتییەو سوپایەکی تر کۆدەکەنەوە، بەلاّم زۆر لەوانە ڕایان وابوو سوپا ماندووە پێویستی بە پشودانو حەسانەوەیەو، کشانەوەی فەڕەنگیش هەل دەسوڕێنێ کە هەناسەیەك بدەنو کەمێك فێنکایی پشودان بچێژن، ئەم کاتە (زستان) بوو، زیانی نیە مادام هۆیەکانی جەنگ پچڕابن کە سەربازە خەبات گێڕەکان ماوەیەکی درێژ بڕۆنەوە ناو ماڵو خێزانی خۆیانو، دوای باران بگەڕێنەوەو لەشکرەکانی مسوڵمانانیش بەردەوام دەبن لە دەوری شورەکاندا بۆ کۆمەکی گەمارۆ دراوان، تا ڕۆزیو ئازوقەی پێویستی یان پێ بدەن!

ڕایەکە ئاوا دامەزراو، ئاوا ئاگربەستێکی لە خۆوە لە نێوان هەردوو لەشکردا بێ نووسینی هیچ هەڵومەرجێکی پێویست ڕوویدا، ئەوەی ئاگربەستەکەی فەرزکرد سەختی زستانو هەڵسانی لافاو بوو، پەیوەندیو هاتوچۆی شار دژوار بوو، بەڵکو هەندێ لەو کاروبارانە بەکرداری فیداکاری دەچوو هەندێکیان بە شەهید بوون کۆتایی دەهات، چونکە کاتێ ئەوانەی دەهاتنە ناوەوە بە تاریکایی شەو دەهاتن بە ناو ئاودا مەلەیان دەکردو توێشویان پێ بوو دەهاتنە پەنای شورەکەوە، کەوایان دەزانی بێ مەترسی ترەو دەکەوتنە بەرتیر باران.

فیداکاران لەوبوارەدا داستانیان لێدەگێڕنەوە، ئەگەر بەرپیشەی وێنەکێش تابلۆکەی بکێشرێ دەبێتە شوێنی سەرسوڕمانەکی نائاسایی، هەندێ لەو فیداکارانە بەجیا باس دەکەینو ڕادەی فیداکارییان دەخەینە ڕو، یەکێ لەوانە

(عیسی العوام)ی پاڵەوانە کە ڕۆڵی زیاتر لە (١٠) پاڵەوانی دەگێڕا. (واتە عیسای مەلەوان) بەڵام ئەم چۆن جەنگە ڕوویدا؟

خاچپەکان بە دیمەنەکی کەڵێسەیی دەستیان بە جەنگەکە کرد، تا هەستی جەنگاوەرانی فەرەنگی ڕابکێشن، شای خاچ هەڵگر ویستی (ئینجیل) لەبەردەم ئەودا لەسەر ڕایەخەکی سەوزدا هەڵبگیرێو چوارکەسیش هەریەکەیان لایەکی ڕایەخەکە بگرنو بیبەنو چەند ئایەتەکی لێ بخوێننەوە، بەلای ڕاستی خۆیان دا لە بەرامبەر لای چەپیان کە سوپای مسوڵمانانی لێ بوو سوپاکەیان ریزکرد. لێرەدا (سەلاحەددین) ویستی سوپاکەی بەو ڕەنگە هاندا،کە ناوەڕاستی جەنگ بگرنو لە قۆڵی ڕاستییەوە شا (الافضل)ی کوڕی بێ، لەدەوریدا ئاپۆڕەیەك لە میرەگەورەکان هەبوو ویستی هەریەکەیان پێگەیەکیان لەچەپو ڕاستو پێشەوەو دواوە پێ بدات، لەوانەش (قطب الدین) کوڕی (نورالدین) شای قەڵای کیفاو (حسام الدین) کوڕی (لاجین) شای (نابلوس)و، شا (مظفر تقي الدین) کوڕی (عومەر) (حلب)و کۆمەڵەکیتریش لەمیرە کوردەکانی (هەکاری)و (ژەنگار)و (هەککاری)و (میهرانی)و (ئەسەدییە)و هەریەکەیان توندیو توڕەییان لێ هەڵدەگیرسا[1].

١) یەکێ لەو سەرکردانە (دەرباسی کوردییە) بەناوی (باوکی ئیسحاق)و ناسراوە بە (فخرالدین مازنی کوردی قاهیری، لە (٥٨٨ ك)دا بۆ تە میری حەج و، زۆر لە زانایانو بلیمەتان لە نەژادی ئەو هەلکەوتوون (مراة الزمان/ مشاهیر الكرد وكردستان/ محمد امين زكی بەگ/ ل ٢٠٢. وە لە کوردو کوردستان/ ئارشاك سافراستیان/ ل (٥٠)دا هاتووە: {ئەو کەسەی پادشای فەرەنسی یەکانی دەزگیر کردووە دەرباسی سەرۆك خێڵی کوردبووەو، کەوایەزیزییە میهرانییکانی ژەنگار (سنجار) چەند سەرکردەی فەرەنگەکانیان لەو شەڕانەدا بەدیل گرتووە. لە سەردەمی حومکڕانی دا ئەم پادشایەتی سوریاو موسڵو ئەرمەنستان جێگیر دەکرد} هاتووە: {تیرە کوردەکانی گۆتۆو بوهتانو یەزیدی سنجار... چونە ژێر ئالایەوە} . وە سەرکردەی تری کورد لەوانە (سوڵتان مظفرالدين) کەوکەبرییە کە ڕابردو ئاماژەمان بە ژیاننامەی کردووەو، لای (محمد امین زەکی بەگ) تورکەو بە کورد بووەو وە (حسام الدين حسن باريك)ەکە خزمەتێکی زۆری هەبووە لە (عەککا)داو ئاخری لەگەڵ میر(سيف‌الدين علي مشطوب)دا بەدیل دەگیرێ، وە (میر عیسای هەکاری)و ئەمیر (عزالدين مومسك)ن، کە لە هەموو جەنگەکانی صلاح‌الدين بەشداربووەو باوکی (ابن حاجب الكردي)یە (مردن ٥٨٥)...وە زۆری تر (مشاهير كرد وكردستان/ محمد امين زكی بگ)سەیر بکە. (وەرگێڕ)

دوژمن کەوتە جموجۆڵو هەرەکەت بەرەو باڵی ڕاستی مسوڵمانانو شا (مظفر) زۆر بەتوندی بەرەوڕویان بۆوەو، سوڵتان زانی هێرشەکە سەختە لەسەری و، لەشکرەکە کەوتنە گەرمەی شەڕەوەو، سوڵتان هاواری دەکرد (بەخێربێ شەهیدبوون)و ڕیزەکانی دەبڕینو تیرەکان بە دەوروپشتی دەکەوتن، بێئەوەی خۆی سڵ بکاتو، شوێنی ئەو ئاوە لە بۆوەو تەنیا پاڵەوانی بەدەورەوە مابوو، بەڵام نەگەڕایەوە بە شمشێر ڕاماڵی دەبرد، کاتێ مسوڵمانان بۆ شاییو کەلێنی شوێنی ئەویان بینی چونە ئەم مەیدانەوە، هەرچەندە هەندێ ترسنۆك ڕایانکرد لە جەنگەکەدا، بەڵام سوڵتان توانی کۆمەڵە پاڵەوانێ لەدەوری خۆیدا کۆبکاتەوە کە بەسەختی بجەنگن، وە سوڵتان لەگەڵ ئەو تەنگانەیەداشدا کە خەبات دەکات بیری نەخشەکێشانی باشی پشتگوێ نەخستو بینی سوپای فەڕەنگی لە گردەوە دێنە خوارەو نەیهێشت کە سوپایەکەی شوێنیان بکەون، هەتا پشت دەکەنەوەو باردەکەن، ئەوکاتە (سەلاحەددین) پشتی لێ‌سەندنو تۆقینو زۆریان لێ‌کوژرانو، لە ڕاکردن کەوتنە توندیو لەشکری مسوڵمانەکان ڕاوەدونانیان دەکردنو، هەتا خەریك بوو بانگی ئێولرە بدات، مسوڵمانان نوێژی (ئێوارە)یان کرد دەستیان بە پشودان کرد.

(سەلاحەددین) لە چادری تایبەتی خۆیدا کۆبونەوەی خۆی بەڕاوێژکارانی خۆی ئەنجامدا، دڵخۆشی خۆی بەم سەرکەوتنەی ئەم ڕۆژەی پیشاندا (قازی عیسای هەکاری)[1] زاناو شەرع زان لە بلێسەی شەڕدا بە شمشێری بڕندەی خۆی لەگەڵیدا بوو، گرفتاری یەکی باشی بینیو سوڵتان زۆر ڕای لێبوو.

لێی دەگێڕنەوە: کاتێ برای قازی بە ناوی (ظهيرة الدين) لەو ڕۆژەدا شەهید بوو میرەکانی بۆ پرسەو سەرخۆشی لێکردن هاتنە لایو ئەویش لە خۆشیان پێدەکەنیو دەڵێ ئیمڕۆ ڕۆژی پیرۆزبایی یە نەك سەرەخۆشی، ئەو شەهیدبووە!!

---

١) هەکاری: لە المنجد في الاعلام)دا تیرەیەکی کوردە لە ویلایەتی واندا نیشتەجێ بوون هەم لە دەوروبەریدا لە تورکیاو ئێراندا، سەردەمێ سەربەخۆبوون لە ناوی دا وڵاتی ئەوان بە هەکاری ناسراوە. (وەرگێڕ)

ئەندێشەى سەر دڵى سوڵتان ئەوە بوو كە فەڕەنگەكان سێ (بورج)ى بەرزيان دروستكردبوو كە هەر بوورجە (٥) چين بوو، هەمووشيان پڕ لە جەنگاوەربوونو دەورى شورەى (عەككا) يان دابوو، مسوڵمانانى ناوەوەيان تير باران دەكردنو ئەنجا ئاگر بارانيان دەكردنو دەگەيشتە ماڵانو ئاگرى دەداو ئەو شوێنانەش بێ ترس بوون، ئەم بوورجانەش قايم بوون بە پێستێ داپۆشرابوون كە بە (سركە) تەڕكرابوون تا ئاگرى گولله ئاگرينەكانى مسوڵمانان نەيان سوتێنن، گوللەى موسڵمانەكانيان دەگەيشتێ بەڵام كارى لێ نەدەكردن، سوڵتان دڵتەنگ بوو دەترسا لەو قاتو قڕەيەى توشى مسوڵمانان بووە، كە زۆر كوشندەو وێرانكەرە، كاتێ نامەى باڵندەيى پێگەيىو كارى ئەم بوورجانەى تێدا بوو بۆ لەناو بردنو قڕتێ خستن، نيگەرانى زياتر دڵى سوڵتانى داگرت، سوڵتان دەستوريدا كە پەلامارى سەر لەشكرى فەڕەنگى بدرێ، تا ئەو بوورجانە سەرقاڵ بكاتو بۆردومان كردن ڕابگرن، ئەنجا خاچييەكان بوون بە دوو تيپەوە يەكێكيان لەگەڵ (سەلاحەددين)دا دەجەنگاو تيپى تريش پەلامارى گەمارۆدراوانى ناوشورەكانيان دەدا.

(٨) ڕۆژ جەنگ نەپسايەوە بێئەوەى هيچ لايەك بەسەر لاكەى تردا سەربكەوێت، ئەنجا دەروى لەلايەكەوە لێكرايەوە كە قەت بە خەياڵيدا نەدەهات، ئەوە بوو وەستايەكى شارەزاى خەڵكى (ديمەشق)ى هاتە لا، شارەزاييەكى چاكى بوو بە ئاگر تێبەردانو چى ئاگر دەكاتەوەو چى دەيكوژێنێتەوە، چووە لاى سوڵتانو پێى ووت: من دەتوانم ئەو بوورجانە ئاگر تێبەردەمو كاريگەرى (سركە)ى سەر پێستەكەيانى لاببات.

مير (قەرەقوش) بڕواى نەدەكردو وايزانى وڕێنە دەكات، بەڵام (سەلاحەددين) ووتى: جاچى تێ دەچێ بێئەو ئاميرو كەرەستانەى بدەينێو پلانى خۆى تاقى بكاتەوە، ئەگەر ڕاستبێ سوپاسى خواى دەكەين! ئەم پياوە هات چەند مەنجەڵەكى بێ ئاگرى هاوێشتە ئەم بوورجانەو هيچ شتێ ڕوينەدا، ئەو فەڕەنگانەى لەناويدا بوون گاڵتەو گەپيان دەكردو، لەبەشى سەرەوەى بوورجەكەدا كۆبوونەوەو گاڵتەيان

دەكرد، هەبوو سەماى دەكردو يارى دەكردو بێ خەم بوو، ئەنجا باباى ديمەشقى فێڵى خۆى دەست پێكردو، مەنجەڵى پڕ لە ئاگرى داگيرساوى هەڵدانە ناوو بورجەكە زۆر بەسەختى ئاگرى تێ بەربوو، تۆقينى خستە دڵى سەماكرو گۆرانى بێژانەوە، قيژو هاواريان لێ بەرزبۆوەو، بەترسەوە بوورجەكانيان بەتاڵ دەكرد، بەردەوام ئەم وەستايە كارامەيە بەردومانى خۆى دەوام پێدا تا هەر سێ بوورجەكەى سوتاندو دانيشتوانى ناوى بەسەرگەردانى يەوە لێيان هاتنە دەرەوە كە وەسفى ناكرێ.

(سەلاحەددين) بە كارى وەستايەكە زۆر دڵخۆش بوو، بڕە پارەكى زۆرى پێدا، ئەويش مەردانە دايەوە دەستىو ووتى: من ئەم كارەم تەنيا بۆ خوا كردووە نەك بۆ بەخشينى سوڵتان!!

كەوتنى ئەم بوورجانە كاردانەوەكى گەورەى هەبوو بۆ سەر فەڕەنگەكانو، كتوپڕ جەنگيان بڕىو، وەك بڵێى بكشێنەوە بۆ دواوە، (سەلاحەددين) مژدەى سەركەوتنى بۆ مسوڵمانانى (شام)و (ميسر)و (جەزيرە) ناردو، داواى سوپاى خۆرهەڵاتى كردو، ميرەكانيش بێدواكەوتن بەدەنگيەوە چون، گەمارۆدراوان بۆ سەقامگيرىو چەسپاوى لە بەرامبەرى هێرشەكانى دوژمندا هەوڵى زۆريانداء، سوربوون، كە مام ناوەندى بكەن لە قوتى خواردندا، تا دانيشتوان توشى برسيەتىو قاتىو قوڕى زۆر نەبن، كە كۆمەڵە نەخۆشييەك لەگەڵ خۆيدا دێنێ چارەكردنيان ناكرێت، بەزەيى خوا بوو كە بورجى (الذباب) پارێزگارى لەبەندەرى شار دەكردو دەرفەتى نەدەدا دوژمن نزيك بكەوێتەوە لێىو بەوێدا كەشتى مسوڵمانان هاتوچۆيان دەكردو بە تەنگەبەرەكەيدا دەڕۆيشتنو فرياگوزارييان تێدا هەڵگرتبوو، فەڕەنگ زانيان ئەم بورجە لەوێدا يارمەتيدەرى سەركەوتنى مسوڵمانان دەدات لەناو شارو دەرەوەدا، بۆيە بە ئاگر بۆردومانيان كرد هەتا بيسوتێنن، بەڵام خۆڕاگرى بەرگريكەران بوارى نەدا بچنە ناوييەوەو، دواى ئەوەى زانيان زيانيان لە دەورى ئەودا زۆر زۆرتر دەبێو بۆيان ناگيرێ، بەجێيان هێشت.

سوپای فەڕەنگی بەردەوامو بێ پسانەوە بوو، تا سولّتان لە دەروندا بێزار بوو، کاری کردە تەندروستییەکەیو توشی زەردەتا (الحمى الصفراء)[1] بوو، دیسانەوە توشی هەندێ لە سوپای مسولّمانانو فەڕەنگەکانیش بوو، چونکە پەتایەکە وەکو باران لەو شوێنەدا دەباری، مسولّمانان لە ژیانی (سەلاحەددین) ترسانو بەباشیان زانی دوری خەنەوەو، بیبەنە ژێر چادرێ لە دوورەوە پشویدات‌و ئەم تایەش زیاتر لەم تێکۆشانەدا شەکەتی نەکات، بەڵام وتی: ئەگەر بشمرم، دەبێ (سەلاحەددین) لە مەیدانی جەنگدا بمرێو، پاشان ئەم هەڵبەستەی (ابن زوبێر) دەکات بە بەڵگەو دەڵێ:[2]

(فاقتلاني ومالكاً واقتلوا مالكا معي).

ئەوەی ئازاری سولّتانی زۆرترکرد ئەوەبوو ئەو کەشتییانەی لە (میسر)ەوە دەهاتن توێشوویان بۆ جەنگاوەرو گەمارۆدراوان هەڵدەگرت ڕەشاباو گەردەلول تێکی شکاندونو، بە کەلوپەلەوە لە دەریادا نقوم دەبوون، هەم کاریشی کردە سەر ئەوانەی برسی بوونو چاوەڕوانی خواردنیان لەناوەوەو دەرەوەی شورەوە دەکرد، سولّتان ڕوی لە زاناکانی دەوری کرد، کە قورئانی بەسەردا بخوێننەوە هەم فەرموودەکان تا فێنکی بە دڵی بدەن، ئەمەش چارەیەکی ئیمانیە کە لە تەنگەژەی سەختدا پەنای بۆ دەبردرێو ئارامیو ئاسودەیی دەبەخشێت[1].

---

١) زەردەتا: نەخۆشیەکی درمی میکرۆبییە، بە هۆی مێشولەی ئادیسەوە پەیدا دەبیّو بڵاودەبێتەوەو دەبێتە هۆی تاوو زەردووەییو وپژانی خوێن لەگەدەدا. قاموس العلمی/ج ٢/ط١/ کمال جلال غریب / ل ٢٢٥.

٢) (ابن زبیر) ئەم سەحابیە بوو کە لەگەڵ ئیمام حوسێن دا ڕازی نەبوون بەیعەت بەیەزیدەوە بکەن، ئەوە بوو لە ناو کەعبەدا شەهیدکرا. پیاوانی دەوری پێغەمبەر ﷺ/ خالید محمد خالید / سەیریکە، بەناوی (عبد الله کوڕی زوبێر) (وەرگێڕ)

٣) {واستعینوا بالصبر والصلاة}، واتە: داوای یاریدە بکەن بە خۆڕاگریو نوێژ. {الابذکر الله تطمئن القلوب}، بێگومان بەیادی خوا دڵان ئارام دەبنەوە. (دایل کارنگ) دەڵێ: {نوێژ لەوکارەی دڵە ڕاوکەت بۆیەیدا دەکات دورت دەخاتەوە}. {نوێژ وات لێدەکات هەست بەوە بکەیت تۆ تەنیا نی بە خوات لەگەڵدایە} {نوێژ هانت دەدات بۆ کارکردن هەر چەندە دژواربێ}. نوێژیش کەبەشێکە لە یادی خواو قورئان خوێندن باشترین تێفرۆ سماندنە بۆ دڵان. (دع الفلق وابدء الحیاة/ دایل کارنیجی) بخوێنەوە. (وەرگێڕ)

ئەنجا سوپای ئەورووپی دەستیکرد بە هاتنو........ هەموو خەمی فەرەنگ چونە ناو (عەككا) بوو، بەڵام سەنگەرو خەندەكی دەوری رێگر بوو لەبەردەمیدا، بۆیە دەستیان كرد بەپڕكردنەوەی بەبەردو تاوێرو تەخت كردنو هەمواركردنی بە خوڵو گڵ، تا رێگایەكی خێرا بكەنەوە بۆ هێرش بردن، گەمارۆدراوانیش بەم كارەی دوژمنان دەستەوەستان دانەمانو، دەچوونە سەر شورەكانو بە ئاگر ئەوانەیان بۆردومان دەكرد كە بەباشی هەوڵیان دەدا بۆ لابردنی سەنگەرەكەو، ئەو ئاگر كەوتنەوەیە تۆقینی دروستكردو نەتوانرا ئیشی تێدا بكرێ، كۆمەڵێ فیداكاری لەژێر پاسەوانی برا جەنگەوەرانیاندا هەڵسان چوون ئەم سەنگەرانە پاكژ بكەنەوە لەوەی خراوەتە ناویان، ئەمەش كارێكی پاڵەوانەی بێ وێنە بوو.

دیسانەوە (سەلاحەددین) ویستی خاچیەكان سەرقاڵ بكات بە هێرشێكی لەناوبەر بۆ سەر جێگاكانیان، بینی ئەم سەنگەرانە رێگرن لە بەرامبەر هێرشەكانیان، بۆیە رقی خۆی خواردەوەو ئارامی گرت، هەر چەندە زۆری سوپای (خاچییەكان) كاریگەری یەكی یەكلاكەرەوەیان هەبوو، نەخوازەلا لە (جەنگی دەریایی)دا، كەشتیگەلی (فەرەنگی) ویستیان شوێن ئەو كەشتی یانە بكەون كە هی مسوڵمانانەو لە (میسر) ەوە دێنو، ئەوان توانیان دەستیان بەسەردا بگرن، بەڵام كەشتییەوانەكان هەوڵیان داكەشتییەكان بە بارەوە بسوتێنن، تا وەكو نەبنە كۆمەكی یەكی خۆراكی بۆ دوژمنان، بۆیە بە ناچارییەوە كەشتییەكان سوتێنران، تا سودیان بۆ خاچییەكان نەگەڕێتەوە.

گەمارۆدراوان سكاڵای زۆریان لێ بەرزبۆوە لەبەر تینی هێرشەكانو نەمانی توێشو، بۆیە بەناچارییەوە (سەلاحەددین) هەوڵیدا جەنگەكە رابگرێو ئاگربەست دەست پێ بكات بە تەسلیم بوون، دوای ئەوەی خاچییەكان دەسەڵاتیان بەسەر سەنگەرەكاندا گرتو توانیان بەسەریدا بپەڕنەوەو، ئەو مەرجە سەختانەی دوژمنی پەسەندكرد دوای ئاگربەستێكی سەختی سێ هەفتەیی لە نێوان پاڵ پێوەنانو راكێشاندا.

سەخترین مەرجی ئەوە ئەوەبو كە شارەكە بە هەرچی لەناویاندا یە لـە ئـامێری جەنگو زەخیرەو تفاقو ئامێری سـواری بـە فەرەنگـەكان بـسپێرێنو مـسولمانان (٢٠٠) هەزار دینار رزگارانـە بـدەن لـەدیلی یـانو، (١٥٠٠) دیلـی خاچـییەكان بەربدەنو خاچی مەسیحی یان بدەنەوە، دیارتریت پـەیمان شـكێنی ئـەویاخی یانـە ئەوە بوو بەرلە باركردن (٣) هەزار پیاو یان كوشت، بەلام سولتان كـە ئـەم پـەیمان شكێنییەی بیستەوە ناردنی مالو خاچو دیلـی فـەرەنگی رەفزكـردو، ئـەوەش زۆر كەمترە،كەچاوەروانی دەكرا لەبەرامبەر ئەم زیانە جەرگ برەدا.

سولتان لە جەنگی (عەككا)دا لە بەرامبەر سوپایەكدا خـەباتی كـرد، كـە لـە توانای مسولمانانـدا نەبوو، دیسانەوە شاكانی مسولمانانو میرەكانیان لـە (شـام)و (میـسر)و (جـەزیرە)دا هەرچـی لـە توانایانـدا بـوو درێخییـان نـەكرد بـۆ بەرەوروبوونەوەی شەر، كەس لە ئەركی پێویستی خۆی تەمبـەلی نـەكرد، هەنـدێ مێژوونووس هەولیانداوە وادەربخەن، كە هەلمـەتی سـێیەم كـە (سـەلاحەددین) لـە بەرامبەریدا وەستا وەكو هەردوو هەلمەتی رابردوو چالاكی جەنگیو هاندانی دینی تێدا نەمابوو: چونكە ئەوانەی بە هێرشی سێیەم هەلسان هـەموو خـاوەن تـەماعی كەسایەتی بوون، بێئـەوەی مەبەسـتی ئـاینی گـەورەیان هـەبێ، بـەلام واقیعەكـە پێچەوانەی ئەوەیە، ئەو ئامێرە لەناوبەرانەی لە هەلمەتی سێیەمدا بەكارهێنراونو، سوارچاكی جەنگ بون، كە لە رابردودا وێنەی نەبووە، هەردوو هەلمەتی رابـردووش دوورنەبوون لـە مەبەسـتی كەسـایەتی لەلایـەن ئەوانەوە،كـە هـاتوون میرنـشینی فەرەنگی فراوان بكەن.

رەنگە ئەوانەی بۆ ئەو رایـەوە دەچـن دەیانـەوێ لـە خـەباتی (سـەلاحەددین)و شاكاری ئەو كەم بكەنەوە، دێن بەراوردكاری لە نێـوان رابـردوو ئێـستادا دەكـەن، كەلەسەر راستییەك دانەمەزراوە.

مامۆستا (محمد فري ابو حديد) لەروی ئەوانەوە ئاشكرای كردوە كاتێ لەروانینی خۆیەوە هەلوێستە كە كـورت دەكاتـەوە: (هـەموو ئـەوە بۆمـان ئاشـكرا دەكـات

ئەوانەی سەرۆکی جەنگی خاچی سێیەم هەڵمەت بوون بە شێوەیەکی شپرزەیی وەکو ئامادەکردنەکانی جەنگەکانی سەرەتایی خۆیان ساز نەدابوو، بەڵکو بۆ مەبەستو نیازەکی دەست نیشانکراو هاتبوونو، هەریەکەیان لەلایەن خۆیەوە بۆ نیشانەیەك دەڕۆیی کە پێویستە بی پێکێت).[1]

ئەگەر مامۆستا (فەری) سەرەنجی ئەو ڕوداوە یەك بەدوایەکانەو هاندەرەکانی دابایە لەسەر بازگەی خاچپیدا دەیزانی، کە هەڵمەتی سێیەم لە هەموو هەڵمەتەکان بەهێزترو سەخت تربووە، چونکە لە ئاکامی گەڕانەوەی (قودس)ەوە بوو کە کلێسای بە توندی هەژاند، هەرچەندە ئاکامی (عەککا) خۆشیش نەبوبیّ، وەکو وتراوە جەنگ ڕۆژێ بۆ ئێمەیەو ڕۆژێ لە دژی ئێمەیە.[2]

---

١) (صلاح الدين الايوبي/ الاستاذ محمد فري ابو حديد / ل :١٧ / ط دار الهلال .

٢) هەرچی ئارشاك سافرا استیانە لە (کوردو کوردستان / ل: ٥٠)دا دەنوسیّ، کەوەرگێڕانی (ئەمین شوان)ە:
{لەلایەکی ترەوە پاشایان ڕیچاردی شێر دڵ، فیلیپا ئۆگست ئەوەندە دژو دوژمن بەیەك بوون کە لەترسی یەکتر جوڵەیان بۆ نەدەکرا، بۆیە دوای داگیرکردنی چەند شارێکی کەناری دەریا لە سوریادا ناچارمان کە بکشێنەوە دواوە پاش ئەوەی زۆریان لەگەڵ خۆدا برد بەڵام کەم فێربوون لەگەڵ ئەوەشدا کە (صلاح الدین) لە (١١٩٣)دا مردو چوارەم شالاّوی بیّ تینو ئاکامی خاچداران دوا بەدوای ئەوە ڕویدا، بەڵام هەر شەخسی یەتی پاڵەوانانەی ئەو بوو کە پێشی لە هێزە خاچدارەکان گرت ڕۆژهەلاّتی لەجەنگو جەنگالّیان پاراست} .
لە (مشاهير الكرد وكردستان/ محمد امين زكي/ ج ٢/ ل: ٢٤)دا السليمانيه/ ٢٠٠٥ دا هاتووە:
{سوپای فەرەنگ گەیشتە(عەککا) گەمارۆیدا، سوڵتان بەهێزی گەڕۆکی هەمیشە لەپێشیانەوە بوو دەجەنگاو، دەگەڕایەوە دیسان دەبەرێکرا دەچووە، تا (عەککا) کەوتە بەر دەستی فەرەنگەکان، دوای ئەوی دووساڵی ڕەبەق گەمارۆدراو، وەکو دڕندەی زیانبەخش چونە ناویەوەو خراپەکاریان تێدا کردو زۆر خەڵکی بێگوناهیان کوشت، جیهان جیاوازییەکی گەورە دەبینیّ لە نێوان ئەوانو ئەم پاڵەوانەدا. سوڵتان ئەو کاتە پلانەکی زیرەکانەی دارشت بۆ پەك حستنی جوڵەی خاچییەکانو، بە سەرکەوتنی سەیر، سەرکەوتنو نەیهێشت بچنە ناو قودسەوەو هیوای بڕین. دوای ئەوەی لە (٢٢/ شەعبان ٥٨٨ ك) / ٢ ئەیلول ١١٩٢) شەڕە خوێناویەکە دوایی هات کە (٥) ساڵی پیّ چوو، ئاگر بەست لە نێوان هەردوو لا کرا، لەم جەنگەشدا سەرکەوتن بۆ پاڵەوانی مەزنی ئیسلام سوڵتان سەلاحەددین بوو...} .
بەڵام (صالح قەفتان) لە (مێژوی گەلی کورد/ ل١٨٩)دا دەنوسیّ: (لەولاوە کە ناوبانگی سەندنەوەی قودس لەلایەن مسوڵمانانەوە گەشتە ئەوروپاو ئاگری (تعصب) یان دووبارە بڵێسەی سەندەوە، هەموویان بە جاریّ بۆ تۆڵە سەندنەوە هەڵسانە سەرپیّ و، دراوەکی زۆریان کۆکردەوە ناویان نا (سەرانەی صلاح الدین) لەشکرەکی بیّ دادیان پێکەوە ناو لە هەموو لایەکەوە بەرەو خۆرهەڵات هاتن بۆ فەلەستین ئەمجارە

پاشاکانیان سەر لەشکر بوون. ئیمپراتۆری ئەڵمان‌و مەلیکی ئینگلیز کە (ڕێچارد شێر دڵ) یان پێ ئەگوت مەلیکی فەرەنساو گەلێ ناودار هاوڕێی هاتنی ئەمجارە بوون!

سوڵتان گەڕایەوە شام، چونکە زانی گاورەکان دێنەوە سەری. لەوێدا دەستی کرد بە تارەکاتی سوپاگەری. لە (صور) بەولاوە هەرچی قەڵای نەگیراوی فەلەستین مابوو گشتی زەوت کرد، لەدوای ئەمانە لەشکری صەلیبی سێیەم دەستی کرد بە هاتن لە (٥٨٥ ك)دا جۆری سوپاگەری سولتان گۆڕابوو. لەپڕ کێشی یەوە کەوتبوو قایمکاری. باری گەردوون وای دەگەیاند کە فەرتەنەیەکی خوێنڕێژی گەورە ئەبێت. ئەو فەرەنگانەی کە بەڕەڵابوبون زۆربەیان لە صورو تەرابلوسدا بەپێچەوانەی پەیمانەکەیان چەکیان هەلگرتبووە، ئەمانە هاتن دەوری قەڵای (عەکا)یاندا، سوڵتان بە لەشکرەوە هات بۆ یارمەتی قەڵاکە. ئەم پێچانە دوو ساڵ درێژە بۆوە. سوڵتان ئەیتوانی دوژمن بشکێنێ‌و (عەککا) ڕزگار بکات. لێرەشدا دووبارە کەمتر خەمی کرایەوە، لەبەر ئەمە کۆمەکەکانی دوژمن هەمیشە بە ئاسانی ئەهات‌و لە عەککادا شەڕی خوێنڕێژانەکرا.

گەلێ جار لەشکری سوڵتان فەرەنگەکانی بە پاشا کشاندنەوەو کۆمەك چۆتە عەککاوە بۆ ئیسلامەکان، بەڵام لەسەر ئەمە شا دوژمن نەبەزیوە، دوبارە شارەکەی پێچاوەتەوەو قەڵای تازەیان بە دەوریا ئەکردەوە زاتیان وەها زۆر ببو ئەو جارە ئەوان پەلاماری لەشکری سوڵتانیان ئەدا، باری ڕەزم نارایی بلاوەی بە هێزی ئیسلام کردبوو، لەشکری گەورەش لە (حەزروبە) دۆڕاو دور بۆ یارمەتی عەککا زستانی ڕانەبوارد.

سوڵتان لە نەبەزی دوژمن‌و سستی‌و خۆلە شەڕ پاراستنی سەردارەکانی خۆی مەترسی دواڕۆژی کەوتبۆ دڵەوە. لە تاوا بۆ کۆمەك بەهەموو لایەکا نوسراوی ئەنارد. دوژمنی لەدەوری عەککا بە تارەکات کردن ڕابوارد لە (٥٨٦ ك)دا جەنگ داگیرسایەوە ئوستولی میسر ئوستوڵەکەی دوژمنی شکاندو کۆمەکی گەیاندە عەککا لەم کاتەدا بەرایی لەشکری ئەڵمان گەیشتە ئەوانەوە لەوێ ئیمپراتۆرەکەیان خنکا.

سوڵتان کە ئەی بیست بە هیوای کۆمەك ناردن قاقەزی بۆ پاشاکانی ئیسلام نارد کە هیچیان بە دەنگیەوە نەهاتن...} . وە دەنوسێ: {دوژمن لەبەرەو لە دەریاوە شارەکەی ئێجگار تەنگە تاو کردبو برسیەتی‌و نەخۆشی لەلایەکەوە ئاگری مەنجەنیقی دوژمن لەلایەکی ترەوە هێزی خۆگرتنی لەناو قەڵادا نەهێشتبۆوە.

ئەم قەڵا پڕ شان‌و شەرەفی ئیسلامە دووساڵ بۆ خۆی لەبەر هەڵمەتی صەلیبەکانا گرتبوو .لە هیچ لایەکەوە کۆمەکی نەئەگەیشتێ. بەڕاستی کەڵکی خۆگرتن نەمابوو لە قەڵاکەدا، لەبەر ئەوە بە ناچاری لە هاوینی ٥٨٧ ك ١١٩١ز دا بە هەندێ شەرت‌و مەرج قەڵاکە خۆیدا بەدەستەوە، یەکێ لەومەرجانە ئەوە بوو کەدیل ناکوژرێ بەڵام لەولاوە لای فەرەنگەکان هیچ هۆشی ئینسانییەت نەمابوو، چەکدارو بێ چەك وەك جانەوەر هەمووخەڵکی شارەکەیان کوشت، لەم خوێنخواریەدا قەڕاڵەکانی ئینگلیزو فەرەنساش بەشداربوون، لە مێژوودا دەنگ وابلاوە کە (٦٠) هەزار مسوڵمان لەناوچووە. هێشتا عەککا نەگیراوە کە بەربەرەکانی‌و ناکۆکی کەوتبووە ناو سەردارەکانی فەرەنگەوە قەڕاڵێ فەرەنسەو قەڕاڵی ئینگلیز ناخۆشیان بوو، لەسەر قسەی ڕەقی مەلیکی ئینگلیز، مەلیکی فەرەنسە تۆراو لە دوای کەوتنی عەککا فەلەستینی بەجێ هێشت، بەکورتی ناکۆکی‌و تێك چونی ئەمانە هێزو پەرۆشی فەرەنگەکانی سست کردبو کە ئەمە بەکەڵکی ئیسلام هات.

سوڵتان کەوتە جەنگی چەتەگەرییەوە دوورو نزیك کێشەی پێ ئەکردن. هەرچی لە سوپای صەلیب جیا بوباوە لەناوی ئەبردن، تەنانەت جارێکیان وەخت بوو -(ڕێچارد) مەلیکی ئینگلیز بگرێ. مەبەستیش لەمە ئەمە بو کە فەرەنگەکان بێزاربن‌و فەلەستین بەجێ بهێڵن، جا ریچارد شێردڵ زۆر چاك تێگەیشت بوو کە سوڵتان سەلاحەددین ناکەوێت‌و بەدرێژەی جەنگ بەیدەست ناکرێت. لەبەرئەوە لەگەڵ ئەم دوژمنە گەورەیە لەسەر جەنگ کەلکی نیە جا ئەم پەروایەو ج ئارەزوی بۆ بەریتانیا بەئەنجام ریچاردی هێنایە سەر ئەوەکە ئاشتی خوازی لەگەڵ سوڵتاندا بکات. هەرچەندە هیچ شتێ نەبوو کۆڵ بە سوڵتان بدات، بەلاّم بۆ ئەوەی ڕێی خوێن ڕشتن نەمێنێ‌و لەبەر دو ئەندێشەی تر سوڵتان قبوڵ کردنی ئاشتی بەباش زانی.

ئەنجا مەلیك (عادل)ی برای سوڵتان‌و ڕیچارد بۆ گفتوگۆی ئاشتی یەکتریان بینی ...} وە (صلاح قەفتان) باس دەکات، کە {لەدوای گەلێ هاتوچۆ وەها ڕێکەوتن کە ڕێچارد خوشکی خۆی بدات بەمەلیك (عادل) وخاکی فەلەستینی فەرەنگیش بەناوی جیاوازییەوە بدرێ بە خوشکەکەی‌و سوڵتانیش قودس بدات بەمەلیك (عادل) بەلاّم قەشەکان بەم جۆرە ڕێکەوتنە ڕازی نەبوون. لەم بەینەدا سوڵتان خەریکی هەندێ فەرمان بوو کە ئەگەر هاتوو لە جەنگ گەڕایەوە، ڕێگای هەڵسوڕان لە دوژمن بگرێ. لەبەر ئەوە ناردی (عەسقەلان)و (ڕەملە)و گەلێ جێگای تریان وێران کرد تاکو دوژمن نەتوانێ لەناوەوە بچێتەوە. لەم کاتەدا هەندێ دەنگ‌و باسی خراپی ناو بەریتانیا لە فەلەستین بلاوبۆوە ئەمە لەلایەکەوە. لەو لاشەوە بەربەرەکانی سوڵتانیش لە فەلەستین هیچ هیوای لە فەرەنگەکانا نەهێشتبوو. لەبەر ئەمانە مەلیکی ئینگلیز دوبارە تەنگەتاو بۆتەوە. مەترسی شکان‌و نەگرتنەوەی قودس هیوای ڕێچاردی هیچ نەهێشت. وڵات هەمووی وێران بوو. ئەم ڕوداوانە ئەمیرەکانی صەلیبیشی بە تەواوی بێزارکرد. لەبەر ئەمانە کۆگایەکی حەربی گیرا لەوێدا بڕیاریاندا کە واز لە قودس بێنن‌و بچنە سەرمیسر. ئەمجارە ڕێچارد بەناوی ئەهلی صەلیبییەوە داوای ئاشتی لە سوڵتان کرد لەسەر ئەوە لە ڕەملە مەجلیس گیرا. لە دوای گفتوگۆ ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە (یافە)ش بەدەست صەلیبییەوە بمێنێ.

جا بەوجۆرە هەردوولا جاری ئاشتی یاندا لە ڕەملە لە (١١٩٢ ز – ٥٨٨ ك). ئەمە بوو ئەنجامی سێیەمی سەفەری صەلیب. ئەم چەند سەد هەزار فیداییە کە بۆ گرتنی قودس هاتبووە فەلەستین ئەو دەیویست خوێنی هەموو ئیسلامی خۆرهەلاّت بڕێژێ. کەچی لەبەرامبەر ئەبەزیی‌و تێکۆشەری بەجەرگی وەك سەلاحەددین هیچی پێ نەکرا. تەنیا دوای لەناو چوونی ئەم دوو کین لە دڵە دوشاری گوێ بە حریان بە دەستەوە مابوو، بەشی سێ هەمیشی کە گیانی ڕزگاری بووە بە سایەی (گەمی یەکانیەوە خۆیان دەربازکردو گەڕانەوە ئەوروپا جا قارەمانی کوردو ئیسلام لەدوای چەنگ وەشاندنەکی پێنج ساڵە لەگەڵ لێشاوی دەم بە خوێنی ئەوروپاییان بەشان‌و شەرەف گەڕاوەتەوە قودس‌و دەستی کردۆتەوە بە ڕێکخستنی فەرمانی وڵاتەکە. ئەوەی ڕوخابوو تازەی کردەوە. مەکتەب‌و نەخۆشخانەی تازەشی دروست کرد. وە بەناوچەکانی وڵات گەڕاوەتەوە چووتە بەیروت‌و لەوەێوە چووە شام. کەچی داخی گرانم ئیتر نەحەسایەوە دوای فەرمانداین بۆ ئاوەدانکردنەوە جێگا وێرانەکان نەخۆش کەوت} (وەرگێڕ)

## مەلەوانەکی گیان بەخش ( پێشمەرگە ):

لەکاتی ئارام گرتنی شەودا باران دەباریە سەر ڕوبارو، گەمیو کەشتی ڕاوچییان لە بەرامبەر ڕەشابادا ڕاستو چەپ لارەی دەکردو، سەرما لەشی ڕاوچیانی هەڵدەلەرزاندو، بێ ئارام بوونەوە ماسولکەی شانو سنگیان هەڵدەلەرزیو چەقچۆ دایگرتبوون، بەڵام ڕێگای سەهوڵ وەشاندنی لێ نەگرتبوون بۆ گەڕان بە دوای ڕۆزیدا، ئەمەیان تۆڕی دادەنایەوەو، ئەویان نێچیری ناو تۆڕی کۆدەکردەوە کە بانگی بەیانی داو تروسکایی ڕوناکی دەستی بە دەرکەوتن کرد ڕێگا ڕوناك بۆوە تا هەر یەکێ لەڕاوچیەکان بۆ ماڵی خۆی کە نزیکی کەنارەکە بوو بڕواتەوەو ئەوەندەی خوا پێی داوە زۆر بێ، یان کەم بێ بەبەشی خودا ڕازییە.

(عیسی العوام) گەڕاوە ماڵەوە بۆ ناو زنجو کۆڵێتە بچوکەکەیو، بانگی خێزانەکەی کرد بە ناوی (سەلمەی بەکری) تا کۆڵەکەی لێ وەربگرێ، تا کاتێ بەیانی داهات گوند ڕوناك بۆوە وەکو جاران بە شێوەی گەڕیدەیی بیفرۆشێ، بەڵام کەس وەڵامی نەداوەو هەموو شوێنێکی نۆڕی ونەیدۆزیەوە، ئەوکاتە چووە بەسەرقاڵیو شەکەتی یەوە دانیشتو بیری لەوهەرایەی دوێنێ دەکردەوە کە لە نێوان ئەم ئەودا ڕوویداو هەڕەشەی لێکردبوو کە ئەم زنجە بەجێ بهێڵێو پەیوەندی بە سوپای (سەلاحەددین)ەوە بکات کە لە دەوری (قودس)دا ئۆردوی هەڵداوەو، وەکو هاوشێوەی ئافرەتانی خۆی بە ئەگەرەکانی هەڵدەستێو، خواردن ئامادە دەکاتو، خواردن هەڵدەگرێتو ئاو بۆ تینووەکان دەباتو دەرمان بۆ برینداران دەبات، سەرکۆنەی مێردەکەی دەکردو داوای لێدەکرد کە پەیوەندی بە سوپای

سەرکەوتووەوە بکاتو ئەرکی پیاوەتیو ئیسلامەتی بەجێ بێنێ، بەڵام بەقسەی ناخۆشو جەرگ بڕ وەڵامی دەداتەوەو پێی دەڵێ: (منی هەڵەشە پیاوی ڕمبازیو پەلامارنییە چەند خۆزگە دەکەم هەر بە منداڵی ڕاهێنانو مەشقم بکردبایە بۆ ئەسپ سواریو شمشێر وەشاندن، بەڵام ژینگەی ستەمکار وزەی منی لە نێوان کەشتیو تۆڕو ڕوباردا گەمارۆدا)!! بەڵام ژنەکەی بەتوندی وەڵامی دایەوە (هەر پیاوەو بەشی خۆی تێکۆشانو هەوڵی خۆی هەیەو، ئەگەر بچیە مەیدانەوە سەرکردەی سەرکەوتو لە شوێنێکدا داتدەنێ کە سودی تێدا هەبێت).

ئەویش زمانی تێکەڵو پێکەڵ دەکردو نەیدەزانی چۆن وەڵام بداتەوە!!

(عیسا) زانی کە ژنە دلێرو جەربەزەکەی لەو نائومێد بووەو بەتەنیا خۆی بۆ مەیدانی شەڕ چووەو وەڵامی بانگێشەکەری خەباتکاری داوەتەوە، بانگی ڕێزو سەربڵند، هەستی بەداخەکی جەرگ بڕ کرد، کاتێ بینی ژنەکی بێدەسەڵات وەڵامی ژنایەتی سەختی خۆی دەداتەوەو خۆی بەڕەوڕوی مردن دەکاتەوە، وەك سۆمای چاویەخەندەوە بەراوردی لە نێوان ورەی جێگیری ئەوو ورەی شلو دودڵی خۆیدا دەکرد، خوێن چووە دەمارەکانییەوەو خۆی ئامادەباش کرد، ئەنجا نیازی کرد بەرەو ناو قەدی قودس بکەوێتە ڕێگاوە. هەر لە دوورەوە کە گوێی لە دەنگی (الله اکبر)و (لا اله إلا الله) بوو هەستی بە دڵخۆشیو گەشاوەیی کردو، ئازایانە چووە ناو ڕەشماڵو تاوڵی سوپاوەو، داوای دیمانەیەکێ لەسەرکردەکانی پاسەوانانی کەتیبەی مسوڵمانانی کرد! ئەنجا داوای لێکرد کارێکی جەنگی بۆ دەست نیشان بکات کە لەگەڵ ئامادەسازیو توانای ئەودا بگونجێت، سەرکردەکە بیری لە کارەکەی ئەو کردەوەو، ئەنجا داوی لێکرد کە لەگەڵ کەشتیگەلی ئیسلامی دابڕوات لە خولی دەریاییدا، دیارە (عیسا)ش بەو پێیەی ڕاوچییەکی مەلەوانە دەتوانێ بڕواتە ناو شەپۆلە کەڵەکە کردووەکانەوە، بۆ دەرهێنانەوەی ئەو زەخیرەو ئامێرانەی کەوتونە ناو ئاوەوە، ئەم پیاوە لە خۆشیان خەنی بووبو لەکاتێکدا لە ڕێگایەك لە ڕێگاکانی تێکۆشاندا سەرکەوت، بۆیە بە شادمانییەوە ڕوی لەم کارە تازەیە کردو بە دڵسۆزی

یەوە لەگەڵ پیاوانی کەشتیگەلدا ئەرکی خۆی ڕاپەڕاندو، لەگەڵ شەپۆلدا کەوتە خەبات‌و بێ باکانە لەگەڵ مردندا کەوتە ململانێ! زۆرێکی لە ئامێرەکانی تێشوو ئامێری جەنگی رزگارکرد، هەتا وای لێ‌هات هاوڕێکانی ڕێزیان بۆ داناو بە گەورەیان گرت، (میر حسام الدین لؤلؤ) سەرۆکی کەشتیگەل نامەیەکی بۆ (سەلاحەددین) ڕەوانەکردو لەبارەی شارەزایی‌و دلێری (عیسا) دوابوو.

چەند ڕۆژ تێپەڕین‌و ئاگری جەنگ خۆشتربوو، هەردوو تیپە کێبەرکێکەرەکان پاڵەوانەتی نائاسایی‌و قوربانی ناوێزەیان دەرخست کە شوێنی سەر سوڕمانی بوو، پاشان ئاڵای حەق بەرزکراوەو سوپای ئیسلامی سەرکەوت، (بیت المقدس) بە شێوەیێ ڕوخا کە بەڵاو سەرشۆڕی بۆ خاچپییەکان بێ، تواناو هێزیان شکاو، پاشەکەشەیان کرد بەناو کوچەو کۆڵانەکان‌و ڕێگا درێژەکاندا، نەفەر هەبوو بەترسەوە ڕایدەکردو هەبوو بریندار بوو دڵەخورپەی گرتبوو، هەبوو کوژرابوو کەوتبوو، دیسانەوە چەند هەزاریان لێ بەدیل گیرابوو، وایانزانی (سەلاحەددین) وەکو ئەوان مامەڵە لەگەڵ دیلەکاندا دەکات کاتێ داگیریان کردبوو کە نە کچ لە ماڵی خۆیداو، نە نوێژکەر لە مزگەوتداو، نە بەساڵاچووەکان کە کەوتبوون بەجێیان نەهێشت..... ئەسپەکان لە زەلکاوی خوێنی ئەواندا سەردەکەوت‌و پەل‌و سکیان بە خوێن دەبو! بەڵێ وایاندەزانی کە ئەم پاڵەوانە بەرزە تۆڵەیان لێدەستێنێ، بەڵام کاتێ سەیریان کرد بینیان لێبوردن‌و چاوپۆشییەکی مەردانەی هەیە[1] .

---

١) لە (روح الدين الاسلامي/ عفيف عبدالفتاح طبارة)دا هاتووە: (میشود) لە کتێبەکەیدا (تأريخ الحروب الصلبية)دا دەنوسێ: (ئیسلام کە فەرمانی بە خەباتەکی لێبوردەیی کرد لەگەڵ ئاینەکانی تردا، بە تاریکەو ڕەهبانەکانی عەفو کردو، لە سەرانەدان چاوی لێ پۆشین و، کوشتنی ڕەهبانەکانی حەرام کرد، بەتایبەتی چونکە لە خواپەرستیدا دەمێننەوە، عومەری کوڕی خەتاب لە کاتی گرتنی قودسدا ئازاری کەسی نەدا، کەچی خاچپییەکان مسوڵمانانیان کوشت‌و جولەکەکانیان سوتاند لە کاتی چونە ناویاندا} .

لە کتێبی (الاسلام في قفص الاتهام/ شوقي ابو خليل/ ط٢/ دار الفكر)دا هاتووە: (ڕوبسون) لە کتێبی (تاريخ شارلكن)دا دەڵێ: (مسوڵمانان بەتەنیا تێکۆشان‌و لێبوردنییان پێکەوە گرێداوە لەگەڵ دینەکانی‌تردا، کاتێ بەسەریاندا زاڵ بوون وازیان لێ هێناون‌و ئازادیان کردون لە بەرزکردنەوەی دروشمی دینییاندا). (وەرگێڕ)

(سەلاحەددین) ئاهەنگی سەرکەوتنی دینی خوای لەناو ئاپۆرەیەکی جەماوەریدا گێڕاو چەند دەوارو تاوڵی گەورەی هەڵدان کە شوێنی فەوجە زۆرەکانی سەربازیو دەستەکانی خۆی تێدا ببنەوەوە، پاڵەوانان یەك بەیەك دەهاتنە کۆڕی ئەو، هەر سەربازە بەدەستی خۆی تەوقەی لەگەڵدا دەکردنو ستایشی دەستو بازو هیممەتو فریاکەوتنی دەکردنو دەستخۆشی لێدەکردن، لە دەوریدا میرو سەرکردەکان هەبوون، کە بەلاو تێکۆشانی هەریەکێ لە جەنگاوەرانیان بۆ دەگێڕایەوەو فەرماندەش بە خۆشیەوە پێدەکەنیو وەکو سەرکردەکی بە تواناو بەغیرەت سلاوی دەکرد، نۆرەی (عیسا العوام — عیسای مەلەوان)، هات (میر حسام الدین لؤلؤ) سەرکردەی کەشتی گەلی مسوڵمانان هەڵساو بە (سەلاحەددین)ی وت: ئەمە مەلەوانەکی کارامەیە گەورەم! ئەمە خۆی فڕێ دەدایە ناو شەپۆلەکانی ئاوو ئامێری قورسی ئاسنی دەردەهێناو بەشانی کزی هەڵی دەگرتو، چەند دەها تفاقو تێشوی گرانبەهای رزگار کردووەو یارمەتی سەرکەوتنو سەرفیرازی داوە! (سەلاحەددین) لەناو کۆڕەکەیدا هەڵساو سلاوی لێکردو تۆقەی لەگەڵدا کرد! بەلام ژنەکی بەرچاو کەوت بە خەندەوە (لا اله إلا الله) دەکاتو بەناو ڕیزەکاندا دێتو لە خۆشیان ئامێز لە (عیسا) دەداتو توند دەیگرێو هاوار دەکات: ئەوە لێرەیت ئەی هاوسەری خۆشەویستم؟ وتی (سەلما) کوێت دەویست منیش بە شوێن تۆدا بۆ ئەوێ هاتم.

(سەلاحەددین) حەقیقەتی ژنومێرد تێگەیشت بۆیە لەشەرمان ڕوی وەرگێڕا، تا ئامێزی بە پەرۆشیان لێکتر بەردا!! دیمەنە کاریگەرەکە کۆتایی پێ هاتو (سەلاحەددین) بانگی (عیسا)ی کردو بەخەندەوە لەمەڕ ژنەکەی پرسیاری لێکرد، بەلام قازی (بهاء الدین بن شداد) پەلەی کردو وتی: گەورەم ئەمە سەلمای بەکرییە، ئازاترین ژنەو بەرێزترین خانمە، بریندار بە سنگیخۆی بۆ ماوەکی دور دەگواستەوە بۆ دەوارو تاولکان لە مەیداندا، پاشان بۆ کوێی ویستایە نامەی دەفڕاندو، بە پەلەش وەلامی بۆ دەگەیشتەوە، هەی خوا تەمەنی ئەم خانمە درێژە بکات!!

(سەلاحەددین) لەناو کۆڕی خۆیدا هەڵسا سەرپێ‌و لەگەڵ (سەلما و مێردەکەی دوا ووتی: ئەی لەو دوو هاوسەرە دلێرە دەست خۆشی لە ژوانی بەرێزو شکۆ داریان دەکەم! ئاهەنگی سەرکەوتنەکە بە شادمانییەکی خۆش کۆتایی هات‌و هەردو هاوسەر بە کەیف خۆشی یەوە ڕۆیشتن، تا لە چادرەکی باشدا لە دوای شورەکانەوە دابنیشن. (عیسا) بە ژنەکەی ووت. گومانت وایە مانەوەمان لێرەدا زۆری پێ‌بچێت؟....... وەڵامی دایەوە:

لە هەندێ سەرکردەم بیستووە کە خاچییەکان بەو نزیکانە بۆ تۆڵەی تێشکانیان دێن‌و کۆمەکی نەپساوەیان لە دوای دەریاکانەوە بۆ دێت، چونکە (ئەوروپا) دوای بەزینیان لەسەر دەستی (سەلاحەددین) کۆڵ نادات! بە درێژایی ساڵانی ڕابردو سوپا بە دوای سوپای بۆ پاراستنی (بەیتولمەقدیس) ناردووە، گومانی تێدا نیە ئەگەر بزانێتەوە هەوڵەکانی هەمووی بەبا چووە ئەوە شێت ئەبێ‌و تیرو شیران دەسوێت! من متمانەشم بە سەرکەوتنی تەواو هەیە لەسەر دەستی (سەلاحەددین)!!

(عیسا) خەندەکی شیرین گرتی‌و بە سۆزەوە وتی! خوا دەزانێ من بە خولیایەکی بەپەرۆشەوە دەڕوانمە ساتی خەبات! خولیای تازەم لەگەڵ خوێنمدا تێکەڵ بووەو بە دەمارەکانمدا دەڕوات، من زۆر بەداخەوەم لەو ڕۆژانەی ڕابردووم، کە بە تەنیایی‌و لە چۆلی لە دەستم چون‌و، لە کارو کاسبییەکی کەمدا بەسەرم بردووە، دوای ماندوبونەکی لەدەستچووی ناپەسەند هەست بەمە دەکەم! بێئاگا بووم لە مەیدانی پیاوان‌و ناوجەرگەی پاڵەوانان، ئەی (سەلما)ی خۆشەویستم ئەگەر تۆ نەبایت ئاوا سست‌و تەمبەڵ‌و نەناسراو دەبوم کە لە ناخی دڵمەوە هەست بە سوکی سەرشۆڕی بکەم‌و لەگەڵ کێشەیەکی دەرونی دا ملبەملانە بکەم لە نێوان نەتوانین‌و ئارەزومەندی هیواکاندا! بەڵام ئێستا خەیاڵم وایە من گەورەی ئاوو، شۆڕە سواری دەریام!!

ئاینده دەسەڵاتت بەسەر دەریادا فراوانتر دەبیٚو دەبی بە قەراڵو میری کەشتیگەلو شەپۆلەکانو، (سەلاحەددین) بە تۆ سەربڵند بیٚو، ناوت دەبیٚ بە سرودی سوارو گورانی پاڵەوانان.

دوای فەرمانەکی نزیك تەپڵییەکان لێدرانو مسوڵمانان زانیان کە مەیدانەکە ئامادەبووەو، ئەو کەتیبانەی چاوەڕوان دەکران لە خۆر ئاواوە هێرشیان هێناوەو شاکانی ئەوروپا هاتوون کە (فەریدریك)و (شێر دڵ — قلب الاسد)و (فیلیپ)و (ئۆگست) یان سەر لەشکرن!

ئاپۆڕەو سوپایەکی بیٚ شومار لە دوای ئەوانەوەیە، لەگەڵ چەكو ئازووقەو کەشتیگەلی لەڕاددەبەدەر! (سەلاحەددین) هەڵسا بە کۆ کردنەوەی گروپو کۆمەڵەکانیو، هەر پاڵەوانەی لە شوێنی خۆیدا دادەناو، ئەوەندەی لە دەستی بیٚ وڵاتو قەڵاکان چەپاڵە دەدات، بەڵام سوپایەکی گەلیٚ زۆر ڕوی لە (عەککا) کردو بەتوندی تۆقی کردو عەرەب نشینەکان لەناو شورەکاندا جۆرەها چەرمەسەریو تەنگژەیان بینی، بەڵام سوپای عەرەبەکان لە دەرەوەدا لەگەڵ گەمارۆ دەراندا کەوتنە دەبە ڕێکرا چوونو جەنگێکی هەمیشەییو تاڵیان کرد، ئەم جارە سەرکەوتن یاوەری ئەوان بوو، ڕۆژێك بۆ هیلال بوو ڕۆژیٚ بۆ خاچییەکان بوو.

(سەلاحەددین) بیری لەو کەسانە دەکردەوە، کە لەپاش شورەکانەوە گەمارۆ دراون! خواردنو خواردنەوەیان لیٚ قەدەغەکراوەو دوژمن دەوری داونو، ناتوانن دەربازیان ببێت‌ئەنجا چۆن پەیوەندییان پێوە بکاتو لە هەواڵیان بکۆڵێتەوەو لە توێشو ئازوقەو کەلو پەلیان ئاگاداربیٚ! بیری کردەوەو ڕێگای دۆزییەوە کە (عیسای مەلەوان) بنێریٚ کە مەلەوانەکی لیٚ هاتووەو دەتوانیٚ شەپۆلەکانی دەریا بەدزیەوە ببڕیٚو بە دزییەوە نامە بۆ عەرەبەکان بگوازێتەوەو بە پیٚی توانا زێڕو زیویان بۆ هەڵگریٚو بباتو پاشان بگەڕێتەوەو وێنەیەکی ڕاستەقینەی ئەوەی بگریٚ کە بینیویەتی پاشی ختسووە! ڕەنگە بەم باڵوێزەییە شاراوەیی یە سودی جەنگی وەها پێشکەش بکات کە تیپو لەشکرەکان ئەنجامیان نەدابێت!

ئاوا (سەلاحەددین) بیرەکەی هەڵسەنگاندو تەگبیری کرد، ئەنجا ناردی بە شوێن هاتنی (عیسا)ی مەلەوانداو، سپاردەو فەرمانەکانی خۆی پێ گوت. لەسەر ئەم مەلەوانە گیانبەخشە پێویست بوو بە ناودەریا دا بڕواو ڕیزی کەشتی فەرەنگی ببڕێ، بێئەوەی کەس هەستی پێ بکات. پاشان بێتە لای شورە بەرزەکانو کەللە بەرێکی بدۆزێتەوە کە تەنگ بێ‌و بتوانێ لێوەی دزەبکاتو ئەگەر توانی‌و لە هەوڵەکانیدا سەرکەوت نامەو تورەکەکانی بداتە دەست (بهاء الدین قەرەقوش) کە سەرداری شارەو سەرکردەکی مسولمانانەو، ئارەزووەکانی (سەلاحەددین)ی پێ ڕابگەیەنێ... پاشان نامەی ئەوی بداتە دەستو پێشنیارەکانی بۆ ئاوەڵە بکاتەوە، شەویش شانۆیەکی بێ ترسە بۆ کارە جەربەزەکانی‌و، ئەو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد چاوی دوژمنانی لەسەر کەشتییەکان بچنە خەوەو بڕواتە ناو ئاو خۆی نقوم بکاتو هەوڵ بدات کە بێ هەستو خوست بڕواو کەس هەستی پێنەکات بە ڕۆیشتنی، لەو تاریکە ستانە دا بەر کەشتییەك یان تاوێرێ دەکەوێ‌و هەموو تەنگانەو ئازارێ دەبینێ، تا دەگاتە کەنارو، ئەنجا ئاوڕ لە هەموو لایەك دەداتەوە، تا بێ‌ترس ببێ‌و، زو بۆ مەبەستی خۆی بڕواتو، ڕۆژێکی درێژ بەناو شورەکاندا گوزەرە دەکاتو کە شەو دێتەوە دەگەڕێتەوە لای سەرکردەکەی، نامەو دەنگ‌و باسی هەڵگرتبوو!!

چەندی سەرماو سڕی زەستانی چەشت، ئەنجا کارەساتی شەوەزەنگ‌و زەبرو زەنگی دەریایی‌و تەزوی سەرما لە قوڵایی دەریادا!! ئەو بەختەوەرو خەنی بووبو، هەستی بە گەرمییەکی دەرونی دەکردو، ئیمانی بەهێزی هەمو ترس‌و لەرزەکی لێدەڕەوێنێتەوە!! بەردەوام نامەی نایابی دەگەیاند، تا مسولمانان پێگەیشتوو ترین‌و هەراشترین گوڵانی سەرکەوتنیان چنییەوە.

یەکێ لە ئێوارەکان وەکو جاران دزەی کردو تورەکەی زێڕی بۆ (قەرەقوش) هەڵگرتبوو، ئەو ئاوە ساردو سۆڵەی بڕی‌و هەر باکی نەبوو! مسولمانان چاوەڕوانی گەڕانەوەیان دەکرد، بەڵام ئەو درەنگ کەوت. کۆتری نامەبەر لە (عەککا)وە هات هەواڵ دەدا کە (عیسا) هیچی ئامادە نەکردووە!! خەڵکی پرسیاریان دەکردو

پێشبینیان دەکرد، هەبوو دەیوت زێڕ فریوی داوەو دەستی بەسەردا گرتووەو ڕایکردووە! هەبوو دەیوت فەڕەنگ دەستگیری کردووە، تا ڕاستییە پڕ لە ئازارەکە ئاشکرا بوو بینیان لاشەکەی سەر ئاو کەوتووەو بەرەو کە ناردیێ، بە پەلەچوون هەڵی بگرنەوە زانیان کە (عیسای مەلەوان)ەو تیرەکی دوژمن پێکاویەتی کە بۆی لە بۆسەدابوو!

داخەکە زۆر بە کەسەر بوو کاتێ سەیریان کرد پشتێنی لە بەژنی بەستووەو تورەکە زێرەکانی پێوەیەو تەواوەو هیچی لێدەر نەهاتووە! هەواڵەکە بە (سەلاحەددین) گەیشتەوەو ئەویش چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوونو فەرمانیدا بە ئاپۆرەیەکی جەماوەری بەڕێزو بە هەیبەتەوە بە خاکی بسپێرن!

(قازی بهاء الدین) کوڕی (شداد) ئێوارەیەك بەسەر کەناری دەریادا دەخولایەوە، بینی ئافرەتێ بەسەر ئاودا مەلە دەکات، واقی وڕماو سەراسیما بوو، چاوەڕوانی کرد، تا جلەکانی داناو بۆ ناو چادرەکەی گەڕایەوە، شوێنی کەوت تا بزانێ چییە، زانی کە ئەمە (سەلمای بەکری) ژنی (عیسا)یە!

بەسۆزەوە پرسی چی دەکەیت، هاواری کرد بە ئامادەباشییەوە، بیر لەوە دەکەمەوە کە فێری مەلەببم، تا نامەکانی (عیسای مەلەوان) درێژە پێبدەمو منیش بە شەهادەی نایابی ئەو شادببم!

(قازی) بەسەر سوڕمانو هاوارەوە وتی: بەڕاستی (سەلاحەددین) ڕاستی وت: ئەی لەو ژنو مێردە، قەدەر چاکی بەیەکتر شاد کردون!

# خـەمـەکانی پاڵـەوانێك

پاڵەوان مرۆڤێکە سزا دەخوات‌و ئازار هەڵدەگرێ وەکو چۆن دڵ خۆش‌و شـادمان دەبێت، بەڵام ئەو کەسەی بـەرەورووی سـوپای یـەك کیـشوەری ڕەبـەق دەبێتـەوەو چارەنووس ئەوەی بۆ داناوە، کەبە کەشتیگەڵ‌و ئـامێری هاوێـشتنەوەو بـە سـوپاو لەشکریەی هاتووە، تا هەڕەشە لە سوپای کەمی ئەوو هێزی ماندوی ئەو بکات، بە هـەموو هێـرش‌و پـەلامارە یـەك لـەدوا یەکەکانییـەوە، پێویـستە ئـەم پاڵەوانـە خەمەکانی لە خۆشیەکانی پتربـن‌و ئـازارە زۆرەکـانی‌و ئـەو خۆشـیەی هەشـیەتی نەیهێڵێت.

کاتێ (سەلاحەددین) خۆی بە تەنیا بینی لە بەرەنگاربوونەوەی یەك کیـشوەردا، ناچار بوو داوای یارمەتی لە وانە بکات کە خاوەنی یارمەتین‌و نامەیان بۆ بنێـرێ‌و هیممەتی مسوڵمانەتییان بخاتە جۆش‌و خرۆش، تا لەگەڵ ئـەودا هاوسـەنگەر بـبن، چونکە ئەو بەرگری لە ئیسلامەتی ئەوان دەکات‌و، تەنیا بەرگری لە خۆی ناکات!!

خامەی قازی (فاضل) نووسەری ئەم نامانـە بـوو، بـەڵام مانـاو بیرەکـانی پـێ گوتنی (سەلاحەددین) بوون‌و، وەسفی هەر کێشەیەك‌و ناخۆشـی یـەك بووایـە، تـا قازی بیری خاوەنەکەی وەرنەگرتبایە دەری نەدەبڕی! شـێوازی ئـەدەبی ئـەویش لـە دەربڕینی بەیانی خۆیدا کاریگەر بوو، بەڵام دەربڕینی ئەدەبیش لە بۆشەوە نایـەت، بەڵکو دەبـێ بیرەکـی بـەهێزو هەسـتەکی هەڵگیرسـاو دەستبەسـەر دەروازەکـانی کارتێکردنیدا بگرێ کە بیری (سەلاحەددین)ەو ئەو هەستەش ئاگرەکی داگیرساوە لە سۆزییەوەیە گوزارش دەکات.

(خەلیل مـوطران)[1] لەو سوتانەی (سـەلاحەددین) ڕاسـترین دەربـڕینو پـەیڤی دەربڕیوە کە لە بۆنەیەکی هاو شێوەی بۆنەی ئەو وتویەتی، هـەر چـەندەش ناگاتـە ئاستی بەرزی ئەو:

| | |
|---|---|
| ومما يضيم الحر شقوة موطـن | بنوة نيام عـنة، والـحر زائد |
| فهم فـي عديد للكفاح وعدة | بعين الاعـادي والمكافح واحـد |

بەم چەشنە (سەلاحەددین) لەبەردەم تەواوی (ئـەوروپا)دا ڕاوەسـتاو، نماینـدەی مسولّمانان بوو، هەبوو پلانی لەدژدا دەگێڕا نەك بێتە ژێر ئالآیەوە، هەبوو دەچوونە ناو دوژمن خەبەرو هەواڵی شاراوەی ئـەم تێکۆشـەرەی بـۆ دەبـردن. ئـەو کەسـەی کەمترین زیانی هەبوو ئەو کەسە بوو تـەنیا خـەریکی زانینـی هـەواڵو باسـەکانی جەنگەکانی (سەلاحەددین) بوو گوێکانی بۆ هەڵدەخست کە دەشی تـوانی دەسـتی ڕاستی ئەوبێ....... ئایا ئەم پاڵەوانە بـۆی نیـە خـەم بەمـەوە هـەڵبگرێ، کاتـێ نامەکەی ڕەوانە دەکاتو داوای یارمەتیو فریا ڕەسی دەکات؟!

(سەلاحەددین) سوربو لەسەر پشتگیری لێکردنی خەلیفەی عەبباسی لە خەباتی ئەو، تا قەناعەت بە نەیارانی بکات لـە (شـام)و (میـسر)و (جـەزیرە)دا[2]، دوای

١) خەلیل موطران: (١٨٧١ – ١٩٤٩ ز) شاعیرو ئەدیبەکی لوبنانی یەو، بە شـاعیری (القطـرین) ناسـراوە، دیوانی زۆری هەیە وەکو دیوانی خەلیل. (المنجد فی الاعلام) کورتکردنەوە. (وەرگێڕ)

٢) {سولّتان: لەلایەکی تریشەوە دەیویست ئیشوکاری کوردەکان ڕێکبخـا. فـەرمانی جـەزیرەو بۆتـان سـاغ بکاتەوە، چونکە هیوای گەورەی بە بازوە قەویـیەکانی ئێرە بوو} مێژووی گـەلی کـــورد/ صالح قەفتـان/ (ل ١٨٤). لە (الكرد في دائرة المعارف الاسلامية/ ت: حميد ريبـوار/ ل: ٥٦)دا هـاتووە: زۆربـەی سـوپای صلاح الدین تورك بوون، ژمارەکی زۆری کوردیـشی تیـّدابوو. لـە سـاڵی ١١٨٧ز دا صـلاح الـدین داوای یارمەتی لە کوردی ناوچەی باکوری دیجلە کرد بۆ خەبات، هەرچی هێزی جەزیرە بـو لێـرەو لـەوێ بـڵاوەی لێکرد لە ساڵی ١١٨٧ز دا، بەڵام هێزی دیاربەکرو زۆر لە هۆزەکان لە زۆرکاتدا شانبەشانی (صلاح الـدین) جەنگی گەرمیان دەکرد...} وە هاتووە: {خێزانی ئەبولهەیجاء}ی (هەزەبانی کـە بـە شـێوەی بنەماڵـەیی سەرۆکایەتی هەولێریان دەکرد ڕۆڵەکی سەرەکییان هـەبوو لـە بـەڕێوەبردنی ناوچـەکەداو، (ئـەبو لهیجـاء) ئەمیری سوپای پاراستنی (عەککا) بوو لەدەست پەلاماری خاچییەکانداو، بە هەموو توانای خۆی چـی لـە

ڕوخانی دەوڵەتی (فاتیمی) نامەی بۆ ناردو ئەو مەترسییە گەورەیەی بۆ ڕونکردەوە کە هەڕەشە لە ئیسلام دەکات، ئەگەر بێت‌و ئەوروپا توانی (میسر)و (شام) تێك بشکێنیّ، خەلیفەی عەبباسی (المستضیء بالله) بەم نامە دڵی خۆش بوو، ئەویش ئەم نامەیەی بۆ ناردەوە، کەبە کەمیّ دەسکاری هێناومەوە: (من ئەوەم زانیوە کە دوژمن دراوسێی نزیکی تۆیە، تۆ بۆ ئیسلام دراوسێیەکی باش نابی، تا تۆ نەبیتە خراپترین دراوسیّ بۆ ئەو، ئەگەر بۆ کەسی تریش پاساو هەبیّ بۆ تۆ پاساو نیە کە بەنەفس‌و ماڵت تیّ نەکوشیت، میری مسوڵمانان لێت ڕازی نابیّ کە بە چاوپۆشی پەسەندی بکەیت، بەڵکو دەیەویّ ڕو لەو شارانە بکەیت کە مەبەستی ئەو کەسەیە داوای هێرش دەکات نەك مەبەستی هێرشبەرە، وە حوکمیان لەناودا بکەیت بە حوکمی خوا کە خودا لەسەر زمانی (سەعد) لە (بەنو قوڕەیزە)و (بەنونەزیر)دا بڕیاریدا، بەتایبەتی قودس کە وڵاتی ئیسلامی دێرینە، ماوەکی درێژە سکاڵای دیلی خۆی دەکات‌و سکاڵای وشەی یەکتاپەرستی دەکات کە نامۆیە لەناویاندا، هەڵسەوە بۆی وەکو کەسیّ کە دەکەوێتە ناو چاڵێکەوە، ئەگەر ساڵی (حدیبیة) هەبیّ، تۆ شوێن ساڵی گرتنی بکەوە).

ئەمە نامەی خەلیفەی عەبباسی بوو لە هەندیّ لە دێرەکانیدا، کە هەموو ناوەڕۆکی نامەکە دەداتە دەستەوە! ئایا چ یارمەتییەکی پێشکەش بە (سەلاحەددین) کرد بێجگە لەوەی کە ڕابردووە باسیکرد، پاڵەوان پێویستی بە

---

دەستی هات بەرگری لە شار کرد دژ بەم پەلامارانەی سوپای خاچییەکان. تابویە سەرکردەی سوپاو ئەنجا کار بەدەستی ئۆرشەلیم. لە ساڵی ١١٩٦دا چووە بەغدا، ئەوکاتە میری ئەو سوپایە بوو کە لە نزیك هەمەدانەوە دەهات، ئەو کاتە لە داقوق گیانی سپارد. وە برازاکەی (قطب الدین) قوتابخانەی (قطبیة)ی لە قاهیرە داناو. دوای ئەو (شرف الدین احمد) بنەماڵەی (مشطوب) هاتە شوێنی کە لە کوردی هەکاری بوو لە (عەککا)دا!!

وە لە کتێبی (النوادر السلطانیة/ بهاء الدین ابن شداد/ تحقیق احمد)یش / ل ٢٠٠) ناوی زۆر لە پاڵەوانانی کوردی داوە لە دەوڵەتی ئەییوبی دا وەکو: (سیف الدین المشطوب)و (الامیر المجلی)و (مجاهد الدین یرنقش) پێشەوای سوپای سنجار (ژنگار)و (مظفر الدین) بە سوپایەوەو لە ئەسەدیەکان (سیف الدین یاز کوج و، ڕوسلان بوو غاو، عیسای فەقیهـ) (وەرگێڕ)

فەرمان ناکات بۆ جەنگی خاچییەکان، ئەمە ڕێبازی ئەو بووە کە بۆ هێنانەدی ئەوە ژیانی خۆی پێ بەخشی، بەڵکو پێویستی بەوە هەبوو (ئەگەر یاریدەی جەنگیشی نەبوایە وەکو زانراوە) دەبوایە نامەی بۆ گشت میرە مسوڵمانەکان نووسیبایە کە پێویستە یارمەتی (سەلاحەددین) بدرێ‌و بەیەك ڕیز لەژێر یەك ئاڵادا بڕۆن بۆ رزگاری ئیسلام، بەڵام کە پێی دەڵێ: (ئەگەر بۆ غەیری تۆش پاساوو بیانو هەبێ، تۆ پاساوت نیە کە بە گیان‌و ماڵ خەبات نەکەیت، چونکە تۆ دراوسێی دوژمنیت) ئەمە جێگای گاڵتە پێکردنە لە نووسیندا، ئایا بۆ مسوڵمانان ئەو پاساوە بەڕەوا دەبینرێ کە (سەلاحەددین) سەرشۆڕبێ، چونکە ئەوان دراوسێی نزیکی خاچییەکان نیین، لە جەنگیشدا کە بەسەر دراوسێی نزیك‌و دووریشدا دادێت.

ئایا خەلیفە دەیەوێ پێی بڵێ: من بیانوم هەیە کە (بەغداد) لە غەزای تۆ دوا کەوتووە، چونکە دراوسێ ی (قودس) نییە!! من واتێ دەگەم کە نامەی (مستضیء باللە) کاری خراپی لە دڵی (سەلاحەددین) کرد! چونکە چاوەڕێی ئەوەی نەکرد فەرمانی تێکۆشانی پێ بکات کاتێ ئەو پیاوی تێکۆشان‌و هەڵگری ئاڵاکەیەتی، بەڵکو چاوەڕوانی کۆمەکی گیانی لێدەکرد، کاتێ خەلیفە دەسەڵاتی ڕەسمی بگرتە بەرو ڕوی لە نەیارانی‌و هەروەها ئەوانەی (پلان‌و نەخشە) یانی بە بەدزییەوە بۆ (سەلاحەددین) لە (میسر)دا دەکێشا بکات کە خۆپەرستی نەخۆشی خۆیان لە یاد بکەن‌و بە پەلە دەست‌و بردی لە ژێر یەك بەیداخ‌و مەشخەڵدا بێنە مەیدانی دوژمنەوە، چونکە خودا ئەوانەی خۆش دەوێ، کەبەیەك ڕیزو وەکو خشتەی ڕیزکراوی بینایەك پێکەوە دەجەنگن، کاتێك میرو قەراڵەکان زانیبایان خەلیفە ئەم پاڵەوانەی بۆ سەرکردایەتی یەکی بەڕاستی هەڵبژاردووەو، ڕاستەوخۆ پشتی گرتووە، زۆرێ لەو هۆکاری کێشەکانی نێوان (سەلاحەددین)و ئەوانەی ئێرەیی یان پێدەبرد لەناوبرد!

جەنگی نێوان (سەلاحەددین)و دوژمنانی زۆر بوو، ئەم بەردەوامییە (سەلاحەددین)ی هاندا داوا لە میرە مسوڵمانەکان بکات کە پشتی بگرن، بەلایەوە

شورەیی‌و سەرشۆڕی بوو کە ئەوانە کەمتەرخەمی‌و بێئاگایی بکەن لە ئاگرێ کە خەریکە هەموویان ئاگر بدات‌و بسوتێنێ، دیسان لە دڵی خۆشی دا بیری دەکردەوە کە ڕەنگە خەلیفە (مستضيء بالله) قەبارەی ئەو پەتایە پەلاماری لەبەرچاو نەبێ کە بۆ هەموو وڵاتی ئیسلامی بەڕێوەیە، ئەنجا نامەکی بۆ (بەغداد) نارد کە پڕ لە هاوار بوو کە بە ئازارترین‌و دڵتەزین ترین شێواز نارێکی مسوڵمانان‌و یەکرێزی خاچییەکان وەسف دەکات، هەروەها هەڵگیرسانی ئاگری خوێن گەرمی لە دڵی فەڕەنگەکانداو کوژانەوەی لە دڵی ئەوانەدا کە خۆیان بە میری مسوڵمانان دەژمێرن![1] هەرکە ئەم نامە داخدارەم خوێندنەوە، پەیم بەو بڵێسە داگیرساوە برد کە لەدڵی (سەلاحەددین)دایە، کاتێ بۆ (المستضيء) دەنووسێ‌و دەڵێ کە هەندێکمان دەسکاری کردووە سەرەتا بەوەسفی فەڕەنگە پەلاماردەرەکان دەست پێدەکات:

(ئیسلام بە گەلێکەوە گرفتاربووە کە مردنیان کردووە بە خۆشحاڵی‌و بەدەنگەوە هاتوون‌و، لە هەردوو خۆشەویستان جیابوونەوە کە نیشتمان‌و پێویستی‌و مەبەستەکانی خۆیانە‌و، لە دوو شتی ئولفەت پێ وەرگیراو دورکەوتنەوە کە: خێزان‌و ماڵ‌و حاڵە، هەموو ئەمەش بۆ بەگوێکردنی (کەشیشەکەیان) بوو.. لەگەڵ برسێتی زۆردا داوای ماڵ ناکەن‌و، لەگەڵ قات‌و قوڕی زۆردا بێزارنابن، بەڵکو وەکو پەپولە (پەلەپانە) دەکەونە ناو ئاگری بڵێسەدارەوە، خۆ هەڵدەدەنە خوارەوە‌و، بە ئارام گرتن خۆیان زرێ پۆش‌و پاچەسپاو کردووە، تا ژنەکانیان لە وڵاتیاندا بۆ جەنگ وەخۆکەوتوون‌و، بە ئامادەباشی یەوە بە دەریاو وشکانیدا بۆ (شام) هاتوون‌و، وە ئافرەتانی دەمامك پۆشی فەڕەنگییان لەگەڵدایە، دەمامکی زرێیان

١) بەپێی (صلاح الدين الايوبی/ وليد نويهض/ ل ٩٧) کە لە (السيوطی / ل: ٤٢) وەریگرتووە: تەنگەژەیی لە نێوان سوڵتان (صلاح الدين)و (خەلیفەی عەبباسی) بووە لەسەر نازناوی (الناصر) کە نازناوی خەلیفەی عەبباسی بووە، ئەوەبو لە ساڵی (٥٧٧) ئاگاداری (صلاح الدين)ی کرد کە ئەم ناوە بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ئەمە ڕواڵەتی جیاوازییە کەیە، بەڵام حەقیقەتەکەی بۆ دەرکەوتنی ناوی (صلاح الدين) دەگەڕێتەوە وەکو پاڵەوانەکی ئازادیبەخش کە دژی فەڕەنگ دەجەنگێ‌و دەیشکێنێ، ئەمە بوو تۆی کێبەرکێی ڕواند لەسەر گەورەیی‌و دەسەڵات کە هەر یەکە دەویست سەرکەوتنەکان بە ناوی خۆیەوە تۆمار بکرێت... (وەرگێڕ)

پۆشیوەو زرێیان کردۆتە بەرو، هەندێ لەوانە لە رووداوەکانا، کوژراونو بینراون تا رِویان هەڵنەمالْرابا نەدەناسران.

(پاپا) کە لە (رِوییە) یە خواردنو خواردنەوەی لێیان حەرام کردووە، پێی وتتون: هەرکەسێ نەرِواتە (قودس) بە دلْسۆزی یەوە ئەوە لای من هەمووشتێ لێ حەرام کراوە، نەژن دێنیێو نەخواردنی پێدەدرێ، لە بەرئەوە بۆ هاتن خۆیان دەکوتنو، خۆیە فەتارەت دەدەن لە سەر رِۆژی بەڵێن پێدراویان، لەگەڵ دەمارگیر بیانـدا لـە گومرِایی یانداو سەرکەشی یاندا لە سەر لێ شێوا وبیاندا.

پێچەوانەی مسولْمانان ئەوانە بێزار دەبنو ئارام ناگرنو، خۆدەدزنەوەو هەڵدێن کۆنابنەوەو، دەردەچنو ناگەرِێنەوە، ئەوانە تەنیا بە بەخشینی تفاقو رِۆزی پێیان دەمێننەوەو کە ئامادەش بن بە دلّی نارِێكو ناتە با ئامادەبن).[1] ئەم حالّەتە بێزارکەرە شایانی ئەوەیە کە (المستضيء) شاری (بەغدا)ی بەجێ هێشتبایەو، لەگەڵ ئالاّی دەولّەتی عەبباسیدا کۆچی کردبایە، داوای کردبایە کە بۆ سەرکەوتنی ئیسلام رِابپەرِن.....

(سەلاحەددین) هەوالّی پێدابوو کە (پاپای رِومی یە) فەرمانی داوە بە حەرامکردنی خواردنو کرداری سێکسی لەسەر هەرکەسێ توانای سەفەری هەبێ بۆ (قودس)و نەچێ!! دیسانەوە هەوالّی گیانبەخشی کچو کە نیشکەی گەنجو تازە لاوەکانی پێدابۆ بۆ جەنگ کردنو، تا لە ساحەی جەنگدا لاشەی کوژراوی ئەوانە بینراون!

دلّنیام کە نموونەی ئەم نامانە بۆ شاو قەرالّی مسولّمانان رِەوانەکراون، بەلاّم بەشێکی کەم لەو زۆرانە نەبێ رِانەپەرِیون، ئەگەر رِوحی خوانە بایە بۆ ئیسلام تراژدیاو گەرمەساتەکە دەگەیشتە ئەوپەرِی!!

---

١) صبح الاعشى ٦/ ٥٢٨. (نووسەر).

من دەڵێم: نموونەى ئەم نامانە بۆ شاكانى مسولمانانو قەراڵو میرەكانیان نووسراوە، چونكە بۆ خۆم نامەیەكەم خوێندۆتەوە كە قازى (فاضل) زمان حاڵى (سەلاحەددین) بۆ شاى (مەغریب)ى دەنووسێ بە ناوى (منصور یعقوب بن یوسف بن عبدالمؤمن)[1] لە دواى گرتنى (قودس)داو داواى كۆمەكى ماددىو جەنگى لێدەكات، چونكە سەرلەنوێ فەرەنگەكان بە حەشامەتەكى زۆرى ئەوروپاوە هاتوونەوە بۆ رزگاركردنى (قودس)و، كەنارەكانى دەریا بە كەشتى جەنگى ئەوان داپۆشراوە، (منصور)یش ئەم جۆرە كەشتى یانەى هەیە كە بەشى ئەو رووداوە چاوەڕوانكراوە دەكات. نامەكە دەڵێ: (لەم هەموو دەریا بێ شومارانەدا تەنیا كەشتیگەلى شاى (مەغریب) دەبینرێن، ژمارەیان تەواوەو بەشەكەى كافى یە خودا دەسەڵاتى بدات كە بەژمارەى چروپرى خۆىو شمشێرى تیژیان كۆمەكى شام بكەنو، دەتوانن لە زیانەكانى كەشتیگەلى ستەمكارى صەقلى یەى دوربخەنەوەو لە دورگەى خۆیدا بیانگرێو بەر لە هاتنى سوپاكە بەرەوڕوى برۆن، سەروەرمان لەگەڵ ئەوانەى لەگەڵیدا یە بەشكۆ وە بڕوات كە ڕەوشتى بەرزى ئەو، پاشگەزى نەكاتەوەو، قیامەتێ لەناو بێبڕواییدا بەرپا بكات خۆرى سەركەوتن لە خۆرئاواوە لەسەرىیەوە هەڵبێت).

(سەلاحەددین) هیواى وابوو كە (المنصور) بە كەشتیگەلى جەنگى یارمەتى بداتو لەگەڵ ئەودا لە بەرامبەر هێرشو پەلاماردا بووەستێتەوەو، ئەگەر نەشكرا هەوڵ بدات كەشتیگەلى قەڕاڵى (صەقلى یە) گەمارۆ بدات كە بۆ مەبەستى (سەلاحەددین) بە (مەغریب)دا گوزەر دەكاتو، بەر لە دروستكردنى ئاڵۆزى لەناو بیات.

---

١) (یەعقوب بن یوسف) ناسراو بە (المنصور): (١١٦٠-١١٩٩) سوڵتانى (الموحدین)و بوو (١١٨٤-١١٩٩)و، دەسەڵاتى خۆى درێژكرد بۆ وە بۆ سەر ئەفریقیاو ئیسپانیاو، لە ساڵى (١١٨٧)دا بە (المرابطین)داو لە (١١٨٨)دا بەسەر (ابن غانیة)دا سەركەون، پاشان لە (١١٩٦م)دا بەسەر ئیسپاندا سەركەوت، (المنجد في الاعلام) (وەرگێڕ)

پاڵەوان هیچ شوێنەوارەکی وەلامی لەم قسەیەدا دەست نەکەوت کە بۆ میر(عبد الرحمن)ی کوڕی (منقذ)ی ناردبوو، بەلاّم هەر لە ئومێد نەکەوت، بەڵکو نامەیەکی تری درێژی ئاراستەی (شا مەنصور) کرد کە پڕ بوو لە ستایش‌و پێ هەڵاوتن‌و، وەسفی جوان بۆ ئەو شکۆیانەی پێشکەش بەسەرخستنی ئاینی کردووە، ئەنجا باسی لە هەڵسانی خۆی کرد لەچەند هێرشێکی یەك بە دوای یەکدا لە دژی دەستدرێژی خاچییەکاندا، تا (قودس) رزگار بکەم، شێت گیری پاپای ناحەز لەسەر لە دەست دانی قودس ڕق‌و توندی وروژاندووەو، سوپایەکی چڕوپڕی ڕەوانەکردووە، نامەکەی دەڵێ:[1] بێ باوەڕانی شام بێباوەڕانی خۆرئاوایان ترساندو، ئەوانیش بە پیادەو بە سوارو، پیرو گەنج‌و، بە کۆمەڵ‌و بەتاك‌و، لە وشکانی‌و لە دەریاوە، بە ولاّخ‌و پشت وەلاّمیان داوەتەوە ئەوان پێویستییان بە هیچ پاشایەك نەبوو پێشیان بکەوێ یان بەجڵەو گیرێ ڕێگایان پیشان بدات، تا هەموویان بەدەنگ بانگەوازی (بەترەکیان)ەوە دەرچوون، کەپێویستی بە نیازو توانای شایەکەیان ناکات، بێباوەڕان هەرچی هێناویانە بۆ گەمارۆدانی شامیان هێناوە، هەموو کونەکانی لێ پڕ کردون لە هەموو پێویستی یەك، لە ئازوقەو ڕۆزی‌و خواردن‌و ئامراز، هەتا وڵاتی خۆیان پڕ لە جەنگاوەر کردووە، وە لە خواردن‌و ئازووقە بۆ ئێستاکەو داهاتوو، هەر خۆرهەڵاتنێ بە درێژایی دەریا بەسەر دوژمندا هەڵدێ کە قەرەبووی پیاوانی کوژراوی دەکاتەوە، هەروەها ئەو زادو زەخیرە لە دەست چووە دەیهێنێتەوەو، ئەوانە ڕۆژ بە ڕۆژ لە زێدەیی دان‌و لە فرە کەرەستەیی دان‌و شوێنی گەمارۆکەیان بەلاوە ئاسان بووەو ئەوەی لە وشکانیدا لێیان بڕاوە دەریا دەیانداپێ‌و، ژمارەیان لە سەد هەزار بگرە زیاتر بەدەرەو، هەر کە کوشتن قڕی کردن‌و فریا گوزارییان پێدەگات، وەك بڵێی دوای مردن زیندو دەبنەوە).

---

١) الروضتین (ج/١٧١): ئەمەش ڕلسپاردەیە کە پێیان بلێم من پشتم بە نوسراوی (د: احمد بدوي) بەستووە کە لە کتێبەکەیدا نوسیونی لە شوێنی جیاجیادا بەناوی (الحیاة الادبیة فی عصر الحروب الصلبیة) (نووسەر).

بەبێ پێچو پەنا بۆ خوێنەری بەیان دەکەم کە من نەمدەتوانی ئەم نامەیە تەواویکەم، چونکە دڵم پڕ بوویوو لە داخو تووڕەیی، داخو ئاخەکەم بۆ ئەو مسوڵمانانە بوو کە بێ ئاگایانە دوردەکەو تنەوەو توڕەیشم بۆ ئەو گەلەیە بوو کە وشکانیو دەریا یان پڕ کرد بوو بۆ داگیرکردنی خاکێ کە هی ئەوان نییە، داخەکەم بۆ (سەلاحەددین) ئەم پاڵەوانە کە هیچ کۆمەکی یەکی بەدەست نەدەگەیشت لە (میسر)و (شام)و هەندێ شاری عێراق[1] نەبێت! وە (ئەوروپا)ش هاتبۆ مەیدانییەوە نەك هەر بۆ بۆردومانکردنی ئەو بەڵکو بۆ بەردومانکردنی هەرچی سەر بە ئیسلامە!

من ڕەخنەکی توندم لە دژی شای (مەغریب) نووسیوە کە پشتی لەم مەسەلەیە کردووە، چونکە هیچی نەکردووە، نە تفاقو جبەخانەی ناردووە، نە کەشتیگەلی مەنع کردووە، ئەنجا بۆم ئاشکرا بوو کە بۆ ئەو ڕەوشە بگەڕێمەوە کە پاشا لە نیشتمانی خۆیدا تێ یدا بووە، تا بزانم چی هانی داوە سەرپێچی بکات، بینیم کە جەنگێکی سەختی کردووە لەگەڵ فەرەنگی (ئەندەلوس) دا، لە هەر بەرەیەك رزگاری دەبێ، توشی بەرەیەکی کارەساتبار تردەبێت. لەدوای گرتنە دەستی دەسەڵاتدا زانی کە (فەرەنگەکان) شاری (شیلەب) یان لەبەر دەستدایە کە خۆر ئاوای (ئەندەلوس)ە بۆ خۆی چوو گەمارۆی داو گرتی یەوەو، سوپایەکی لە (مووەحیدین)و (عەرەب) پێك هێنا چوار شاری تری دوای (شیلەب) گرت، دوای ئەوەی (٤٠) ساڵ بوو لەبەردەستی فەرەنگدابو،[2] شای (طولیطولة) لێی ترساو (٥) ساڵ ئاگربەستی لەگەڵدا کرد[3].

---

١) مەبەست لە عێراق ویلایەتی موصڵو هەولێرو شارەزووره (وەرگێڕ)

٢) شیلەب یان سیلەب (silves): شارێکە لە باشووری پورتوگال، لە سەردەمی دەسەڵاتی عەرەبیدا، کۆمەڵەیەکی یەمەن لەوێدا نیشتەجێ بوون و، بە زمانی عەرەبی پاراو ناویان دەرکردووە، شای پورتوگاڵ لە ساڵی (١١٩٠ ز)دا دەستی بەسەردا گرتۆتەوە. (المنجد فی الاعلام / لویس معلوف). (وەرگێڕ)

٣) طولیطولة (toledo): شارێکە لە ناوەراستی ئیسپانیادا نزیك مەدرید. (٧١٤) تاریقی کوڕی زیاد دەیگرێو (فونس) شای (قشتاله) (١٠٨٥) دەیگرێتەوە (المنجد فی الاعلام / کورتکردنەوە) (وەرگێڕ)

زۆری نەبرد کە فەرەنگەکان کۆبونەوەو هاتنە ناو شارەکانی ئیسلامی لە (ئەندەلوس) داو داگیریان کردەوە، تالآنو خراپە کارییەکی پڕ لە کارەساتیان تێدا کرد. وەکو خاوەنی کتێبی (نفح الطيب) دەڵێ: (بە سوپایەکی چڕو زۆر پەلاماری دانو، فەرەنگەکانیش خۆیان کۆکردەوەو هاتنە بەرایی یەوە، بەڵام نەخۆشیەکی دژوار بوو بە ئاستەنگ لە بەرامەبەریدا، (ئەدفونش) بەمەی زانی، هەندێ هەڕەشەو ترسی بۆ ناردو داوای هەندێ قەڵای هاوسنوری شاری ئەندەلوسی دەکرد، لەگەڵ نەخۆش کەوتنی (مەنصور)دا فەرمانی بە دەوامی هێرشدا، جەنگی ترسناك قەوما کۆمەڵەکی زۆر مسوڵمان شەهید بوونو، (مەنصور) پلانەکی ڕێکخستو هەستا کشایەوەو ڕای کرد، ئەوانیش بە کەمتەرخەمی کەوتنە دوایانەوە، ئەوانیشیان بەسەخت ترین شێوە کە لە جەنگدا چاوەڕوان بکرێ پەلاماریان دان کە بەجەنگی (ئەرك) ناسراوە کە مسوڵمان هەر لە جەنگی (ئەلزللاقە) وە سەرکەوتنی ئاوایان نەبیستبوو، ئەنجا لە چەند شارێکدا شوێن هەڵاتوان کەوتو (طوليطولى)[1] گەمارۆدا، پیاوەکانی کوشتو ژنەکانی بەدیل گرتن، ئەنجا بەرەو (ئەشبیلی) یە چوو، سەری بۆ ئەو شۆڕ کرد، فەرەنگی زەوی فراوانیان لێ تەنگەوە بوو، ئەنجا داوای ئاشتی یان کرد).

ئەمەش تێکۆشانی پاڵەوانێکی لە چەشنی (سەلاحەددین)ەو، لەگەڵ ئەو بارو دۆخانەشدا پاساوو بیانوی خۆی هەیەو، هەرکەسێ لە مێژونووسانی ژیاننامەی (سەلاحەددین)دا تانەوتەشەری لێ بداتو سەرزەنشتی بکات تەنیا یەك ڕوی لە ڕاستییەکە پەی پێبردوو کە ڕوی دورکەوتنەوەی بووە لە یارمەتینەدانی (سەلاحەددین)ی پاڵەوانداو، لە ڕووەکەی تر بێئاگابوون کە پاچەسپاوی جوانی ئەو بووە لە بەرامبەر لەشکرەکانی فەرەنگدا لە (ئەندەلوس)دا، (سەلاحەددین) لە

١) (الموحيدين): وەکو لە (المنجد في الاعلام)دا هاتووە بنەماڵەکی مەغریبی شیعە مەزهەب بوون (مەهدی تۆمەرت)دایەزراندووە ،دوای گرتنی مەراکش دەوڵەتی(م- مرابطين) دەروخێنن لە (١١٤٦)داو دەسەڵات بەسەر ئەندەلوسدا دەگرن. دیارترین سەرکردەکەیان (عبد المون بن علي)و (يعقوب منصور)ەو، دوای مردنی ئەو داڕوخاوەو بەش بوون. (حفصيون) لە تونسدا (١٢٢٨)و (بەنو عبد الواد) لە (تلمسان) (١٢٣٥)دا جیابونەوە (بەنورين) بەسەری دا زاڵ بوو. (وەرگێڕ)

خۆرهەڵات چی پێکردن ئەویش لە خۆرئاوادا ئاوای لێکردن‌و خۆرئاواش یەك میللەتە!

مێژونووسانی ئیمڕۆی (سەلاحەددین) هەندێ شت هەیە بۆ (سەلاحەددین)ی بەرەخنەی گەورەی دەزانن، چونکە هێرش‌و پەلامارەکانی لەسەریەك‌و بەردەوام نەبووە، بەڵام ئەوەیان لەیادکردووە کە ئەوەی مرۆڤی ئەم دەمە دەیبینێ مرۆڤی ئامادە نەبوو نادیار نایبینێ، ئەوان ناتوانن بڕیاری شتێ بدەن کە ئاگایان لێی نیە وەکو ئەو کەسەی کە بەخۆی چووتە ناو ئاگرەوە، توشی نارەحەتیەکانی بووە، ئەو ئاشنا ترە بە شڵەژاویەکانی پەلاماردان‌و هەڵاتن‌و شێنەیی کردن‌و چاوەڕوانی کردن هەرکەسێ هەندێ لەونامانە بخوێنێتەوە کە بە زمانی (سەلاحەددین) نووسراون شتی وادەزانێ کە ئەو کەسەی ژیاننامەی پیاوە گەورەکانی لە کتێبێکانی مێژوییدا دەخوێنێتەوە نایزانن، چونکە زۆربەی ئەوانەی مێژوو بەسەر هات دەنووسن سەیری ڕوی بیریقەداری ئەو ژیاننامەیە دەکەن کە دەیخەنە ڕوو بە دڵ بوونی پاڵەوانەکەیان لەدڵدا دەگاتە ئاستێ، کەچاو لە هەموو ئەوشتانە بنوقێنن کە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی ئەم بە دڵ بوونەیان، چونکە کورت بینن، من دەڵێم لە ڕوانینی کورتییانەوە، چونکە مێژوزانی تێگەیشتو هۆکارو سۆنگەکانی ئەم ڕەخنەو لکانە دەزانێ‌و بەناچاری دەیانبینێ، کە ڕاکردنییان لەدەست ناکرێ، چونکە جیهان لەسەر یەك ڕو ناڕوات.[1] یەکێ لەوە ڕەخنەگرانە سەرکۆنەی (سەلاحەددین) دەکات

١) مێژونوسمان هەیە مێژو بۆ مێژو تا ووتوێ دەکەن، تەنیا مەبەستیان زیاتر کردنی زانیاری یەو هیچی تر ئەم ڕەوتە لەناو مێژونوسە زانستیەکان باوە لە جیهاندا. ڕەوتەکی تریش هەیە مێژو بۆ یەك ئامانج تاوتوێ دەکات ئەویش بۆ بنیات نانەوەی مرۆڤە؟ ئێمە لەگەڵ بڕوای دووەم داین. لە ئیسلامدا تاوتوێی مێژوو پێویستە بۆ حاڵی بوون لە شەریعەت‌و ژیان‌و حاڵی بوون لە چاوگی شارستانی کە لە مێژووەوە هەڵدەقوڵێ. ئەزموونەکانی ژیان پێویستە بزانرێت، چونکە تەمەنی کورتی مرۆڤ ناتوانێ هەرچی لە ژیاندایە بیزانێ. بە سۆراخی مێژوو لەمە حاڵی دەبین‌و بە کاروانی شارستانی دەگەین. مێژوش بە زۆری مل بە ملانەی نێوان حەق‌و ناحەق‌و سڵتەو شۆڕشمان بۆ دەگێڕێتەوە، وە مێژو زیندووەو پڕەنسیپی خۆی هەیەو هەمیشە لە دووبارەبوونەوەی دایە. مرۆڤ دەتوانێ لە کاتی دروستکردنی شۆڕش‌و بنیاتنانی دەوڵەتدا سود لەو ئەزموونە مێژویانە وەربگرێت، چونکە ئەوەی ئیمرۆ دەبینرێ ڕابردوش هەر ئەوەیە دوبارە دەبێتەوە. (ولن تجد لسنة الله تحويلا) فاطر/٤٣

چونكە پرسەو سەرەخۆشييەكى گەرم بۆ شاى قودس ڕەوانە دەكات كە پەرۆشى خۆى بۆ لە دەسدانى شاى ڕابردوى باوكى دەربڕيوەو، داوا لە شاى نوێ دەكات كە ڕێز لەو بەڵگەنامە بگرێ كە لە نێوانياندا هەيە! ئەمە بە ژيرييەكى سياسى بۆ (سەلاحەددين) دەژمێردرێ، نەك لەسەر ئەو بە هەڵەبژمێردرێ، چونكە ئەو بە بارودۆخى جەنگى خۆى باشتر ئاگادارە، دەزانێ ئەگەر جەنگ پێش كاتى گونجاوى خۆى بكەوێ سەرەنجامەكەى بۆ ئەو كارەسات دەبێت، شاى گەنجيش گەنجەكى هەڵچووە، خوت خوتەى شكاندنى ئاگربەستەكەى بۆ دروست دەبێ كە ڕەنگە پاڵەوانەكە ناچار بكات لە شەڕێكى يەوە بگلێنێ كە چاك خۆى بۆ ئامادەباش نەكردووە، ئەمەش كارێكى ژيرانەو لێ زانانەيە كە پرسەى بۆ بنووسێ‌و پەيماننامەى باوكى يادبخاتەوەو، دەستگرتنى بەشەڕەفانەى خۆى لەگەڵ ئەو كەسەدا ڕاگەيەنێ كە بەڵێنى پێداويت.

ئايا ئەمە لێهاتوويى‌و شارەزاييەكى زيرەكانە نيە كە نكوڵى لێ نەكرێت!! ئەم پرسە نامەيە چاوگى هێورى‌و هێمنى دەرونى هەردوو بەڵێندەرەكانە! ئەگەر بۆ (سەلاحەددين) بۆشايى پەيدابوو كە پلانەكى چاوەڕوانكراو ئامادە بكات، ئەوە كاتەكى باشى دەستە بەركرد، كە پێويستى پێى هەبوو، لە وەرگرتنى چەند دەقێ لەم پرسە نامەيە هيچ ئاستەنگێ نابينم، چونكە وانەيەكى تۆكمەيە لە دبلۆماسى يەتى سياسى كە (سەلاحەددين) پەى پێ بردووەو، ئەوانەى مێژو بە گيانى خۆ بەگەورە زانين دەنووسن نەيانزانيوە، كەوا دەزانن بە خوێندنەوەى چەند پەڕەيەك بوون بە بڕياردەر بەسەر ئەم پاڵەوان‌و دلێرەدا.

قازى (فاضل) بەزمانى (سەلاحەددين)ەوە دەنووسێ لەگەڵ هەندێ دەستكاريدا:

(خوداوەند شاى گەورەو چاودێرى قودس –برودويل- بە بە شانس‌و بەختى زۆرو تايبەت ياوەربكات، وە پاشايەتى گەلەكەت كە بەميرات گرتووە لێت پيرۆز بكات.

لە ڕێنوێنى خۆيەوە چاكەت لەگەڵدا بكات لەوەدا كە ڕۆژگار هێناويە، كاتێ نامە ڕەوانەكراوە، كە ئەو هەواڵەمان پێگەيشتووە، كە دڵى ڕاستگۆيان نيگەران

دەكات، لەكاتى ئەو شينو زاريەدا كە حەزمان دەكرد ڕاست نەبوايە، لەمەڕ ئەم پادشايەدا كە دادگەرو سەر بڵند بوو.

خودا بە باشترين جێگەى بگەيەنێ كە كەسانى وەكو ئەوى گەياندۆتێ، چۆن كوڕەكەى گەيشتۆتە شوێنى خۆى ئاواش بە كامەرانى خۆى بگەيەنێ، خوداى شكۆدار كارەساتەكەى ئاسان كردووە كە كوڕەكەى كردووە بە ميراتگرى ئەو، بە پاراستنى كۆششى ئەو توش هاتووەكەى لەبير بردۆتەوە، پەيامنێرى سەرەكيمان (عەميد مختار الدين) خوا پايەدارى بكات لە جياتى ئێمە بە زمانى خۆى بەپرسەكە هەڵساوەو وەسفى ئەو بێزارييەى كردووە كە بەهۆى جيابوونەوەى ئەم دۆستەمانو چۆڵ بوونى شوێنى ئەو، توشمان هاتووە، ئێمە بەم نامەيەمانو پێشەنگى يەمان دەروازەمان بۆ پادشا كردۆتەوە، دەبێ ئەويش بە هەمان چەشن سڵاو ڕەوانە بكاتەوەو چاكە بكات، هەتا لە ئەهلى چاكە بێ ئێمە ش چۆن دڵمان لەگەڵ باوكيدا پاكژ بووە لەگەڵ ئەويشدا نيازمان پاكژەو، متمانەو بڕوايەكى تەواومان هەيە.

دەبێ ئەويش نامەمان بۆ بنێرێ بە متمانەوە كە شەرم نايگرێ، وەكو ئەو كوڕە پشتمان پێ ببەستێ كە ئەوەى باوكى هەڵى گرتووە ئەويش هەڵى بگرێ، خودا دەست بەتەمەنييەوە بگرێو، پاسەوانى ميريەكەى بكاتو، بە سەركەوتنەوە كارەكانى بۆ ئەنجام بداتو لەمەڕ هاوڕێكەيدا گومانى باش بخاتە دڵيەوە).

خوێنەرى ئەم كتێبە، پێويستە ئەوە بزانێ كە (سەلاحەددين) پێويستى بە پشودانى جەنگى هەيە، تا ئيمرۆ پشو بداو بحەسێتەوە، ديسانەوە پێويستە ئەوە بزانێ كە شاى تازە دەستو پەيوەندى هەيە كە تەماعى شكۆدارى دەدەنێ، تا بە دابەزين بۆ (سەلاحەددين) شكۆى بەرزبێتەوە لەناو قەڕاڵو شاكانى فەڕەنگى داو، ئەويش گەنجەكى بە پەلەيەو سەرنج ڕاكێشى پياهەڵدانو هەڵكێشان سەراسيماى دەكاتو، بۆ جەنگێ دەڕوات كە دەبينێ جبەخانەو تفاقى هەموو ڕۆژێكى لە خۆرئاواوە بۆ دێتو، بەرگرىو دەستدرێژبوونى بۆ زياد دەكات!

ئەمەش خێری تێدایە کە پاڵەوان لە ساغیو ئاشتی میرنیشینی خۆی دڵنیای بکاتەوە، ئەمەش لەسایەی ئەو پەیمانەیەدا لەگەڵ باوکیدا بەستراوە، ئەگەر لەمە دڵنیا بوو وەڵامی ئەوانە ناداتەوە کە بانگێشەی جەنگ دەکەن، ئەم نامەیەش بە دڵنیاییەوە ڕۆڵی خۆی بینی.

گەرمترینو بەسوێترین سکاڵا کە ئەم پاڵەوانە بەیانی کردبێ ئەم نامەیە بوو کە ڕەوانەی (بەغدا)ی کردو سکاڵای پاڵدانەوەی مسوڵمانانی کرد کە لە جەنگی (عەککا)دا یارمەتیان نەدا، ئەمەش وەختێ بوو کە هەزاران کەشتیو گەمی فەڕەنگەکان لە (ئەوروپا)وە هاتنو مەبەستیان بوو سوپای (سەلاحەددین) لەناوبەرن، ئەو بەتەنیا وەکو کەشتییەك مابۆوە لە دەریایەکی هەڵساودا، کە شەپۆڵەکان لە هەموو لایەکەوە دەهاتنەسەری، ئەو ویستی بە داواکردنی فریاگوزاری لە خەلیفە میرەکانی (جەزیرە) هان بدات بۆ ڕابونەکی خێرا بەرەو مەیدان، چونکە ئەم ڕەوشو هەلومەرجە وەکو قازی (فاضل) وەسفی دەکات لەم سکاڵا نامەیەدا کە لەسەر زمانی (سەلاحەددین)ی پاڵەوانە: (ئەوان ئێستا لەسەر (عەککا)نو دەریا بەگشتی پتر لە شەپۆل کۆمەکیان دەکاتو، ئەوەی لەوێ دەردەچێ بۆ مسوڵمانان لە تالاوەکانی تاڵترە، شاکانی کوفر هەموو یەکیان گرتووە کە لە هەر تیپێ لەوانە کۆمەڵێ بەرەو ڕوی ئەو بنێرنو هەموو جۆرە چەکەکی بەهێزو توایان بۆ ڕەوانە بکەنو، ئەگەر مسوڵمانان نەفەرێکیان لێ بکوژن بە (١٠٠٠) کەس قەرەبوی بکەنەوەو، چەندان لە درونەوە پترەو بەروبوم لە چنینەوە کەمترە، دوژمنی بەرامبەرمان – خوا بیکوژێ – لە سەنگەرەکاندا زرێی قایمی پۆشیوە، بە قەڵای سەخت قەڵغانی دروستکردووە، تۆق کراوەو مەنعکەرەو، ژمارەی زۆریان ڕێژەی کوشتنی زۆرکردووەو، ملی چرو پڕیان نوکی ڕمی شکاندووە، چونکە ئەم سەرەڕمە زۆری لەو ملانە بڕیوە.

یاوەرانمان مانەوەی درێژ خایانیان کاری تێیـان کـردووەو، تێـچونی قورسـە لـە تواناياندا نەك لە گوێڕایەڵییاندا، لە ڕەوشیاندا نەك لە ئازایەتییاندا، هـەر کەسـێ بیانناسێ ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەیانەوە دەڵـێ کاتـێ یـارانی لـە (بەدر) بوون: (اللّهم ان تهلك هذه العصابة لا تعبد في الأرض — خوایە ئەگـەر ئـەم دەستەیە لەناوبچن تۆ لەزەویدا ناپەرسترێت)و، داوای وەڵامدانەوە میری بڕوادارانی سەردارمان دەکات. پاپای فەڕەنگەکان -پاپای ڕۆما- هەموو شتێکی حەڵاڵی لـێ حەرام کردونو، هەموو شتێکی عەمبارکراوی لـەناودا دەرهێنـاونو کلێـسای لـێ داخستونو، خۆیو ئەوانی شمشێرییان هەڵگرتووە، فەرمانی داوە هەر ئاوا بمێننەوە، یان گۆڕی مەسیح رزگار بکەن —ئەی خەلیفەی محمد ﷺ تۆ خەلافەت بە شـێوازێ لە ئومەتی دا بکە کە شوێنی نووستنی ئەو دڵنیا بکەیتو مافـەکانمان پـێ بـدەو، ئێمەو مسوڵمانان لای تـۆ ڕاسـپاردەی ئـەوین، ئەگـەر لـە ڕونو ئاشـکراییدا لـە دادگەریدا بە دڵ برینـدارکردن نەگـەڕا بایـەوە (سـەلاحەددین) دەیـوت: چـاوەکان ناگرینو، دڵان نابـەزن. بـەڵام خـۆڕاگرەو بـە نیـازی پاداشـتی خـوداو چـاوەڕوانی سەرکەوتنی چاوەڕوانکراوی خودایە، خوای من من تەنیا خـۆم شـك دەبـەمو خـۆم هەیە، ئەوەتا مولکی من لە پێناوی تۆدا بەخشراوە، لەگەڵ براکەمـدا کۆچـێکمان کردووە تکاکارم قبوڵو گیرا بێت، لەگەڵ کەڕەکەمـدا، کـوڵمی دەمو چـاوی ئـەوانم بەخـشییە دوژمـن منـی تـۆ، ئـەوەی تـۆ خۆشـت دەوێ بـە لای منـەوە کەمـە لەبەرامبەرئەوەیدا کە من پـێم خـۆش نیـە لەناویانـداو، ئـەوەی ئەوانـەش پێیـان ناخۆشە، لەم سنورەدا دەوەستم، فەرمان بۆ خوایە لە ڕابردوو لە ئایندەدا)[1]. ئایـا پێت وایە ئەم هەناسە پڕ لە بڵێسانە پێویستی بە لێکدانەوەو ڕاڤە بێت؟.

---

١) الروضتين/ ٢/ ١٥٧.

# قـــازی (فـــاضـل)

ژیاننامەی (سەلاحەددین) تەواو نابێ هەتا ژیاننامـەی ڕاوێـژکاری ئەمینـداری نەخەینە بەر چاو کە هاوڕێی ڕاوەرگێراوی ئەو بوو، خـاوەن نهێنـیو چـرپەی ئـەو بووە، کە:

قازی (فاضل)ە، ئەم وێژەرە گەورەیە سێبووریو خەم ڕەوێنی ئەو بـووە لـەکاتی تەنگانەداو، (سەلاحەددین) لای ئەو نهێنی خۆی داناوەو متمانەی پێـی هـەبووەو، هەتا لای نزیکترین خزمی خۆی ئەم نهێنیانەی باس نەکردووە، براو ئـامۆزاو زاوای خۆی تاقیکردنەوە،بینی بەر لەوەی لەسەر مەسەلەی خەبات قسەیان بکەن بە یـەك ئەوانە بۆ خودی خۆیان کار دەکەنو، بە دڵ نەبوونو پەسەند نەکردنی لە قـسەکانی ئەواندا دەبینی کە ڕقو خەفەتی لە دەروندا پەیدا کردبوو، تەنیا بە ئاخافتن لەگـەڵ ئەم برادەرە خۆشەویستەیدا ڕقو توڕەیی دەنیشتەوە.

قازی (فاضـل) لە زیرەکیو دڵسۆزیدا لە ئاستێ دابوو کە توانا لە دوای توانـای پێدەدات، چونکە ئەو زیرەکییەی ڕێگای پێنەدەدا کەموکوڕی لە خێزانی شا (ناصر) بگرێو لە خزمەتی ئەو دابێ، هەر چەند لە سکاڵای خۆیدا کەموکوڕییان لێبگـرێو گوێی بەو قسانە نەدەدا کە دەهاتنە بەرگوێچکەیو بێ لەسەر ڕۆیشتنو ڕاڤە بێدەنگی لێدەکردو دڵسۆزی ئەو هانی دەدا کە لە ئاژاوە بێدەنگی بکات کە نزیکە ڕویـدات، خۆی دەخستە شوێنی (سەلاحەددین)و زۆر ئەگەری گریان دادەنـا، دەسـپێکەکانی دادەناو ئاکامەکانی ڕون دەکردەوە، ئەنجا چاوپێکەوتنی لەگەڵ هاوڕێو گەورەکەیدا دەکرد کە بەڵگەی ڕۆشنی بە دەست هێناوەو، ئەنجا ڕای خۆی بە سەلماوی ڕێنـوێنی یەوە باس دەکرد، ئەمەش ئەم ڕایە بوو کە (سەلاحەددین) هەڵیدەبژارد.

## قــازی (فاضــل) کێیــە[١]؟

ناوی (عبدالرحیم) کوڕی (عەلی)لخمی یەو، لە ساڵی (٥٢٩ ك)دا لە بـاوکێکی فەقیهو قازی ڕەگەز عەرەبیدا هاتۆتە دنیاوەو، باوکی ئەو پلەیەکی بەرزی هەبوو لە دادگای (عەسقەلان)دا، ئەم منداڵە گەورەبو،تا شکۆی خێزانە عەرەبی یەکی خۆیو پایەی قازی باوکی کە هاونیشتمانەکانی بە (القاضـی الاشـرف) ناویـان دەبـرد بـە چاوی خۆی بینی. قازی باوك وەلاّمی ئارەزووەکانی والی (عەسقەلان)ی نەدەدایەوە کە ناوی (مرتضی الطرابلسي) بوو، لە نێوانیاندا هەندێ کینە دروست بـوو، قـازی بە چاکی زانی کە ڕەنگە تەمەنی کەم مابێ ئەم کوڕەیەی لـە شـارێکدا نیـشتەجێ نەبێ کە والی یەکەی نەیاری بێ، بۆیە ئاماژەی بـەوەکرد دوای ئـەوەی کـە شـیری فیقهو ئەدەبو فەرموودەی نۆشی بۆ (قاهیرە) کۆچ بکاتو لەوێش برادەرو هاوڕێی باوکی هەیە دەستی دەگرن، ئەوەبوو خوداوەند هیوای هێنـــایەدیو پەیوەنـدی بـە (ابن الخلال)ەوە کرد کە سەرۆکی (دیوان الانشاء) بـوو پەیوەسـت بـوو پێیــــەوەو لەســەر دەســتی ئــەودا ڕاهــات، ئــەنجا بینــی کــە پــێش کــار بەدەســتانی دیــوان ناکەوێتەوەو، ئەوان پتر بە فەرمانڕەواوە بەندن، بۆیە بیری لەوە کردەوە کـە بـاوکی لە (ئیسکەندرۆنە) هاوڕێیەکی تری هەیە بەنــاوی قازی (ابن حدیـد)و، لــە نێـوان ئەوو باوکیدا نامە گۆڕینـــەوەی دینیو ئەدەبی دۆستانە هەیــە، بۆیــە بــۆ (الثغـر) باری کردو، قازی لە پایەکی بەرزی دایەو لە دانیشتنی قــەزاییو دادگــایی خۆیــدا نووسیو، نامەکانی بۆ کاربەدەستانی (قاهیرە) بەرزکردەوە کـە زیرەکـــی ئـەویان تێدا بوو.

---

١) پێشـتر ئاماژەمان کرد کە (صلاح الدین) قازی گــەورە (عیسای هــــەکاریشی) لەگەڵدابووە، کە (صلاح الدین) ڕاوێژی پێی کردووەو، هەر ئەویش بو پشتگیری لە (صلاح الدین) کرد کە بە سەرکردە هەڵبژێردرێت، وە یەکێ بووە لە میرەکـانی دەوڵـەتی ئـەییوبی. پێشـتر لـە پـەراوێزدا کورتـە ژیانـەکمان لەمـەڕ ئـەودا باسکردووەو، پێویستی بە دوبارە کردنەوە ناکات. هەرچی نووسەرە بە کورتی لە نـاو بابەتـدا ئامـاژەی بـە ناوی ئەو ڕۆڵی گرنگی ئەو کردووە. (وەرگێڕ)

هەندێ لەو نامە وشیارکەرەوانە تایبەت بوون بە وەزیر (عـادل ابـن زریـك)ەوە، شێوازەکانیانی بینیو سەرنجی ڕاکێشانو وتی: قازی (ابن حدید) فەقیهـەو خامـەی ئەو ناگاتە ئەم ئاستە، بۆیە بە شوێنیدا نارد کە نووسـەری ئـەم نامەیـە حەواڵـەی (قاهیرە) بکرێ، ئەوە بوو خێرا بە شانـسی بەختـەوەری خـۆی شـادبوو، (العـادل) هەڵیبژارد، بەڵام سیاسەت لەسەر یـەك ڕەوش ئـارام نـاگرێ، ئـەوە بـوو (العـادل) بەدەستی (شاور) کوژرا، بەڵام ژیان تەنگـەی بـەم بەنـدە بەزەییـدارە هەڵنەچـنی، چونکە میر (شجاع بن شاور) بە ئاستی ئەدەبی ئەو ئاشنا بـوو، بردییـە کۆشـکی فاتیمیو کردی بە نووسەری (العاضد)و کاری نامەنووسینی خەلیفەی گرتە دەسـت بۆ ئەوانەی نامەیان بۆ دەنووسیێ، لەوانە (نورالدین محمود)و نامەکانی زۆر بەدڵ بوو بۆ دەستو پەیوەندی خۆی دەیخوێندنەوە، هەروەها لەوانە (اسـد الـدین شـێرکۆ)و (سەلاحەددین) بەر لە هاتنی بۆ وڵات بەم پیاوە ئاشنا بوون.

ئەمە شانسی قازی (الفاضل) بووە، چونکە (سەلاحەددین) پرسـیاری لەمـەڕدا کردو جەختی کرد کە دەبێ پەیوەندی پێوە بکات، ئەنجا هەڵیبژارد کە زمان حـاڵی ئەوبێ لە نووسینی نامەکانیـدا بـۆ خەلیفـەکانو پادشـاکانو میــرو قەراڵـەکان، ئەویش شاکاری خۆی خستەڕو کە بە دڵـی (سـەلاحەددین) قـسە بکـات لـە هـەر شتێکدا ئەو مەبەستی بێت، ئەمەش پلەیەکی بەرزی خستە ناخی ئەوەوە، هەتا بە ئاشکرایی پێی دەڵێ: تۆ لای من لە خێزانو منداڵەکانم خۆشەویـستری. کاتـێ بـۆ غەزایەك دەچوو لە (قاهیرە)دا دەیهێشتەوە بـۆ هەڵـسوڕاندنی کارەکـانی ئـەوێو، نووسەری ئەو بوو ئەو داوای ڕاوێژی دەکردو وشەی ئەوی دەخستە ڕیـزی پێـشەوەی قسەی کوڕەکانی کە، لە شـوێنی ئـەودا دادەنیـشتن لـە دانیـشتنی حوکمـداو بـۆ فەرمانی ئەو دەگەڕانەوە.

لە هەندێ جەنگی دا لە وڵاتی شامدا لەگەڵیدا بووەو، بە مشور خواردنی سوپاو کەشتیگەلو بەڕێوە بردنــی نـاوخۆ هەڵـساوەو بـێ گەڕانــەوە بـۆ سـوڵتان بڕیـاری دەرکردووە، تا ئەوکاتەی (سەلاحەددین) گیانی بە خودا سپارد نـزیکترین هـاوەڵی

بووە، ویستی لە سەردەمی (عەزیز)ی کوڕی (سەلاحەددین)دا هەمان ڕۆڵ ببینێ بەڵام بینی (عەزیز) گوێی بۆ ناگرێ، کاتێ داوای لێکرد ئاشتی لەگەڵ شا (الافضل)ی برایدا بنوێنێ لە قسەی دەرچوو، بۆیە بە باشی زانی بە پاساوی نەخۆشی واز لە سیاسەت بێنێ، چونکە هەستی دەکرد وەکو سەردەمی ڕابردوی (سەلاحەددین) ناتوانێ کاری پێ بکات.

(عەزیز)) سەر ناکەوێ ئەمەش بە فیتی ئەوی دەزانێ، بە دوژمنی سەیر دەکرد نەك دۆست، بۆیە بیانوی بە نەخۆشی گرتو، لە دەسەڵات دورکەوتەوەو پەنای بردە بەر هێوری‌و هێمنی، تا ئەوکاتەی بەژوانی خوای گەیشتە وە بەڕێزدا دەنراو نەناسراو نەدەکرا[1].

---

١) لە (مشاهیر الکرد/ محمد امین زکی بگ)دا: ٣٨)دا هاتووە: {شا عەزیز کونیەکەی (ابو الفتح)ەو نازناوی (عماد الدین)ە کوڕی سوڵتان (صلاح الدین)ە لە (٨ جماد الاول ٥٦٧ ك)دا لەدایك بووە لە قاهیرەدا. لە (١٥) ساڵ تێنەپەڕیبو کە لە (٥٨٢ ك) بووە بە والی میسر. کاتێ باوکی گیانی بە خوا سپارد، بووە حاکمی میسرو، لە (٥٨٩) تا مردنی لە (٢٧ محرم/ ٥٩٥)دا مایەوە کە دەگاتە نزیکەی (٧) ساڵ ..... ئەم شایە لای گەل خۆشەویست بوو بەڵام نەیتوانی بەسەر هەندێ حزبی سیاسیدا زاڵ بێو، هەر لە منداڵییەوە وانەی دینی خوێندووەو، گۆڕەکەی لە نزیك گۆڕی شافعییە لە قاهیرەدا. لە (ل ك ٣٦)دا هاتوە: (شا: الافضل) ناوی (نورالدین)ە نازناوی (ابو الحسن علی)یەو کوڕە گەورەی سوڵتانەو، لە (٥٦٥ ك)دا لە دایك بووە. لای گەورە زانایانی قاهیرەو ئیسکەندەرونەو ئەدیبەکانی خوێندووەو، لە ساڵی (٥٧٩ ك) لە (١٤) ساڵی دا جێگری باوکی بووە لە میسردا. (تقی الدین عومەر) مامۆستاو پەروەردەکەری بووەو، کاتێ پێکەوە یان هەڵنەکرد (صلاح الدین) بە شوێنی دا ناردن لە ساڵی (٥٨٢ ز)داو، شا (الافضل)ی کردە والی لە سەر شامو تا تەمەنی گەیشتە (٢٠) ساڵی لە ژێر چاودێری باوکیدا مایەوە، لە (٢٥) ڕەبیعی دوەم ساڵی ٥٨٣ ك)دا بەشداری جەنگی (حطین)ی کردو (عەککا)ی داگیر کردو، بە فەرمانی باوکی حوکمی کردنو، ئەنجا دژ بە خاچییەکان جەنگا لەگەڵ باوکیدا لە (٥٨٨ ك)داو، لەو دانوساندنەدا ئامادە بوو کە لە نێوان سوڵتانو (ریتشارد شێر دڵ) ڕویداو، دوای مردنی باوکی سوریا بە میرات بووە موڵکی ئەو، دیسانەوە میرەکانی خێزانی ئەییوبی هەموو سەر بە ئەو بوون.

وەزیرەکەشی (ضیاء الدین ابن الاثیر) برای مێژونوسی گەورە ئەوەندە کارزانو سیاسەتمەدار نەبوو کە بتوانێ ئەم میرنیشینییە فراوانە هەڵسوڕێنێ، ئەم وەزیرە ناشیاوە کە لای شا دەسەڵاتی هەبوو توانی لە شکۆی میرو کاربەدەستە ناودارەکانی سەردەمی باوکی کەم بکاتەوە کە بە کاری ئەمرانە هەڵساون، بۆیە میرو قەرا لە پشتگوێ خراوو لابراوەکان لەسەر حوکم یەك بەیەك چون بۆ میسر، لەگەڵ بازنەی شا عەزیزی برایەکەی دەستیان تێکەڵ کرد، زۆری نەبرد کە شا (عەزیز) سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند لە میسردا. لە ساڵی (٥٩٠ ك)دا ڕوی لە گرتنی شام کرد، کەچی ئەم جیاوازییەی لە نێوان ئەم دوبرایە ڕویدا بە هەوڵو

تەقەلای مامیان شا (عادل)و هەندێ میرەکانی ئەییوبی نەما. بەلأم سالی دەەوم سەر لەنوێ سوپای میسر ڕوی کردەوە گرتنی شام، بەلأم لەبەر هەندێ هۆکار سوپا شای لە هیکرا بە جێ هێشت، بۆیە بە ناچارییەوە بۆ میسر گەڕایەوەو وازی لە شام هێناو، شا (الافضل) چو بۆ ئەوێ بە شوێنیداو بۆ جاری دووەم لەگەڵ شا عادل دا ڕێك کەوتن وبە هەوڵی قازی (الافضل) وەزیری باوکی نێوانی چاك کردنەوە.

شا (الافضل) بۆ شام گەڕایەوەو شا (عادل) لەگەڵ شا (عەزیز)دا لـە میسردا مانـەوە، بـەلأم سوپای میسر هەمیسان لە (٥٩٢ ك)دا بۆ سوریا گەڕایەوەو، شـام لـە دەستی (الافضل) شـا چـووە دەرەوە لـە بەرامبەر ئەمەدا قەلأی (صەرخەد)ی بچوکی دایە.

لەسالی (٥٩٥ ك)دا کاتێ شا (عەزیز) مردو، شا (عادل) دەسـتی لـە حـوکم هـەڵگرت داوای لـە شـا (الافضل) کرد کە بێ بۆ میسرو ببێ بەوەصیو جێگری شا مەنسور (کوڕە بچوکەکەی شا عـەزیز)و، شـا (الافضل)یش ئەمەی بە هەل زانی، تا دەسەلأت بەسەر شا مدا بگرێ، بەلأم (شا عادل) لە ڕوی وەستایەو، بواری نەدا بە ئاواتی خۆی بگاتو، بارودۆخی نێوان (الافضل)و ئەوان شێوا ئەنجا تەنگەتاویان کرد، تا لـە (ڕەبیعی دووەمی ٥٦٩ ك)دا تەسلیم بوو بە ناچارییەوە بۆ قەلأی (صرخد)ی بچوك گەڕایەوە.

لە سالی داهاتوودا لەگەڵ شای برای (الظاهر) سەرکاری (حەلەب) ڕێك کەوتو بـەڵێنی ئەوەیانـدا کـە شام بگرنەوە، لەسەر ئەم قسەیە شا (الظـاهر) بە سوپاوە چووە سەر شامو تۆقی داو، ئەگەر لەبەر نـاکۆکی ئەو دوو برایە نەبوایە زۆری نەمابوو کـۆنترۆڵی بکـەن کـە شـا (ظـاهر)ی لـە شـامو تـۆقکردنی دەسـتی هەڵگرتو گەڕایەوە، دوای ئەم شکانە شا(الافضل) بۆ (الحمص) گەڕایەوەو، ماڵو خێزانی خۆی کۆکردەوەو چووە (صرخد)، بەردەوام پەیوەندی بە شا عادلـەوە دەکـردو داوای بـەزەیی لی ێ دەکـرد، تـا لـە سـالی ئایندەدا قەلأی (نجم)و (سەروج)و (سەمیصاد)ی پێدا ،کە لە (٥٩٩ ك)دا لێـی سـەندبوو، لای شـا عـادل هیچ پەیوەندییەکی باوکیو کەسو کارێتی ئەوی دەست نەکەوت، بۆیە قەلأی (سەمیصاد)ی قـایم کـردو، ڕایگەیاند کە خۆی دەخاتە ژێر ئالأی (رکن الدین سلیمان)ی سەلجوقی دووەمەوە لە (ئەنادۆڵ)دا.

پاش ماوەیەك ویستی لە ڕێگای(کەیکاوس)ی نەوەی سێیەمی ئـەم حاکمـە بڕواتـە (حەلـەب) لەوێـدا حکومەت دروست بکاتو شانسی خۆی تاقی بکاتەوە، ئەمەش دوای مردنی شـا (ظـاهر) لەوێـدا، بـەلأم ئەم تەگبیرەش سەری نەگرتو ئاژاوەی خێزانی ڕویـداو، شا (الاشرف) کوڕی شـا (عـادل) لـە (٦١٥ ك) خۆی تێوە گلأند.

ئەم شایە بێشانسە زانی دوای ئەم ئەزموونە سەختە بەخت یاوەری نیە بۆیە وازی هێناو گەڕایەوە قەلأی (سەمیصاد)و لەوێدا بە گۆشەگیری سەری نایەوە دور لە پلانو سیاسەت، ئەمەش لە (٦٢٢ ك) دا....}.

بێگومان خوداوەند دەفەرموێ: {ولا تنـازعوا فتفـشلوا}. واتـە: نـاکۆکی مەکـەن ئـەگینا سـەرناکەون. ئەمەش یاسایەکی مێژوییەو گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەم هۆیە دەولەتی گەورەی ئەییوبی ماڵ ئاوایی لـە دنیا کردو دەسەلأتی بۆ مەمالیکەکان بەجێهێشت. دیارە ئەم نمونەیە کیفایەتە بۆ هۆکارەکانی رووخـانی دەولەتی ئەییوبیو نەمانی دەسەلأتی ئەوان لە جیهانی ئیسلامیدا. وە زۆر کەس گلەیی دەکات کە (صلاح الدین) هیچی بۆ کورد نەکردووە، یان هەیە دەلێت: {ئەگـەر پێگـەی خـۆی لەسـەر زەمینـی زاگـرۆس دا نابایەو هەمان کاریشی لە ئازربایجانو ئەرمەنستانو تۆروسشدا کردبایە ئەوا چاکەیەکی ئـەوتۆ بـەردەوامو دەکرد کە نەك تەنیا گەلەکەی خۆی بەلکو هەموو ناوچەکەش لەژێر سێبەریدا هەتا هەتا دەحەسایەوە}.

دکتۆر (عبداللطیف حمزة) بەم وتارە بەنرخـە لەمـەڕ قـازی (الفاضـل)ەوە قـسە دەکات کە لە گۆڤاری (الثقافـة)[1]دا بڵاوی کردۆتەوەو، لەوێدا هاتووە، کە ئێمە بە هەنـدێ دەسـکارییەوە دەینووسـین (لـە سـەردەمی –سـەلاحەددین-دا چـوار سەرکردایەتی بە (الفاضل)ی قازی سپێرابن کە ئەمانـەن: سـەرۆکایەتی سیاسـی‌و، سەرۆکایەتی کۆمەڵایەتی‌و سەرۆکایەتی زانستی‌و سەرۆکایەتی ئەدەبی‌و وێژەیی.

لەمەڕ گەورەیی سیاسی ئەودا ئەوەندە بەسە کە (سەلاحەددین) بڵێ: (مـن وڵاتم بە شمشێرو ڕمی ئێوە بە دەست نەهێنـاوە، بەڵکو بە قەڵەمی قازی فاضـــل

---

(کوردو کوردستان/ ئارشاك سافراستیان / ل٥١). بەڵام ئێمە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم بۆ چونە سیاسی یە بەڵگەمان زۆرە لە مێژودا کە زۆر دەوڵەت‌و ئیمپراتۆری هەبووە لەسەر خاکی خۆیان پایتـەختییان دانـاوەو دەوری خۆیان قایم کردووە کەچی بە هۆی شەڕی ناوخۆو ناکۆکی لەناو دەسەڵاتی ناوخۆدا لێك هەڵوەشاون‌و دەسەڵاتیان لەدەست داوە.

پێش دەوڵەتی ئەییوبی زۆر دەوڵەتی تر هاتوون‌و ماڵ ئاوایی یان لە دنیا کردووەو، دوای ئەویش چەندان دەسەلات‌و ئیمپراتۆری یەتی تری گەورە هات و، هەموویان ڕۆیشتن‌و نەیانتوانی لەسەر کورسـی بمێننـەوە، کەواتە: هۆکاری سەرەکی روخانی دەوڵەتی ئەییوبی بۆ جەنگی ناو خۆو ناکۆکی بنەماڵەیی دەگەڕێتەوە لە دوای (صلاح الدین)داو، ئەگەر بەم ناکۆکیەوە هاتبانە هەولێرو زاگرۆس‌و هەر ناوچەیەکی تری کوردسـتان بێگومان چر کەیەك لە تەمەنی ئەم دەوڵەتە زلەیە زیادی نەدەکرد. ئەم ناکۆکی یەش بە درێژایی مێژوو لە کەسایەتی کورددا هەبووە، بۆیە نەیتوانییوە کە قەوارەیەکی سیاسی بۆ خۆی دروست بکات. (محمد امـین زەکی بەگ) لە (خلاصە تاریخ الکرد وکردستان)دا دەڵێ: {بەڕاستی مێژو ئاوێنـەی پەنـدو ئامۆژگارییـە، پێویستە مرۆڤ بەوردی لێی وردبێتەوە، تا سود لەوانەکانی‌و پەند لە ئامۆژگارییە پاراوەکانی وەربگـرێ و، نەکەوێتە ناو ئەو هەڵانەوە کە ئەوکەسانە توشی هاتوون کە مێژو هەڵەکانی هەڵگرتوون‌و پاراستون. پێشتر باسکرا، کە هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی شۆڕشە کوردییەکان ئەو نەزانییە بووە کە لە نـاو ئەنـدامانی تاکەکان‌و پیاوە خێڵەکییەکاندا بڵاوبۆتەوە، ئەنجا میرو کاربەدەستانی هەڵسا بەم کارە ئاگایان لـە ڕەوشـی دەوروبەرییان نەبووە، ڕابردو ئاوا بووەو ئیمڕۆش هەر ئاوایە}.

(میجر سون) دەڵێ: {کورد ئازاو دلێرن‌و ناشکێن و، مل بۆ کەس کەچ ناکەن‌و، قەت ملـی بـۆ کـەس کەچ نەکردووەو، قەت نەشکاوە لە جەنگی ناو خۆی دانەبێ ......} الاسس النفسیة والاجتماعیة للقبائل الکردیة / هاشم طه عقراوي/ بغداد/ ١٩٧١/ ل ١٣٨.

کەواتە: پێویستە ئێمە گلەیی لە (صلاح الدین) نەکەین بە لکو گلەیی لە کوڕەکان‌و نـەوەکانی بکـەین کە دوای خۆیان لەسەر دەسەڵات‌و پایە کورسی خۆیان لەدەسـتداو، دەوڵـەتی ئـەییوبییان ڕوخانـدو ئـەوان بەرپرسی یەکەمن! کە نەك هەر زیانی بە کورد گەیانـد بـەڵکو زیانـەکی گـەورەیی بـە هـەموو جیهـانی ئیسلامی گەیاند. (وەرگێڕ).

[1]) مجلة الثقافة/ عدد٢٦٧ / ٨ / ٢ / ١٩٤٤ / ناونیشان: (ادب القاضی الفاضل) (نووسەر).

دەستەبەرم كردووە).

بەڵام دەسەڵاتى كۆمەڵايەتى (فاضل) ئەوەندەى بەسە كە سەرجەم شاعيرانى سەردەمى خۆى پێ يان هەڵاوتووەو ستايشيان كردووەو هەريەكە ويستويەتى ڕێزى ستايشى ئەوو سوڵتان بەدەست بێنێت..... هتد. بەڵام گەورەيى زانستى (الفاضل) لەوەدا خۆى دەردەخات كە بە پراكتيككردنى ئەم پلانە زێڕينە هەڵساوە، ئەم پلانەيەش (سەلاحەددين) لە وڵاتى (ميسر)دا دايهێنا، پوختەى ئەمەش دروستكردنى حوجرەو قوتابخانەى زانستىو جەنگ كردن بوو لەگەڵ بڕواى فاتيمييەكاندا، سوڵتانو وەزيريش هەردوكيان لەم پلانەدا كە كێشابويان سەركەوتن، قازى خۆى سەرپەرشتى ئەم بزاڤە زانستييەى دەكردو، زانايانى هانئەدا بۆ نووسينو بەرهەم هێنان.

بەڵام مەزنى ئەدەبى ئەو شيعرو هەڵبەستەكانييەتى، ئەوەى سەيرە خەڵكى زەعامەتى سياسىو زەعامەتى كۆمەڵايەتى (فاضل)يان لەياد كردووەو تەنيا زەعامەتى ئەدەبى ئەويان بە زيندويى لە هزرياندا ماوە، وەك بڵێى ئەدەب لەناو سەرجەم ڕێبازەكانى ژياندا بەتەنيا دەهێڵرێتەوە)[1].

ئەوەى لێرەدا سەيرەو دكتۆر قسەى لێدەكات، كارێكى ئاسايى يە لە مێژوداو هەر كەسێك شوهرەتى سياسەتو ئەدەبى هەبێ شوهرەتى ئەدەبەكەى بەسەردا زاڵ دەبێت، هەتا لە چاخى (الفاضل)دا نموونەمان هەيە بۆ ئەوە، ئەوە تامير (ئوسامة بن منقذ) كە جەنگاوەرێ بووە جەنگى كردووەو دەستكەوتى هەبووە، شاعيرێكى نووسەر بووەو، ئيمڕۆش خەڵكى بە شيعرو نووسين وەسفى دەكەن.

---

١) فكرەى بنەماڵەى (صلاح الدين) لە فكرەى عەبباسيەكان نزيك بووە وەكو لە قسەكانى (الظاهر)دا لەناو هەڵبەستەكانيدا بۆ خەليفەى عەبباسيدا كە سكاڵاى خۆى تێدا بەيان كردووە دەردەكەوێ، خەليفەى عەبباسيش هەر بە شيعر وەڵامى دەداتەوە، لە ژياننامەى (الظاهر)دا لە (مشاهير الكرد/محمد امين زكى بگ)دا تۆماركراوە. بەڵام لە مەزهەبدا عەبباسيەكان مەزهەبى حەنەفييان كردووە بە دەستورى وڵات. بەڵام ئەيوبييەكان زياتر شەيداى مەزهەبى شافيعى بوون، وەكو لە مێژودا ئەوە دەخوێنرێتەوە. هەرچى فاتيمييەكان بوون خولياى شيعەيى ئيسماعيلى بوون. (وەرگێڕ)

خوێنەرانی ئەم چاخەیە لە مێژودا شوێن پەنچەکانی قازی (فاضل) لەناو زۆر لە رووداوە گرنگەکاندا دەبینیێ، هەتا بەر لە هاتنی (سەلاحەددین)دا بۆ ناو وەزارەت، خەلیفە (عاضد) گوتی گوێی لە رای ئەو گرت لە هەڵبژاردنی (سەلاحەددین) لەکاتی دانیشتنی خەلافەت بۆ هەڵبژاردن ئامادەبوو، قازی سەرجەم پاڵاوتەکانی خستە روو، چاکەوخراپەی هەریەکێ لەو پاڵاوتانەی باسکرد، پاشان ناوی (سەلاحەددین)ی بردو ئاماژەی بۆ ئەو کردو، (عاضد)یش لەسەر راوێژی ئەو رێك کەوتو، ئەمەش هەڵوێستەك بوو، (سەلاحەددین) لەیادی ناکات.

(نورالدین) بە هێرشی خاچییەکانی زانیو، بۆ جەنگی ئەوان راپەڕی لە شامداو، (ئەموری) لە دەوڵەتەکەی ترسا، بۆیە بە پەلە پاشەکشەی کردە دواوە. لە جەنگی (کەرەك)یشدا دوای راوێژو پرس نەبێ خۆی بۆ جەنگ تەییار نەکردو، لەو جەنگانەشدا کە ئەوەی لەگەڵدا بووە لە هاورێتی ئەو دورنە کەوتۆتەوە، ئەگەر لە مەیدانی جەنگیش دورکەوتبێتنەوە، بۆ کارێکی بووە کە پەیوەندی بە مەسەلەکەوە هەبوبێتو، ئاکامەکەشی لەسەر ماندوبوونی دەوەستا، هەرکەسێکی کتێبی مێژووی (سەلاحەددین) بخوێنێتەوە لە سەرچاوە گەورەو تەواوەکانیدا لە زۆر شوێندا لەناو دێرەکانیاندا ناوی قازی بەرچاو دەکەوێ چونکە پیاوی دووەمە لەم مەیدانەدا.

قازی (الفاضل) بەمە ناوی دەرکردوە کە سەرداری ئەدەبی پەخشان (النثر)ی‌یە لە چاخی خۆیداو، رێگای خۆی هەیە لە نووسیندا،کە پێوەی ناسراوەو دراوەتە پاڵ خۆیەوە، مامۆستا (عەلی جارم) لەمەڕ ئەوەدا دەڵێ:

(نووسەران لەم سەردەمەدا بەو رێگایەی قازی (الفاضل)ەوە کاریگەربوون، کە لەسەر رێبازی (ابن العمید) دەڕۆیشتو بە قوڵبوونەوە لە (التوریة)و (الطباق)و (مراعاة النظیر)و بەشەکانی تری (البدیع)ەوە پەروەردە بووبو، بۆیە (الاسجاع)ەکانی درێژبوون، چونکە کارکردن بۆ ئەم جۆرانە نووسەر ناچار دەبێ زەمینەی بۆ خۆش بکات، پلان بۆ هێنانە دەستی بکێشێت، ئەمەش قسەی زۆری دەوێت، بەهرەمەندی قازیو ساغی سروشتەکەیو توانای زمانەوانیەکەی

نووسینەکەی لەوە رزگار بکات، کە بکەوێتە ژێر لاوازییەوە، زۆر لەوەی لەبەردەستماندایە گەواهی جوانی زمانپاراوی ووردەکاری داڕشتنو توانای سەرنج ڕاکێشانی خوێنەر بۆ ئەو دەدات، ڕای هەرچۆنێك بێ لەوەدا، کە حەز دەکات نووسینی هونەریەکە لەسەری بێت).

قسەی (الجارم) (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لەوەدا (سەرەنج ڕاکێشانی خوێنەر بۆ ئەوە دەدات ڕای هەرچۆنێ بێ کە حەزدەکات نووسینی هونەریەکەی لەسەری بێ) ئەوە دەگەیەنی کە زمانپاراوی (الذوق) گۆڕاوەو، شێوازی قازی (الفاضل) هەرچەندە سەرنجی ڕۆڵەکانی سەردەمی خۆی ڕاکێشا بوو، بەڵام شوێنی پەسەندی زانایانی (البیان)ی ئەم چاخە نیە، تەنیا بەو مانایە نەبێ کە بریتین لە چەند پەڕەیەکی پەرەسەندوی ئەدەبیو نووسینی هونەریو، زەمەن بەرەو شێوازی ئازادیو ڕەهایی (الانطلاق) بڕیویەتی.

تێبینی ئەوەم کردووە کە زۆربەی جۆرەکانی (بدیع)ی کە قازی (الفاضل) بایەخی پێداوە سەرچاوەکەی لە کتێبی خواوە بووە کە دەروازەیەکە گەیشتن پێی زەحمەتەو، تەنیا کەسێ پێی شاد دەبێ کە توانای تێگەیشتنی قورئانی ڕۆشنی بە حاڵی بوونەکی هۆشیارانە هەبێ، ئەنجا وەرگرتنەکەی شوێنی ڕاست بگرێ! چونکە زۆر لەوانەی ڕێچکەی ئەویان گرتووە بێ فێربوونو توانست لەو لێوەرگرتنەوە هۆگری بوون. هەوڵیان داوە لاسای بە شێوەیێ بکەنەوە کە بە بەهرەی ئەو شاد نەبوون، بۆیە وەرگرتنی ئەوانە لە شوێنی خۆی نییەو، ئەمەش کردارێکە دەبێ خۆی لێدورە پەرێز بگیرێ، چونکە شوێنە کە شوێنی کتێبی خودایە.

**من بە شێوەکی گشتی دو تێبینیم لەسەر ئەدەبی قازی هەیە:**

<u>تێبینی یەکەم</u>: مێژونووسان لە شیعرەکانی حاڵی نەبوونو بە ناوداری لەناو دارەکانی پەخشان ناویان بردووە لەسەردەمی خۆیداو، بەشاعیرێکی سەرکەوتوو ناویان نەبردووە، کەچی شیعرەکانی لە ڕەخنەی هاوچەرخماندا لە پەخشانەکانی

بەرزترن، چونکە لە زۆر لە شتە لاوازەکانی شتە جوانەکان رزگاری بووەو دیوانی ئەوم کە بە لێکۆڵینەوەی (د. احمد بدوی) دەرچووەو لە خوێندنەوەیدا لە دیتنی هەندێ لە پەخشانەکانیدا هەستم بە قورسی نەدەکرد، بەڵکو مانای قوڵو فراوانم بینی لەناویاندا نەك هەر بە روکاری وشەکان، قوڵی یەك کە بیر قوڵی بێ وێنەی ئەو پیشان دەدات لە سەردەمی خۆیدا، قازی کورِ بووە، درەوشاوەو جوان نەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا دڵەکی شەکاوەی هەبووە، شیعرەکانی هەر لەمەرِ (الغزل العاطفي)دا رِەوانە دەکرد، تا پیری بەسەردا هاتو، بەڵام شتێکی تازەی بەسەر دانەهێنا، چونکە نەخۆشیەکەی وابوو پیریەکی شاراوەی هەبوو، قازی دەڵێت:

فبلغت اول عمرى ارذل العمـــــر
فلم يزدني اشتعال الشيب فى الشعر
والشيب والشعر كانا ساكني خلدي
وانما انتقلا منه الى نظـــــري
كان الحِمام امام الصَّفوِ ارفق بـــي
من الحياة التنى أَفَضتْ الى الكــدر
عمرُ الفتى ليلٌ، والمـــوت صُبْحَتُه
والشيب بين الدجى والصبح كالسحر

ئەم هەڵبەستانە هی شاعیرێکی بە سەرنجو کارزانن‌و، ئەگەر قازی بۆ ئەم جۆرە رِامانە دەست بەتاڵ بوایە، فەیلەسوفەکی لە چەشنی (ئەبو عەلای مەعری) دەبو، یەکێ لەو شیعرە غەزەلی یە پرِ لە وردەکاریانەی ئەو، لەمەرِ ئافرەتەکی جوانی گۆرانی بێژە:

تـــلــذُّ بجنّتهـــــا أعين
وفيــــــها التي تجتنـــى الانفس

لها نکهـــــــة اذ تحيي بها
يغضُّ لــــــها عينه النـــرجس
وجاءت بعدد لها مطــــــرب
ارمّ لهــيبته المجــــــلس
ارى العود من قبلها اخرســـــاً
وفـي يد ها ينطـق الاخــــرس

ئێمــە کاتــێ قوتــابی بــوین لــە پــەیمانگای ناوەندیــدا (المعاهــد الثانویــة) هەڵبەستەکی قازی (فاضل)مان لەیاد ماوەو، سەرەتاکەی بە مانگی (ڕەمەزان) دەست پێدەکات:

قضى نحبــــه الصــوم بعد المطال
واطلق من قيد فتـر الهــــــلال
وروّض كاتب جنبـي اليميـــــــن
واتبع كاتب جنبــــــي الشـمال
فدع ضيفة مثل شد الاســــــار
الى فرجة مثل حلّ العقـــــال
فلا تذكــــــرن عهود الوصال
فعهدي بهـا والليالـي ليــــــال

تێبینی دووەم: ئەدەبو وێژەی قازی زمان پاراو (المسترسل)ە بەبێ سەروا (السجع) وتن بوو، ئەمەش ڕەنگێکە لە وردەکاری، کە لــە دەربڕینــەکی ســەرکەوتووەوە دەردەچێ. زۆر نامەی تایبەتی بۆ (سەلاحەددین) دەنارد لەکاتێدا لە غەزاکانیدا شا (ناصر) لە (میسر) دوردەکەوتەوە، من بۆیە بە غەزا ناویان دەبەم، چــونکە خەباتی (سەلاحەددین) بۆ خودا بووەو هاوشانی غــەزاکانی (بــەدر)و (ئوحــد)و غەزاکانی ترُبووە.

(سەلاحەددین) هەم لەکاتی سەرکەوتندا کە قازی نامەی بۆ دەناردو پیرۆزبایی سەرکەوتنی لێدەکرد، یان کاتێ دەشکاو نامەی دڵنەوازیی کردنی بۆ دەنارد بەقسەکامی ئەو زۆر دڵ خۆش دەبوو...... ئەوە تا لە جەنگی (عەککا)دا کاتێ (سەلاحەددین) شکا قازی بەمەی زانی، ئەوکاتە لە (میسر) بوو کە سوڵتان زۆر خەمبارو دڵتەنگە نەخواردنو دەخواو نە دەخواتەوە، بینی ئەرکی سەرشانییەتی کە نامەی دڵدانەوەی بۆ ڕەوانە بکاتو، ئەوە بۆ ئەم ڕستە نایابو، ڕەوانبێژیانەی هێنا کاتێ لەگەڵ (سەلاحەددین) دەدوێو دەڵێ:

گەورەم! ئەدی خودا سەیری ناو دڵانی خەڵکی زەوی نەکرد، کەسی تر بە شایستەو باشتر نەزانی هەڵبژێرێ بۆ بەرزکردنەوەی ئاینی خۆیو پەیڤی خۆی، ئەوەتا لە زەویدا سەیدەکان هەیە، کە نزیکی پێغەمبەرایەتین[1]، هەیە بە میرات پادشایەکی بە دەستەوە گرتووە، هەیە دەوڵەمەندو سەرمایە دارە، هەموو ئەوانەی دانیشتاندو تۆی هەڵساندو، ئەوانەی بێتاقەت کرد خۆی چالاكو گورج کردو، دنیای لای خۆشەویست کردو، لای تۆ ناپەسەند کردو، شمشێری ئەوانەی خستەوە کێلانو: ﴿وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾(التوبة– ٤٦).

ئەگەر ویستبایان دەربچن خۆیان بۆ ئامادە دەکرد چۆن خۆ ئامادەکردنێ، بەڵام خودا نەیویست بیان نێرێ، بۆیە بەستنییەوەو، نەفەرێ وتی لەگەڵ خانەنیشینەکان دابنیشن.

بەڵێ هی دوەم – لە هی یەکەمین گرنگترە – ئەوەبوو کاتێ وشەی کوفر لە تەواوی جیهاندا یەك دەنگ بوو، دەریاکان پڕ بوون کەسیان دوا نەکەوتنو، کەسیش نێوانی خۆیو ئێوەی بە دور نەزانیو، لەدڵی نەگریسیانەوە دەرچوونو، نە ماڵێ

---

١) سەیدەکان ئەوانەن کە بە نەژاد دەچنەوە سەر نەژادی حەسەنو حوسێنی کوڕی پێشەوا عەلی ڕەزاو سەلامی خوایان لێ بێت. (وەرگێڕ)

هەبوو پێیان بدرێو، نە پادشـایێ هـەبوو حوکمیـان بکـاتو، ئـەوان لـە هـەموو بەرزاییەکەوە دەهاتنە خوارەوە، گەورەم تۆ وەکو گوتراوە:

لسـت مليكا هازما لنظيره ولكنه الاسـلام للشرك هازم

تۆ لەناو گشت مسوڵمانانـدا دەسـتێکت نیـە تـەنیا بانگـەوازی نـەبێو، هـیچ خەباتگێڕێ لەگەڵ تۆدا نییە تەنیا بە زمان نەبێ، بۆ مەبەستەکی خۆی نەبێ لەگەڵ تۆدا نەهاتۆتە دەرەوە، کەس نەهاتۆتە بەردەستی تۆ بەکرێ نەبێو، کەست لەگەڵدا ڕازی نیە تەنیا بە زیادە پێدان نەبێت، هەنگاوەکانی ئەوانە یـەك بـست بـە باڵێـك دەگرێتو، بەرەو خودا بانگێشەیان دەکەیت، وا دەزانن بۆ مەبەستی خۆتان بانگیان دەکەیتو، داوای فەرێزەیان لێدەکـەیت وا دەزانـن داوای سـوننەتیان لێدەکـەیتو، بەهەستیان دەخەیە بەردەم، وا دەزانن تۆ خۆت هەڵێدەبژێری بێ لـە ئـەوان، ڕاکـان لەمەڕ تۆ وەکو یەك نین‌و، ڕاوێژەکان لە کۆڕی تۆدا جۆراوجۆرن، هەیە دەڵێ:

بۆ واز لە شەڕ ناهێنی؟ هەیـە دەڵـێ: بـۆ دەست بـۆ ئاشـتی درێـژ ناکـاتو، پەشـیمانە لـەو بەشـەی لەقیـسی چـووە، دەسـت بـۆ ئاینـدەیێ ڕادەکێـشێ کـە ڕێنوێنییەکی تێدا دەربکەوێ، بەندە دەیەوێ بەمە ڕوی خۆشی گەورەمانو سـینەی فراوانی نەگۆڕێ، تەنگـژەو تونـدی دەڕواتو تـەنیا بـاسو خوازەکـەی دەمێنـێو، کارەسات دەروی بۆ دەبێتەوەو پاداشتی دەمێنێتەوە).

ئەمە هەندێ نامەی دڵخۆشی دانەوە بـوون، نموونـەی لەمـەش جـوانتر هەیـە، چونکە شوێنەکە شوێنی ئەژماردن نیە، بـەڵکو شـوێنی بەڵگـە هێنانەوەیـە، ئـەم نامەیەم هەڵبژارد، چـونکە پارچـەکی زینـدووە لـە مێـژوی (سـەلاحەددین)و، بـە جوانترین شێوە وێنەی خەڵکی دەوری (سەلاحەددین) دەکێشێو، دەمامـك لەسـەر ڕوی هەندێ لەو کەسانە هەڵدەماڵێو ئابڕویان دەبات کـە لەسـەرەوە خۆشەویـستی پیشان دەدەنو لە دڵەوەش پلانو فێڵـی لێدەشـارنەوە، ئـەوەی بیـەوێ بگەڕێتـەوە داوای سەر شۆڕی دەکاتو ئەوەی بیەوێ تاڵانو دەسکەوتی شەڕی دەست بکـەوێ

بۆ جەنگ هەوڵ دەدات، نەك مەبەستی لە پاداشتە، (سەلاحەددین) بەدڵنیایی یەوە دەیانناسیێ، بەڵام دان بەخۆدا دەگریێو یان باسیان ناکات، وە ئەگەر خورپە شاراوەکانی لە نامەکی درێژدا دەخوێندەوە، دڵی پیێ خۆشدەبوو ڕوی دەگەشایەوەو، ئەمەش بەشێکە لەوەی قازی گرنگی پێداوەو، نامەی تری زۆری ناردووە کە لەسەر ئەم پیێو دانگەدا هۆنراونەوە!

نامەیەکی پەخشانی قازی (فاضل)م خوێندەوە کە بۆ (عبدالکریم)ی براکەی دەنووسیێ کاتیێ دەبینیێ بەوە لە خۆی بایی بووە، کەبرای قازی (فاضل)ەو خراپەی لەگەڵ پیاوەکی بەرێزدا کردوە کە میر (علم الدین) کوڕی (النحاس)ەو هەواڵەکە بۆ قازی (فاضل) گەڕایەوەو، ئەویش زۆر توڕە بوو، نەك هەربە مەرەکەب بەڵکو بەپیتی پشکۆ نامەیەکی بۆ ناردو، لەم نامەیەدا ئامۆژگاری تێدایە بۆ ئەوانەی بە خزمەسەرکردەکانیان خۆ چەپاڵە دەدەنو شتی خەڵك بە سوك سەیر دەکەنو بە پایەی ئەوان فریو دەخۆنو فیز لێدەدەن،کەچی لەلایەن ئەو کەسانەوە پشتیان پیێ بەستراوە چاو پۆشییان لێدەکریێ، بەڵام قازی (فاضل) کە ڕەسەنە بەسەر براکەیدا دەنگی بڵند دەکاتو دەڵیێ:[1] (سوێند بە خودا ئەگەر ئەم برینەی تیمار نەکەی، کە تۆ بریندارت کردووەو ئەو کارەی کردوتە چاکی نەکەی‌و لە دژی ئەو خراپە تیێ هەڵنە چیەوە کە نووسیوتەوە بەقسەکردوتە، قسەی من لەگەڵ تۆدا هەر بە نووسین نابیێو،ئەو هۆکارەش لادەبەم کە توانیوتە بەو هۆیەوە زیان بە هاوڕێکان بگەیەنی، هاوار بۆ ئەو کەسەی دەسکەوتی ڕۆژانەی ئەو گرێدانی دڵیەتی لەسەر کینەو ڕقو کردنەوەی زمانییەتی بۆ سەرزەنشتەو لۆمە، ئەگەر من هاوبەشی تۆ نابم لە هەرشتیێ دا کە تۆ بە ئەرکی سەرشانی خەڵکی دەزانی، وازم لێت دەهێناو کۆڵم لێدەدایت هەرچی دەت کرد کربات، بەڵام بێدەنگی خەڵکی لە ڕاست تۆڕا لە بەرامبەر چاکەی زۆری منەوەیە، چونکە تۆ تەنیا لە تورەکەی دەبەخشی،

١) ئەم نامەیە (کمال الدین العدیم) گواستویەوە لە ڕەشنوسێکدا کە مامۆستا (محب الدین الخطیب) خوێندویەوەو، لەبەش سێیەمی (الحدیقە (کەیدا (ل: ٢٨)دا هێناویەوە .

بەزەییەکت بەکڵۆڵی خۆتدا بێتەوە، ئەگەر سەیری دوێنێی خۆت بکەیت و، سەیری ئیمرۆشت دەکەیت بەزەییت بە شوێنی خۆت دابێتەوە لەمەڕ منداو بە زمانی ئەو پیاوە وەلام بدەوە، کە سوپاست دەکات، ئەگەرچی وەللاهی سەرکۆنەکردنی من ڕەخنەیەکە سەرکۆنەی تۆی پێدەکەم، ئەگەر نەمزانیبایە زۆر لەوەی کە لەبارەی تۆ کە گوتراوە لەڕاست ئەم پیاوەیەوە کەمێکە کە کردوتە ئەم قسانە تێوە دەسراندی کە لە کەسی ترمەوە سراوەندووەو، ڕۆژان فێری ئەوەتدەکەن کە لێی بێئاگا بوویتو، خودا پێشە سەرت بەرەو ڕەزامەندی خۆی ببات، شمشێرت بخاتەوە کێلانت لە ڕاست شەڕەکەتەوە، ئیتر حودا حافیز).

ئەم نامەیە تەنیا وەکو وێژەیەکی قازی ڕەوانبێژو خاوەن لۆژیك ناهێنمەوە، بەڵکو بۆ دەرخستنی ڕەوشتی جوانی ئەو یشمە کە شایانی ئەوەیە کە لە دنیای ڕەفتاری مرۆڤایەتی سەرکەوتودا پەیڕەوی لێ بکرێت

# ئاستەنگو تەنگو چەڵەمە

ئەگەر هیوایەتە زۆرەکانی (سەلاحەددین) دوای گرتنی (قودس) لەگەڵ ئەو گەمارۆیە دڵتەزێنەی دوای (عەککا) توشی هات پێکەوە بەوردی هاوسەنگ بکرێن دەبینی کە(سەلاحەددین) دوای جەنگی(عەککا) بۆی نەڕەخساوە کەمێك کامەرانی بەرچاو بکەوێ، ڕەنگە میرە مسوڵمانەکان هاوپەیمانییان کردبا لەگەڵیدا بۆ پشتیوانی، ئەگەر بەم سەیرییە ئەم کارەساتەیان کردبایە کە ئەمە تەنیا قەدەرێکە توشیان هاتووەو (سەلاحەددین)یش تەنیا یەکێکە لەوکەسانە کە ئەم قەدەرەی توش هاتووە، بەڵام میرەکان لەژێر فەرمانی هاندانی یەکێکیاندا کۆبوونەوەو، کە پێکەوە بەرەوڕوی (سەلاحەددین) بڵێن: میرەکان بۆ شارەکانیان دەگەڕێنەوە تا لەو شەڕە دوربکەنەوە کە هیچ قازانجێ لە بەردەوامبوونیدا نابینرێت.

(سەلاحەددین) زانی ئەم قسەکەرە بەتەنیا نیەو کەسانێ هەیە پشتی دەگرن. بۆیە دەنگی نەکر تا لەسەر ڕایەك یەك لادەبنەوە. پاشان بانگی قازی (بهاء الدين) کوڕی (شداد)ی کرد،[1] کە ناسۆرو خەمی هەڵڕێژێ: وە پرسیاری لەمەڕ بۆچونی

---

١) خاوەنی کتێبی (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية)یە، کە لەمەڕ ژياننامەی (صلاح الدين) نوسيويەتی‌و، ئیمڕۆ لە کتێبخانەکاندا زۆرەو، گرنگترین سەرچاوەیە لەمەڕ (صلاح الدين)داو تەواوکەری مێژوی) (ابن اثیر)ە لەمەڕ (صلاح الدين)داو، بە زۆری ژياننامەی ئەو کاتەی ئەوی تێدایە کە دوای گرتنی (قودس)ەو دەکەوێتەوە نێوان (٥٨٤ — ٥٨٩ ك) کە دوا تەمەنی ئەوە. هەرچەندە (ابن شداد) مێژونوس نەبووە بەڵام زۆر لە ڕاستنی یە مێژوەکان نیشان دەدات. ئەم قازی یە وەکو لە (وفيات الاعيان)دا هاتوە (ابن خلكان) مامۆستای ئەوبووە لە (موصل)داو، هاوڕێی دڵسۆزی باوکی (ابن خلكان) بووەو، هەر دوو کوڕی یەك هەرێم بوون، ئەو خەڵکی (موسڵ) بووەوو ئەو خەڵکی هەولێر بووە، (ابن اثير)یش خەڵکی جەزیرە بووەو، هەرسێکیان لە یەك سەردەمدا ژیاون.

خۆیدا لێدەکات لەبارەی ئەم ناکۆکیو ناتەبایی یەدا، قازیش ئاماژەی کرد کە میرەکانو قەڕاڵەکان لەگەڵ سوڵتاندا کۆبینەوەو، ئەو خاوەن شانو شەوکەوتێ بوو لە دڵی ئەواندا و، نەیویست جڵەوی کارەکانی لەدەست دەربچێ، بەڵکو دەستی پێکردو دەیوت: (لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ تەنگەتاو دەبوو لە هەندێ گرفتو تەنگانەدا بۆ غەزا بەیعەتی مردنیان لەگەڵدا دەبەست، ئێمەش نزیکترین لەوە بە پێغەمبەری خودا دڵنەوازی خۆمان بکەین، ڕای ئەوەیە لەتەك (الصخرة)دا کۆببینەوە لەسەر ڕێڕەوی سوێند خۆری پێغەمبەردا ﷺ ئێمە ببینە سوێند خۆری یەکتریو، زۆر نابات سەردەکەوین).

فەرموودەی پێغەمبەری خودا ﷺ هۆکاری ڕابونەکی زیندو بوو لە سینەی گوێگراندا و، دڵخۆشی خۆیان لەمەڕ ئەم بیستنەدا ڕاگەیاندو، (سەلاحەددین) دەرفەتی ئەم ڕابوونە نکاوەی قۆستەوەو وتاریداو وتی: (خەڵکینە بزانن ئێوە ئیمڕۆ بەتەنیا لەشکری ئیسلامنو، خوێنو سامانی مسوڵمانانی بەگەردنی ئێوەیەو، کەس نیە جگە لە ئێوە جەنگ لەگەڵ ئەم دوژمنە دەستریژیکەرە بکات، ئەگەر ئێوە پشت بکەنەوە بەواوی وڵاتی ئیسلام وەکو پەڕێ لەژێر پێی ئەودا دەپێچرێتەوەو، ئێوەش تەماشای دەکەن، سەرجەمی مسوڵمانان لە هەموو هەرێمەکانی زەویدا هیوایان بە ئێوەیە، چۆن ئێوە سەرشۆڕیان دەکەن، خوداش بەڵێنی سەرکەوتنی بە بەندەکانی داوە، کە بەسەر دوژمنیاندا زاڵ دەکاتو خودا لە پەیمانی خۆیدا پاشگەز نابێتەوە)!

---

ئەو لە موصلدا لە (٥٤٩ ك — ١١٤٥ ز) لە دایك بووەو، قازی قازیەکان بووەو، لە زۆر لە جەنگەکاندا بەشداربووەو، لەگەڵ قازی (فاضل)و (قازی هەکاری)دا پشتیوانی خوازی (صلاح الدین) بوون. وە لە (٦٣٢ ك)دا لە (حەلەب) مردووە. ئەو قازی سەربازگەی ئەو بووە هەم لە قودسداو، لە خۆشیو ناخۆشیدا هاوڕێی سوڵتان بووە. (بڕوانە النوار السلطانية /تحقيق احمد ايبش)، ئێمە کورتمان کردۆتەوە. وە (صلاح الدین) زۆر قازی تری کورد لە دەوڵەتەکەیدا خزمەتکاری بووە وەکو قازی (صدرالدین) کوڕی (عبدالملك) کوڕی دەرباسی کوردی کە لە (٥٦٦ ك)دا دەیکات بە قازی قاهیرەو، لەسەردەمی شا عادل دەبێ بە (شیخ الشیوخ) (مشاهير الكرد) سەیر بکە، سەرباری قازی (محي الدين ابو حامد)ی شەهرەزوری وەکو (ابن الاثير) باسی کردووە. (وەرگێڕ)

ئەنجا سوڵتان گریاو، هەموو گوێگرانی خستە ژێـر كاریگەرییـەوەو، هـەموویان ووتیـان: گـەورەمان! ئێمـە هـەموومان بەنـدەو خزمـەتكاری تـۆین، تـۆ بوویـت پەروەردەت كردینو گەورەت كردینو بـەهرەوەرت كـردین، ئێمـە تـەنیا گـەردنمان هەیەو، ئەویش ئەوەتا لەژێر دەستی تۆدایەو ئێمە واز لە سەر خستنی تـۆ نـاهێنین هەتا دەمرین! هەڵوێستە كە یەك لاكەرەوە بوو، بەبەرەكەتی ڕاوێژی (بهاء الـدین) ڕەوشو دۆخەكە بۆ ڕەوشەكی تر گۆڕا، سوڵتان كە مانی لە خواردن گرتبوو، چـاوی گەش بوون، بانگی نان بەر (الیمـاط)ی كـردوو هـەموویان بـەدڵی خـۆش نانیـان خواردوو سوربوون لەسەر نیازی خۆیان وەك خودا بیەوێ كە هێزی خەڵكەكە سەقام گیر بكات، هەواڵ هات كە شاكانی خاچـییەكان كەوتونـە كێـشە لـەناو خۆیانـداو دوبەرەكی كەوتۆتە نێـوان دووكـەس لـە گـەورەكانیان لـە سـەر تـەختی (بـەیتول مەقدس) لە دوای سەركەوتنیاندا، ئـەم كێـشەیە سـەری كێشا بـۆ دوژمنكـاریو دەستدرێژی كردنو (فلیپا ئۆگستوس) كە شای (فەڕەنسا) بوو شامی چوڵ كردو بـە دڵ تەنگی یەوە گەڕایەوە بۆ (ئەورووپا)و فەرمانی خۆی بۆ (شێردڵ — ریچاد) بەجێ هێشت كە شای (ئینگلترا) بوو، ئەمەش هـەمووی مانـای سەرشـۆڕی دەدات بـەم گەلەیەو، مانای یەك ڕیزیو پشتگیری یەكتری دەدات بـە مـسوڵمانان.(ڕیـچارد)ی ئینگلیزی بەر لەوەی سەیری كێشەی (مەسیح) بكات، لە بەرژەوەندییەكانی خـۆی دەڕوانی ئەمەش هانیدا بۆ هێرشكردن، دڵی بەمە خۆش بوو كە لە گرفتی گەورەی پاشای فەڕەنـسی ڕزگـاری بـوو، وە بـوو بـەپیاوی خـاوەن پایـە كـە لـە تـەواوی (ئەورووپا)دا دەنگـی بڵاوبێتـەوە، بـەو مانایـەی دوای مردنـی شـای (ئـەڵمانیا)و ڕاكردنـی شـای- فەڕەنـسی) ئـەو لـە بەرامبـەری (سـەلاحەددین)دا دەوەسـتێت، پاڵەوانەتی مەیدانی لەمەڕ ئەودا بڵاوبۆوە كـە گومـانی تێـدا نـەبێ، بـەڵام نـەك پاڵەوانەتی شاسوارەكی جوامێر، وەك هەنـدێ لـە نووسـەرانی خۆرئـاوا بـەم نـاوە وەسفی دەكەن تا لەڕێزی (سەلاحەددین)دا دایبنـێن! چـونكە واقیعـی ڕووداوەكـان ئەوە دەردەخات كـە پادشـا فێڵـەوان بـووە، لەكاتێكـدا لێبـوردەیی دەرخـستووەو جوامێری نواندووە تەنیا بۆ ڕاوكردنی نێچیرەكی بووە، نەك لەبەر ئەوەی پیـاوەتیو

جوامێرییە کە دەیبەخشێت. ئەمەش لەم نووسەرە ئەوروپییە شاراوەیە کاتێ لەمەڕ (ڕێچارد)ەوە وتویەتی:[1] (میرو قەڕاڵە دەرەبەگەکانمان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە

١) بێگومان (ڕۆشنبیری) نەخشە بۆ گەلان دەکێشێ‌و، ڕێگای مامەڵەکردنی ئوممەت لەگەڵ ڕوداوەکاندا دیاری دەکات‌و، ئایندەی میللەت دەستنیشان دەکات. ڕۆشنبیری ئیسلامی ڕەسەن کە ئایینی عیساو موساو ئیبراهیم‌و نوحەو، دواجار بووە ئایینی (محمد ﷺ) ئەو ئوممەتی ئیسلامی والێکرد شێوازەکی ئەدگار وەربگرێ لە ژیاندا، لە بیرو کردارو تیورو ڕەفتاردا، موسڵمانان سەرەتا کاتێ بەم ڕۆشنبیریە پەروەردە بوون نیوەی گوێ زەوییان ئازاد کرد. شێخ (عبد الله)ی (دەهلەوی) سەرکردە ساڵی (١٨٨٠ ز) وەکو لە کتێبی (کوردو کوردستان / ئارشاك سافراستیان / ل: ١٤٢)دا هاتووە {لە نوسراوێکی نهێنی دا بۆ کۆنسوڵی بوریتانی ڕاستی ئاین‌و بڕوای گەلی کوردی بەم جۆرە باس کردووە: گەلی کورد گەلێکی جیاوازە ،لە ئاینی خەڵکی تر جیایە، هەروەها یاساو داب‌و نەریتی جۆرەکی ترن}.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ جیاوازی سایکۆلۆجی کۆمەڵایەتی گەلان. بەهەر حاڵ ئیسلام ئەم قوتابخانەیە بوو کە توانی (صلاح الدین) دروست بکات‌و بیکات بەسەرکردەیەکی نموونەیی و، پاڵەوانی دنیای ئیسلامی لەسەردەمی خۆیدا. جیاوازی (صلاح الدین) لەگەڵ سەرکردەکانی ترو سەرکردەکانی خۆر ئاوا بۆ جۆری ڕۆشنبیری دەگەڕێتەوە، ئەمەش لەیاد ناکەین کە بۆ ماوە ورەچەڵەکیش ڕۆڵی خۆی هەیە ........ هەر بەم ڕۆشنبیریە توانی گەورەترین دەسەڵات پێکەوەبنێ‌و هەموو ڕەگەزو مەزهەبێ پێکەوە کۆبکاتەوەو، خۆرهەڵات لە دەست گەورەترین کارەسات ڕزگار بکات!

(ڕەفیق حلمی) لە یاداشت/ ب ٢/ ج٥ / ل ٣)دا لە لە خوار وێنەی (صلاح الدین)دا نوسیویەتی: {سوڵتان (صلاح الدین)ی (ئەییوبی) جێ ی شا نازی کوردو گەورەی پارێزگارانی خوا پەرستەکانی خۆرهەڵات بەرامبەر بە هێرشی عیسایی (خاچ) هەڵگرەکانی خۆر ئاوا}

ئەگەر لەبەر ناتەبایی کورو بنەماڵەی (صلاح الدین) نەبوایە دەوڵەتەکە دەمایەوە. وەکو (صالح قەفتان) لە (مێژوی گەلی کورد / ل ١٩٦)دا دەڵێ: {بە مێژو ساغ بۆ تەوە هەتا میللەتێ ئاژاوەی تێ نەکەوێ مێژوی ئەم میللەتە لە خۆیەوە ناگۆڕێت، باری حوکمەتانیش بەو پێ یە بەبێ ڕوداو لە خۆوە تێك ناچێ. جا حوکمەتی ئەییوبیش ئەو سا لەسەر ئەو پێ‌و دانگە ڕۆیشتووە ..........}.

گەورەترین نموونە لە سەر مەزنی (صلاح الدین) لای خۆرئاواکان ئەوەیە کە لە (مشاهیر الکرد/ل ٢٦)دا هاتووە: {کاتێ ئیمپراتۆری ئەڵمانیا هاتە سوریا، ویستی بچێ سەردانی گۆڕی ئەم پاڵەوانە بکات‌و لە تەك گۆڕی ئەودا گریاو دەسکە گوڵەکی لەسەر داناو، پاشان لە وتارەکەیدا کە لە دیمەشقدا دای دەربڕیست، کە: من دڵخۆشم بە هاتنم بۆ وڵاتێ کە پاڵەوانەکی وەکو (صلاح الدین)ی تێدا ژیاوە، ئەم پیاوەی کە بە دلێری‌و ئازایەتی بەرزو بێ وێنەی بەسەر پیاوانی سەردەمی خۆیدا زاڵ بوو، تواناو شان‌و شکۆی گەیشتە ئاسۆ}.

(میر محمد عەلی) دەڵێ: (سەخاوەت‌و کەرەم‌و بەخشندەیی ئەو لە ئاستێدا بوو، دوای خۆی (٤٧) دیرهەمی بەجێ هێشتبوو).

وە لە (مشاهیر الکرد/ ل ٢٦)دا هاتووە: {لە مێژوی مێژونوساندا هاتووە کە ئەوەی خاچییەکانی سەرگەردان کردبوو لەبەرامبەر –صلاح الدین-دا ئازایەتی‌و پیاوەتی‌و هێوری‌و جاهو پەیمانپارێزی ئەوبوو}.

سایەی پەیوەندیان بە عەرەبەوەو، لاساییکردنەوەیان ڕەوشتی زبرو سەختییان باش بوو، گەورەو شاسوارانمان فێری دڵ نەرمیو ڕەوشت جوانی بوون، بێئەوەی شتێ لە ئازایەتییان لە دەست بدەن، من گومانم لەوەدا هەیە کە نەسرانی بەتەنیا بتوانێ ئەم نموونە کارتێکردنە بینێت).

بەڵێ کاریگەری مسوڵمانان بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەوشتی ئەوروپییەکان وەکو ئەوروپییەکان خۆشیان باسیان کردوە گومانی تێدا نیە، بەڵام هاوتاکانی (سەلاحەددین) لە شاو قەڕاڵەکان لەم شوێنو ئاسەوارە دورن، ئەگەر باسی (سەلاحەددین) بکرێ کە سوور بووە لەسەر پەیمان ئەنجامدان، (ڕێچارد) مانای ئەم وەفایەی نەزانیوە، لەکاتێکدا لە ڕووداوی (عەککا)دا سەرکەوتو چووە ناو شارەکەوە پەیمانەکەی خستە پشت گوێوەو، تەواوی مسوڵمانانی ناوی گرت کە زیاتر لە (٣٠٠٠) مسوڵمان دەبوو، هەر هەموویان شمشێری لە دژدا بەکار هێنان، کەواتە: چۆن دەگوترێ ئەو نموونەی ئەو شاسوارییە یە کە ڕواڵەتی بەباشتر لە (سەلاحەددین)دا دەبینین.[1]

وە مێژونووسانی (ئەوروپا) هەموویان ئەوە دەزانن کە نووسیویانە لەمەڕ هەڵوێستی (سەلاحەددین)دا لەبارەی خاچ هەڵگرانەوە لە ڕۆژی گرتنی (قودس)دا ئەو لێیان بووراو لێ یانی گەڕا کە بێ ترس باربکەنو هەر کەسیش بێنێتەوە لە سەرو ماڵی خۆی دڵنیایەو، وە ئەوەی ئەم پەیمانشکێنە کردی لە ڕاست مسوڵمانانی (عەککا)دا (سەلاحەددین)ی هاندا کە تۆڵە لەدیلی خاچییەکان بکاتەوە کە ژمارەی بن دەستی ئەو لە ژمارەی مسوڵمانە شەهیدەکان پتر بوو ئاماژەی ئەمەی بۆ کرا، بەڵام ڕەفزی ئەوەی کرد کە پەیمان شکێنی لەگەڵ کەسانێ دا بکات کە دڵنیایی

---

(د: قاسم عبده قاسم) لە (ماهیة الحروب الصلیبیة / کویت / ل: ١٨٩)دا دەنوسێ: {صلاح الدین دەوڵەتی خۆی لەسەر یەکێتی ئایدۆلۆژیاو ئەخلاقی جیهانی ئیسلامی دامەزراند، کەسایەتی ئەو ڕەوشتو ئاکارەی هەبوو کە شایستەی بکات بۆ بنیاتنانی دەوڵەتێ، کە لە باکوری عێراقەوەو دیاربەکرو یەمەن لە باشوردا درێژبێتەوەو، لە خۆر ئاواشدا هەتا نیل، .......} (وەرگێڕ)

١) الناصر صلاح الدین/ د. عاشور/ ل٢٤١.

پێداون لەسەریاندا، چونکە ئەو پەیمان شکێنە بەڵێن ناگەیە نێتە جێی خۆی، هەڵـە لە بۆ چوونی ئەودا نابێتە پاساو بۆ هەڵەکە! ئایا دوای ئەمە دەکرێ کـە (ڕێـچارد) بەشا سوارەکی هاوشێوەی ڕەسەنێتی (سەلاحەددین) حیساب بکەین؟!

(ڕێچارد) لە دڵیدا ئـەم بڕوایـە دامـەزرا کـە دوای جـەنگی (عـەککا) قـودس دەگێڕێتەوەو، سور بوو لەسەر ئەوەی کە چەند هەنگاوەکی گوڵ بژێر کـراو بـۆ ئـەم ئاکامە چاوەڕوانکراوەی ڕای خۆی دەسـت پـێ بکـات، ئـەنجا هـەوڵی گێڕانـەوەی کەناری دەریا کەی دا لـە (عـەککا) وە بـۆ (عەسـقەلان)و ئـەو گونـدو شـارانەی دەکەوتە سەر ڕێگای وێرانو کاولی کردن.

بەڵام (سەلاحەددین) شوێنی کەوت، ئەویش ناچار بوو ڕو لە شوێنێکی تری دور لە سوپای (سەلاحەددین) بکاتوو پشتی بەو کەشتیگەلە فەڕەنگی یە ببەستێ کە بە تفاقو پیاوەوە دەهاتن، ئەنجا (حـەیفا)ی گـرتوو ڕوی لـە (قەیـساریە) کـردو، لەوێوە چووە، (ئەرسـوف)و هێزەکـی چـاوەڕوان نـەکراو یارمـەتی داو، لـە دەوری (ئەرسوف)دا جەنگێکی گەرم قەوماو چارەنووسەکەی داگیرکردنی شارەکە بـوو لـە دوای گەڕانەوەی مسوڵمانانداا.

داگیرکردنی (ئەرسوف) لای فەڕەنگەکان شوێنی حەشاردانی مەترسـی بـوو بـۆ سەرگیانی واتاییو ورە (المعنوی)ی سوپای ئیسلام. چاوگی نـاڕەزایی هەنـدێ لـەو میرانە بوو کە بە کشانەوەی تەواو جەنگە کەیان لەگەڵ خاچ پەرستاندا کۆتایی پـێ بێننو سوڵتان زۆر ماندوو شەکەت بوو، تا توانی ڕازییان بکاتو، پێیان ڕاگەیـەنی کـە ئەگـەر ڕیزەکـەیان لێـك بـترازێ مـسۆگەر (ریـچارد) هەڵدەکوتێتـە سـەر (بەیتولمەقـدس)و چـاوەڕوانی وەڵامـی نـەکرد کـە بـە پەلـە هەڵیکوتایـە سـەر (عەسقەلان)و، تا خاپوری بکات، تا نەبێتـە چـاوگی هێـز بـۆ دوژمنـان لـەکاتی پەلاماری چاوەڕوانکراوی قودسدا.

بەلایەوە دژوار بوو کە خەڵکی لە شار بڕۆنـە دەرو بـەنرخترین شـت کـە هـەوڵ دەدەن بیهێڵنەوە هەڵی بگرن، مژدەی پێدان هەر کـە قودسـیان گـرت هەرچـی لـە

دەستیان داوە پێیان بداتەوە، لەناوبردنی (عەسقەلان) چاوگی تۆقینی خاچییەکان بوو، بۆیە زەوتیان دەکرد، تا بیکەنە بارەگایەك بۆ بەڕێوەبردنی جەنگ‌و سود لەو خێرو بێرو ئازوقەیە سود وەربگرن کە لەناویدا هەیە، نیمچە جیابونەوەیەك لەناو قەراڵ‌و شاکانی خاچییەکاندا قەوما، ئەمەش لە ئاکامی تەماعی سیاسییاندا، (کۆنراد) پەنای بردەبەر (سەلاحەددین) تابیێ بە هاوپەیمانی ئەو لە ڕوی شای ئینگلیزیدا، بەڵام سوڵتان لە ئەنجامی ئەزموونە پڕ ژانەکانیدا زانی ئەوانە پەیمان پارێزنین‌و خاوەنی قسە نین بۆیە پێشنیارەکەی پەسەند نەکرد.

گومانی سوڵتان هاتەدی‌و، بینی (ڕیچارد) کۆبوونەوەی لەگەڵدا ساز دەکات، تا پلانەکی تازە داڕێژن، نیازی خۆیان گوت کە بەر لە کەژی زستاندا پەلاماری خۆیان دەست پێ بکەن، (ڕیچارد) چووە (الرملة)‌و (اللد) کە بە ڕێگای (بیت المقدس)دا بوو، (ڕیچارد) هەرچی سود بە دوژمن بگەیەنێ لایبرد، بەمەش لایەکی مەترسییە چاوەڕوانکراوەکانی بێ‌ترس کردو بەرەو (بیت المقدس) کەوتە ڕێگاو تفاقەکی باشی بۆ بەرگری ئامادەکرد، (شێر دڵ — قلب الاسد) لەناو سوپاکەیدا هەستەکی دینی بینی، لەو هەستە دینییە دەچوو کە پاپای کاتۆلیکی لە هەڵمەتی یەکەمدا زیندوی کردەوە، کاتێ غەزای کرد، ڕەهبانەکان لەپێشەوە دەڕۆیشتن (ئینجیل)یان دەخوێندو خاچیان هەڵدەگرت، سوپاکە زۆر بە پەلە نەڕۆیشت بۆ مەبەستەکەی، کە لە ڕێگادا مایەوە، وەك بڵێی پشوێ دەدەن بۆ ئامادەبوون بۆ هەڵوێستەکی چاوەڕێکراو.[1]

---

١) دکتۆر (مصطفی محمود) لە کتێبەکەیدا (اکذوبة الیسار الاسلامی/ دار المعارف/ ل ٧)دا دەنوسێ:
{....ستالین کڵێساکانی رووخاندو ڕەهبانەکانی گرت‌و کە شیشەکانی شار بە دەرکردو، فێربوونی دینی لە قوتابخانەکاندا هەڵوەشاندەوەو، ئیلحادی کردە مەرجەکانی سەرەکی ئەندامەتی لە حیزبدا .... بارو دۆخەکە بەردەوام بوو، تا ستالین توشی هەڵوێستەکی چارەنووس ساز بوو لە جەنگیدا لەگەڵ ئەڵمانیادا، هەموو هاوسەنگی یەکان ئاوەژو بوونەوە ...... کاتێ بینی جوتیاری ڕوسی پشتی لە دوژمن دەکات ..... کە بۆ بجەنگێ‌و بۆچی بمرێ، لە کاتێکدا سەرکردەی گشتی پێی دەڵێ: ئاخیرەت‌و زیندو بوونەوە دوای مردن نییە، هیچ پلەو ئیمتیازێ بۆ شەهید نیە بە سەرناپاکدا، بەڵکو هەموو دەچنە وە ژێر خاك ....... پاشان بەرگری لە چی‌و لەکێ بکات ... شیوعییەت ڕێبازی ڕەسمی دەوڵەتەو، دەبینێ نیشتمان پەروەرەی‌و، گەل پەروەری

ئەمەش زەمینەی بۆ (سەلاحەددین) سازدا شوێنە ڕوخاوەکانی شورەکانی شار قایم بکاتەوە، بەڵکو دەستیکرد بە دروستکردنەوەی شورەیەکی تازەو بەدەستی خۆی کارەکەی بەسەر میرەکاندا دابەشکرد، تا هەر میرێك لایەکی دیاریکراوی شورەکە چاودێری بکاتو بە ورە کاربکەنو ماندوبوونیان پێ نەزانێت، بەو هۆیە شورە قایمکە بەرزکرایەوە وەك بڵێی شورەکی نوێ بێت، نەك هەر شورە شوێنی بایەخی سوڵتان بوو، بەڵکو دەستیکرد بە هەڵکەندنی سەنگەر لە دەوریدا تا ببێتە کۆسپو تەگەرە لە بەرامبەر پەلاماری چاوەڕێکراودا.

مێژوونوسان دەگێڕنەوە کە سوڵتانی گەورە لەگەڵ منداڵی خۆیو منالەکانیو ناودارانی خێزانەکەی خۆی بەردیان دەبرد، تا نموونەی دلێرانە بێنێتەوە لە خێرایی تەواوکردندا، فەقیهو زاناکان دەیانبینی سوڵتان لە ماندوێتیان ئارەقەی لێ هەڵدەچۆڕاو ڕایانکرد کە کاری لەگەڵدا بکەنو، بەدەمیش قورئانیان دەخوێندەوە! وەك بڵێی خوداوەند وەڵامی بانگی ئەو کەسانەی دابێتەوە کە لە ڕێگای ئەودا وەك یەك ڕیز دەجەنگن، وەك بڵێی دیوارەکی ڕیزکراوی بینایەکن.

کاتێ (ڕیچارد) بینی بەزویی شورەکە بڵند دەکرێو سەنگەر هەڵکەنراوە ترساو لەدڵی خۆیدا وتی: ئەگەر ڕواڵەتەکەی ئاوای لێکرابێ ئەی لەناوەوەدا دەبێ

---

دواکەوتوییو کۆنەپەرستییە، کەواتە هەموو شتێ بۆ دۆزەخە ... مادام ئازاو ترسنۆك لە مردندا وەکو یەکتر بنو زیندوبوونەوەو پرسینەوە نەبێت.

لە بەرامبەر ئەم تێشکانە ترسناکە دا ستالین بینی ناچارە کە چالاکی بۆ جوتیارەکان بگێڕێتەوەو، دان بە بوونی پێویستی کەڵێسا دابنێو، دەرگاکانی کەڵێساکان بۆ نوێژ بکاتەوەو، چەوسانەوە لەسەر پیاوانی دین لاببات و، زیاتر لەمەش هەستی نیشتمانیو نەتەوەیی هانبدات .... ئەمەی بە ناچارییەو کرد هەر چەندە لەگەڵ بیر کرنەوەکەیدا وەکو شیوعییەکی مارکسی دژ دەهاتەوە، زانیارییەکان لە مۆسکۆ وە لە داهاتوودا بۆ هەموو شانە نهێنییەکان لە تەواوی وەڵاتدا گۆڕا کە جەنگ لەگەڵ دیندا نەکەنەوە، ئەم وەڵامە ئاسایی یە بدەنەوە کەمەسەلەی دین لە ئایدلۆژیای مارکسیدا باس نەکراوەو، شیوعییەت لەگەڵ مەسەلەی بڕوا بوون بە خودا دژایەتی نیە، بەڵکو مەبەستی دادوەری کۆمەڵایەتیو جەنگی زەوت کردنەو، ئومەمی یەت دژی نیشتمانەتی نیە ....}.

ئەمەش بە تەواوی ئەوە دەسەلمێنێ کە ئاین بە هێزترین غەریزەو هاندەرە لە ناو تەواوی غەریزەو ڕەمەکییەکانی ناو دەروندا! (وەرگێڕ)

هاندراوان بۆ بەرگری، حاڵیان چۆن بێ کە بەهێزترین تفاق‌و بەتواناترین پیاویان لەگەڵدایە، پاشان کشانەوەی بە باش زانی‌و بەرەو (الرملة) کشاوەو زانی بالۆرە بۆ هیوایەك دەڵێ کە هێنانەدی ئەستەمە.

مێژوونووسان بە درێژی باسیان لە زۆرێ لە ئاگربەستەکان زۆر کردووەو جوانترینیان ئەوەیە کە (ریچارد) پێشنیاری دەکات کە سوڵتان خوشکەکەی خۆی (جوانا) شا بۆ (شا عادل)ی برای بخوازێت کە یاریدەی بۆ ئاشتییەکی یەکجاری بدات‌و ئەم دوو هاوسەرە پێکەوە حوکمی (بیت المقدس)ی بکەن، لە میانەی مسوڵمانان‌و مەسیحیەکاندا دابەش ببێت، (شا عادل) پێشوازی لەم پێشنیارە کرد کە پیاوی دووەمە دوای (سەلاحەددین) لە شەڕەکاندا، دلێری‌و جوامێرییەکی نواند کە پەڕاوەکانی مێژوو بەڕێزو سەیرەوە دەیگێڕنەوە، بەڵام (شازادە) کەشیشەکان هەڕەشەیان لێی کرد کە لەبەهشتی مەسیح دا دەری دەکەن، (سەلاحەددین)یش لەمەوبەر هەستی بە مە دەکردو دەیزانی ئەگەرچی ڕازی بوونی خۆی ڕاگەیاندووە وەکو (شێر دڵ) بیری لێدەکاتەوە ئەم کارە ئەوەندە ئاسان نییە، ئەگەر ئیسلامیش ڕێگا بە شا (عادل) بدات ببێتە هاوسەری شازادەکی خاچییەکان، توندڕەوە کەشیشەکان ئەمە دەکەنە سەرچاوەی نەفرینەکی هەمیشەیی!

بەڵام ئەم پێشنیارە هەر چەندە نەهاتەدی، بەڵام ئەوە دەردەخات کە شای (ئینگلیز) بێزار بووبو، دیسان ئەمە دەردەخات، کە مەسەلەکە لای شێردڵ سەرسەختی خاچپەرستان‌و دەرکردنی مسوڵمانان نیە، بەڵکو مەسەلەکە لەسەر جاهو دەسەڵاتە، کە بەر لە هاتنیدا جەختی لەسەر کردونەو، گەورەترینی ئاواتەکانی لەسەر ئەم دوانە دامەزراندوە، کەچی لە هەوا زیاتر دەستی نەکەوت.

(کاتێ - ریچارد) بۆ (عەسقەلان) کشایەوە، دەستی بە بنیاتنانی شورەیێك کرد کە هاوشێوەی شورەی (قودس) بێت، تا لە شارەکەدا یەك بارەگای دڵنیا دروست بکات‌و، بکرێتە ناوچەکی ستراتیژی‌و هەڕەشەبێ بۆ سەر ئەو ئازوقەو بژێوییەی کە دەهێنرێتە قودس، ئەنجا هەڵسا نامەی بۆ میرو قەڕاڵەکانی خاچپەرستان

ڕەوانەکرد، تا لەگەڵیدا کۆببنەوە تا چەند وڵاتێ دیاری بکەن تایبەت بێ بە هەموو پادشاکانەوە، کۆنگرەیەکی گەورە سازکرا، کە پاڵەوانە ناودارەکان لەناویدا بەشدار بوون‌و ڕەوتی بەهێز بۆ (کونراد) بوو، کە بۆ پادشایەتی (قودس) بپاڵێورێت، چونکە بەئازاو دلێر ناسراوە، ئەم ڕێڕەوەش جێگای دڵخۆشی (شێر دڵ) نەبوو لەناخیدا، کە حەزی دەکرد ئەو پاڵەوانی دەستنیشان کرابایە، بەڵام نەیویست لەگەڵ ئارەزوێ دژ بوەستێ کە شوێنی کۆبوونەوەی غەیری سوپای خۆیەتی‌و ئەمەی لەدڵدا پاراست.

زۆری نەبرد (کونراد) دەستەکی نەناسراو تیرۆری کردو، مێژوونووسانیش لە یادکردنی بکوژ واقیان وڕماوە، هەندێ بۆ ئەوە دەچن کە (شێر دڵ) بۆسەی بۆ نابێتەوەو پیلانی لێگێڕابێ، هەندێ دەڵێن، ئیسماعیلییەکان تۆڵەی ڕابردوویان لێ‌سەندووە کە ئەوان خۆڕاگرێن‌و، لە هەلێکدا بە دزییەوە کوشتویانە، هەیە دەڵێ: سوڵتان ئەم پیلانەی بۆ داناو ئەنجامیدا.

ڕای دوایی لاوازترین ڕایە، چونکە (سەلاحەددین) قەت پەنای نەبردۆتە بەر پیلانگێڕی‌و ڕەشەکوژی (الاغتیال - تیرۆر)و شاسواری ئەو شاهیدی بێ‌تاوانی ئەو دەدات‌و قەت ڕابردوش دەستی بۆ ئەم جۆرە کارانە نەبردووە، ئەنجا ئەو دەیزانی (کونراد) نەیاری سەرسەختی (شێر دڵ)ە، چۆن ئەو هەڵدەستێ دڵی دوژمنی خۆی خۆش دەکات کە یەکەم دوژمنی (سەلاحەددین)ە! وەکو برادەرانی (سەلاحەددین) خۆشیان لەگەڵ (سەلاحەددین)دا بوون‌و، دوای ئەو ژیاننامەی ئەویان نووسیوەتەوە کوشتنی (کونراد)ی بە هۆکارێکی تری دڵە ڕاوکێیەکی نوێ ژماردووە، ڕاستە ئاماژەی تاوانبارکردن بۆ (شێر دڵ) دەکێشرێ، بە ڕاستی هەردوو بکوژەکانی دانیان بەمە داناوە لەکاتی وەڵامدانەوەیاندا، قسە ئەوەیە ئەوانە دەلەسە دەکەن تا گومان لەسەر بابای پلانگێڕی ڕاستەقینە لابەن: شوێنی ورد بوونەوەیە ئەگەرچی ڕاستەکەی ئەوەیە ئەم دوانە ئیسماعیلی (باطنی) توند ڕەوبونە، بەڵام دوژمنایەتی توندی ئیسماعیلییەکان‌و (سەلاحەددین) سوڵتانی مەنع دەکات کە ئەوانە بکاتە

ئامرازی کوشتنو ناپاکی کردن، چۆن ئەو لە ئەوان دڵنیا بووە، ئەم کۆمەڵانە دەیان پلانیان بۆ کوشتنی ئەو بەدزییەوە داڕشت، بەڵام هەموویان فەشەلیان هێنا[١].

ئەو جەنگو شەڕانەی دوای تیرۆرکردنە کە لەنێوان مسوڵمانانو (ڕێچارد) قەوما دەروازەی هیوای بە ڕودانەکردنەوە، بەڵکو زیاتر نائومێدی کردن، هەر چەندە مسوڵمانان بەهۆی ئەم کارەساتانە لەو ڕووداوە یەك بەدوایەکاندا توشیان هات، ئەو ئازایەتیەی نواندییان بۆ پاراستنی قودس بووە شوێنی نموونە پێهێناوە، پاڵەوانەکان لەکاتی ڕۆیشتنی سوپای فەرەنگیدا لە (عەسقەلان)ەوە بۆ (بیت المقدس) سەریان نایە دویانو بەرلەوەی هەردولا تێك ئاڵێن زۆریان لەدەستداو، نەوێران بچنە ناو شارەوە.

پاشان هەواڵ هات کە ئەو کاروانەی لە(یافا)وە دەهاتو بژێویو ئازوقەی پێویستی هەڵگرتبوو (میر بەدرە ددین دلدرم) کە یەکێ بوو لە سەرکردەی مسوڵمانان دەستی بەسەردا گرتووە.

لە دوای شەڕێکدا کە هەرچی پێویستی بوو لەدەستی دان[٢].

١) ئیسماعیلییەکان وەکو (المنجد فی الاعلام)دا هاتووە: ئەوانەن دەڵێن: {دوای (ئەبو جەعفەری صادق)(ر) حەزرەتی ئیسماعیل ئیمامەو، ئەوانە لەم قسەیە دا نەبێ لە مەزهەبە ئیسلامییەکانی تر جیاواز نەبوون، هەتا خەلافەتی (المستنصر)ی فاتیمی هات، دوای ئەوەی کوڕەکەی (احمد مکستعلی) خەلافەتی وەرگرت کۆمەڵێ ئیسماعیلی جیابوونەوە کە (حسن) کوڕی (صباح) ڕابەڕایەتی دەکردن و، بەیعەتیان بە (نزار)ی براکەیەوە کرد، دوای ئەوەی شۆڕشیان لە ئەسکەندەرونە سەری نەگرت (حسن) بۆ (قلعة الموت) ڕۆیشت. کاتێ (حسن بن محمد) سەرۆکی (نزار)ییەکان لە (٥٥٨ ك/ ١١٦٢ ز)دا هەڵوەشاندنەوەی دروشمە ئاینیەکانی ڕاگەیاند، هەم قەدەغەکردنی فەرزەکان، نزایەکان یان حەشاشیەکان لە یارانی مەزهەبی ئیسماعیلی فاتیمی جیابوونەوە، کەچی تا ئیمرۆش ناوی (اسماعیلیە) هەڵدەگرن. ئەوانە پەیڕەوانی ئاغا خانن، بەڵام ئەوانی تر بە (البهرة)و (السبعة) ناسراون} . هەندێ دەڵێن: (الباطنیة) چونکە بڕوایان وایە هەموو دیاردەیێ ناو جەرگەی خۆی هەیە وە گوتراوە یەکەمجار (میمون القداح) کە پەروەردەکەری ئیسماعیل بووە بە دروستکردنی ئەم ڕەوتە هەڵسا بێت. ئەم ڕەوتە بە فیداکارو خۆبەخش لە مێژوودا ناسراون. بەڵام زۆری لە مێژونوسان ئەم تۆمەتە لەسەر (میمون) لادەبەن. (وەرگێڕ)

٢) بەپێی (تعلیقات)ی (احمد ایبش) لەسەر (النوادر السلطانیة)دا: سوڵتان سوردەبێ لەسەر ئەوەی کە نابێ (عەسقەلان) بە دەست فەرەنگەوە بمێنێ، چونکە لەوە دەترسا جارەکی تر هەوڵی داگیرکردنەوەی میسر بدرێت (ل ٤٠٤). لە (تعلیق) (ل: ١٢٩)دا هاتووە لەسەر وشەی (یلدرم): میر (بدرالدین دلدرم) سەرکردەکی

بۆیە (ڕیچارد) سوربوو لەسەر ئەوەی کە سوپاکەی لە (بیت نوبة)دا ڕابگریۆ نەڕواتە ناو شارەوە، کاتێ دو دڵی بەتەواوی ئاشکرا دەرخست ویستی سوپا بەوە سەرقاڵ بکات لە گەڕانەوە کە هەندێ تیپی سوپای ڕەوانەی میان (میسر)و (شام) کرد بۆ ئەوەی ڕێبگری، ئەمەش بۆ ئەو ئاسان بوو بێئەوەی بەزویی هێرشی خۆی بۆ (بیت المقدس) دەست پێبکات (سەلاحەددین) لە ناردنی سوپا بە شوێن ئەو بۆسەچییانەدا دوا نەکەوتو زۆرێ لە میرەکانی بۆ لابردنی مەترسییەکە ڕەوانەکرد.

ئەگەر (ڕیچارد) لە پەلاماردانی کاروانەکی گەورەدا سەرکەوتبێو (٥٠٠) پاڵەوانی لەناودا یەخسیر کردبن، لە شەڕەکەیدا سوپایەکی زۆری بە کوشت چو، جگە لە کەلوپەلی قافڵەکە چی بۆ قەرەبوو نەبۆوە کە زۆرێکی سەرنج ڕاکێش بوو، بەڵام ئازوقە نرخی هەر چەندەك بێ، جێگای پاڵەوانان ناگرێتەوە لە هیچ شتێدا، چونکە دوای مردن پێی زیندو نابنەوە، بەڵام سوپا بە تفاقو جبەوە ئەگەر نەمان، دەتوانرێ بهێنرێنەوە.

(سەلاحەددین) سەری لەم هەواڵە سوڕما کە باسی لەو زیانانە دەکرد، بەڵام نەیتوانی (بیت المقدس) چۆڵ بکات، چونکە لە بەرامبەر گرتنەوەی قودسدا جارێکی تر لەلایەن فەڕەنگەکانەوە هەموو ڕووداوێ لەوە کەمترەو، لە بەرامبەر

---

تورکمانی بووە. وشەی (دلدرم) لە (یلدرم)ی تورکییەوە هاتوە واتە (تریشقە). لە (ل: ٣٧١)دا هاتووە: (لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا دەسەڵاتی جیهانی ئیسلامی لەبەردەستی غەیرە عەرەبەکاندا بووە، وەکو سلجوقی تورکمانیو ئەتابکەو زنگی تورکیو ئەییوبییە کوردەکانو مەمالیکەکانی دەریایی تورکو بورجییەتی چرکسو، هەر ئەوان بوون دژی خاچیەکانو تەتارو مەگۆلەکان جەنگاون). هەتا (فاتیمییەکان حسیابی غەیری عەرەبیان بۆ دەکرێت. بەڵام بە هۆی جەنگی خێڵەکیو بنەماڵەیی بەهێز نەماونەوە)! وە بە پێی (المنجد في الاعلام): {چرکس یان شرکس) گەلێ بوون ڕابردوو لە باکوری خۆرئاوای قفقاسو کەناری خۆرهەڵاتی دەریایی ڕەوشەوە دانیشتونو زۆربەیان بۆ تورکیاو سوریاو ئەردەن چوون). وە (سەلجوقەکان) بەپێی (المنجد فی الاعلام) تورکمانین. لێرەدا (تورکمانی) هۆزەکی تورکین کە تەتەر داگیر یان دەکاتو هەر لە سەدەی (١٢) بە تورکمان ناسراون. هەرچی (تورکە) لە سەدەی (١١)دا لە تورکستانو ئەنادۆڵدا نیشتەجێ بوونو غەزنەوییەکانیان شکاندووە، کە تورك بوون}. بەڵام ئەییوبییەکان هەزەبانین لە (دوین)ی ئێراندا ژیاون خێڵێکی کوردی بوون لە ئازەربێجاندا. وەکو ڕابردوو باسمانکرد (مێژوی کوردو کوردستان) شکر الله بابان. (وەرگێڕ)

دودڵیو دڕدۆنگی (ڕیچارد) بۆ چونە ناو قودس ناکۆکی کەوتە ناو سوپای خۆیو سوپای تری، کە لێرەو لەوێ کەوتبوونە گەڵییەوە، بینیان کە ئەم کارە گاڵتە بازاڕییەو ئەم کارە بەدڵ ناکرێت.

بەڵام (ڕیچارد) لە چارەنووسەکە ترساو بە نائومێدییەوە دەستی بە کشانەوە کرد لە چوونە ناو شارەکەدا. ئەمەش مژدەی هیوا بوو بۆ مسوڵمانان، تا (سەلاحەددین) بە بیستنی ئەم هەواڵە فەرمانی بە کردنی نوێژی سوپاسگوزاریی کردو مسوڵمانانیش بە دڵخۆشیو کامەرانییەوە ئەنجامیاندا.

لێرەدا درێژە بەو ئاگربەستە نادەین کە لەمیانەی هەردوولادا سازکراوە بۆ گەیشتن بە دوا ڕێگە چارە، ئەوەندە کیفایەتە کە بڵێین (ڕیچارد) وازی لە داخوازی خۆی هێنا کە حوکمی قودس بوو قایل بوو کە بڕیار بدرێ فەرەنگەکان مافی خۆیانە پارێزگاری لە شوێنە پیرۆزەکان بکەنو لەگەڵ دابین کردنی ئازادی حەجو سەردان بۆ ئەوانەی کە لە خۆر ئاواوە دێن،و ئەم ئازادییەش بەر لە هەڵمەتی یەکەمجار بڕیاری لەسەر درابوو.

تەنیا ئەمە بۆ جەخت لەسەر کردنەوەی ڕابردو بوو، (ڕیچارد) ئەو مەرجەی دانا، کە (عەسقەلان) لەژێر دەسەڵاتی (فەرەنگەکان)دا بێت، بەڵام سوڵتان قایل نەبوو، ئەم مەسەلەیە ئاستەنگەکی دڕکاوی بوو لە ئاگربەستەکەدا، ئەوکاتە لەبەر جەنگی خاچ پەرستاندا بوو، ئەنجا سوڵتان ڕوی لە (یافا) کردو جەنگێکی گەرمی تێدا قەوماو بەپێی نەخشەیەکی کێشراو دوای گەیشتنی کۆمەکی بە دوژمنان دەنگی نارەزایی جەنگ لەوانەی بێزاربوبون، کە لەبەردەم (سەلاحەددین)دا بەرز بۆوە مسوڵمانان کشانەوە، بەڵام ئەو ڕقی خۆی خواردەوەو خۆی ڕاگرت.

ئەنجا (ڕیچارد) نەخۆش کەوت لە (یافا)داو، سوڵتان ویستی مامەڵەکی جوانی لەگەڵدا بکات، ئەوە بوو نمایندەی خۆی نارد کە لە تەندروستییەکەی بپرسیو دەرمانو میوەو بەفری بۆ ببات.

ئەم ئاوڕدانە مرۆیی‌یە زەمینەی بۆ ڕێگای ڕێککەوتنەوەکە خۆشکردو ئاشتی کۆتایی بەسترا کە ئەوەی دیاری کرد دەبێ خاچییەکان دەسەڵاتییان بەسەر ناوچەی کەنارەکەدا هەبێ لە (صور)ەوە بۆ (یافا)، بەڵام (عەسقەلان) بۆ موسوڵمانان دەگەڕێتەوە، دیسانەوە شوێنە پیرۆزەکانیش بە دەست ئەوانەوە دەبێت، لەگەڵ زامنکردنی ئازادی سەردان کردنو حەج بۆ مەسیحییەکانو داوای باجو سەرانەیان لێ‌ناکرێ ئەم مەرجانە توانای بە (سەلاحەددین) بەخشی کە دەست بە (بیت المقدس)ەوە بگرێ وەدەست بەسەر (عەسقەلان)دا بگرێ کە ناوچەیەکی جوگرافی هەستیارە، بەڵام ڕەوشەکە لەمە زیاتر هەلی بۆ نەڕەخساند، وەك بڵێی ویستی لەم ئاگربەستە بڕیار لەسەردراوەدا ئاگری تورەیی نەیارانو بەرهەڵستکارانی سوپاکەی بکوژێنێتەوە.

هەروا بواری بۆ بسازێ بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو نەفەرو تفاقەی لە دەستی چووەو ڕۆیشتووە. ئەوەی ڕاستی بێ هەردوو لێ بەم ئاشتییە زۆر کامەرانو دڵشاد بوون، وەك بڵێی قسەی ئەم شاعیرە بڵێنەوە:

مالحرب الا ما علمتم و ذقتمو
وما هو عنهما بالحديث المرجّم

  

# کـوژانـــەوەی چـرایەکـــە

ئێستاکە کاتی ئەوە هاتووە لەمەڕ دوا کوژانەوەی چرا لە ژیـانی ئـەم پاڵەوانـە جوامێرە بدوێم، نازانم بۆ چی ئەوەندە هەست بە ئازاری جـەرگبڕ دەکـەم وەك بڵێـی بەڕاستی من بە چاوی خۆم ئەو دەبینم کە چراکە لە دواهەناسـەدایە، چـونکە خـۆم لەگەڵ ژیانی (سەلاحەددین)دا ڕۆیشتووم‌و وا دەزانم کە زیندووە لەبەردەم مندا خۆی نواندووە، ئەو هەڵوێستانەی دەبینم کە لەسەر کاغەز دەینووسم وەك بڵێی بە چاوی سەرم لە مەیدانی ژیاندا بەرچاوم دەکەوێ، من گشت ناچارکردنێ لـە ناچـارکردنی ئەو بەچاوی ئەندێشەم ئاسەواری، یان لەسەر دەم‌وچاوی ئەودا دەبیـنم، کاتـێ بـەم باسە گەیشتم بە خەیاڵم داهات کە من لە نزیکەوە کۆتایی ئـەم پاڵەوانـە دەبیـنم‌و هەست بەم پشکۆیە بە ئازارە دەکەم لە دڵمدا کە دادەگیرسێ وەکو داخ‌و ئۆفێك بـۆ ئەو تەمەنە پڕ لە دڕك‌و داڵەی لە بەرامبەر گەردەلوول‌و ڕەشەباکان بەسەری برد بۆ بەرگریکردن لە ئیسلام.

زۆرم هەوڵدا کە هەستی خۆم هێور بکەمەوە، بەڵام بێ‌سودبو، کاتێ ئەو دیمەنەم خوێندەوە کە قازی (بهاء الدین شداد) نووسی بووی لەمەڕ حاڵەتی خەڵکدا لەکاتی هاتنی هەواڵی شین‌و زاری ئەم پاڵەوانـە مەزنـەدا، تـا ئەوپـەڕی هەسـتم شـڵەژاو، هەستم دەکرد کە بەڕاستی مـن یـەکێکم لـەو کەسـانەی قـازی (ابـن شـداد) لـە بارەیانەوە دەڵـێ:[1]

(ئەمە ڕۆژێك بوو لەوکاتەوە ئیسلام‌و مسوڵمانان خولەفای ڕاشیدیان لەدەسـتدا کارەساتی ئاوایان توش نەهاتووەو، قەڵاو وڵات‌و دنیا هەمووی گرتـەوە، کەبـەس

١) (النوادر السلطانية/ ص ٢٥/ ط صبيح. (نووسەر)

خوا بۆ خۆی دەزانێ، بە خودا لە هەندێ کەسم دەبیست کە خوزگەی ئەوەیان دەخواست ئەوان فیدای ئەوببان، من بە خۆمو خەڵکی دەمزانی ئەگەر خۆبەخشین کرابایە خۆیان بە ئەو دەبەخشی).[1]

(ابن شداد) بەکورتی بەسەردا تێدەپەڕێ، چونکە ڕەوانبێژیو ڕازاندنەوە نازانێ، بەڵکو چی بینیوە ئەوە باس دەکات بێ زێدەڕەوی کردن، هەرکەس لە ئاگریەستی (سەلاحەددین) تێبگات لە (الرملة)دا دەزانێ، کە ئازاری دەرونی ئەو یارمەتیدەری نەخۆشیەکەی بووە بۆ سەر ژیانی، چونکە ئەم ئاشتی یە لە دیدەی ئەودا هەناسە دانێ بووە بۆمسوڵمانان لەم بەڵایە بەردەوامەدا، بۆیە (سەلاحەددین) پەسەندی کرد.

بەڵام لەلایەکی تریشەوە خەمو پەژارەیەك بوو بۆ ئەم پاڵەوانە، چونکە تەنیا بڕوای بە دەرکردنی یەکجاری دوژمنانی هەبوو لە وڵاتی مسوڵماناندا کە بە ناهەق هاتوون داگیریان کردووە، تەنیا بۆ ئەم مەبەستەش شمشێری هەڵگرتبو، کاتێ مەسەلەی ئاشتی هات بە مەرجەکانییەوە لەگەڵ ئەم مەبەستەدا تێکی نەدەکردەوە، پرسیار لەو ئازارو ژانە دەرونییەی لێ نەدەکرا کە ئەم پاڵەوانە لەناخیدا کپی کردبو، ئەنجا خۆشی نەیدەویست ئەم خەمە بۆ خەڵکی دەوروبەری هەڵڕێژێت، تا

---

١) ماوەی حوکمی لە میسردا (٢٤) ساڵ بوو لەوانە (١٩) ساڵ لە شام بوو، (١٧) کوڕو کچی بەجێهێشتو، دەوڵەتی ئەییوبی دوای ئەو لە (٥٦٩ ك – ٦٥٢ ك) دەوامی کرد، ئەنجا دەسەڵات کەوتە دەستی مەمالیکەکانەوە، بەسەرکردایەتی (مظفر قوتوز) لە (٦٥٧ ك)دا.

لێرەدا دەمەوێ وەسێتو ڕاسپاردەی (صلاح الدین) بنوسم کە بۆ کوڕەکەی (الظاهر)ی دەکاتو لەشوێنی خۆیدا دایدەنێ: {وەسێت پێ دەکەم بە تەقوای خوای گەورە، کەسەر چاوەی هەمرو چاکەیەکە، فەرمانت پێ دەکەم بەوەی خوا فەرمانی پێکردووە، ئەمە هۆی ڕزگاری تۆیە، ئاگادارت دەکەمەوە لە خوێن ڕێژی، نەکەی دەست بخەیە ناوی بیکەی بە پیشە، خوا ناخەوێ، وەسەیەتت پێ دەکەم دڵی خەڵکت ڕابگرەو، لە بارودۆخیان بنواڕە، تۆ ئەمینداری منیو ئەمینداری خوای لە زەویدا، وەسەیەت بێ دڵی میرو قەڕاڵو گەورە پیاوانی دەوڵەت ڕابگرە، من تەنیا بە مشور خۆری خەڵکی بەمە گەیشتومو کینە لە کەس دامەگرە، مردن کەس ناهێڵێتەوە، خۆت لەوە بپارێزە لە نێوان تۆو خەڵکدا، چونکە خوا بە ڕازیکردنی ئەوان نەبێ لێت خۆش نابێت، ئەوەی لە نێوان تۆو خوادا هەیە بە گەڕانەوەت بۆ لای ئەو لێت دەبورێ ئەو بەخشندەیە}.
(النوادر السلطانية / تحقيق احمد ايبش / ل: ٤٠٨ / ل ١٢ / ٢٠٠٥ / ديمشق). (وەرگێڕ)

ئەوانیش بەم خەفەتەوە گرفتار نەکات، ئەو دەچووە ڕاوو خواردنی دەبەخشیو، دیاری زۆری دەناردو، گوێی لە قسەی ئایینیو شیعری هەست بزوێن دەگرت، وەك بلێی دڵو دەرونی ئارامەوە کەیف خۆشە.

بەڵام قەت ئەمە خەفەتو پەژارەی ناو سینەی ئەم پاڵەوانە دڵ پڕ لە داخوازییە داگیرساوە نا کوژێنیێتەوە، قسەی قازی (ابن شداد) ئەمەی لێ دەفامرێتەوە، کە هاوڕێی سوڵتان بووەو جێگای ڕازو نهێنی ئەو بووە: (وەڵڵاهی ئەم ئاگربەستە هەڵبژاردەی ئەو نەبوو، ئەو لەمەڕ ئاشتیدا لە قسەکانیدا لەگەڵ مندا دواو ووتی: من نازانم چ شتێ لەمنەوە هەیە کە ئەم دوژمنەی پێ بەهێز بکاتو هێشتا ئەم وڵاتەیان بۆ ماوەتەوەو، جارێکی تریش بۆ گێڕانەوەی پاشماوەی تری وڵاتیان دەردەچنەوە)[1].

لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ کە ئەو لەم ئاگربەستە ترسی هەیە، نەوەك خەڵکەکە جارێکی تر دەست بە خراپەکاری بکەنەوە، بۆیە ئەو چاودێری دەکردو، باسی دەکرد.

دوای ئەوەی پەیمانەکە گرێدرا گیانی جوامێریو پیاوەتی دەسەڵاتی گرت بەسەریدا، ئەوە بوو خەڵکەکی زۆر لە (فەلە- مەسیحی)یەکان بۆ سەردانی (بەیتول مەقدس) هاتنو (ڕیچارد) لەوە ترسا کە (سەلاحەددین) وابزانێ ئەم زۆرییە بێسنورەی خەڵك ئاماژە بۆ ئایندەیەکی گوماناوی دەکات. بۆیە نامەیەکی بۆ (سەلاحەددین) ڕەوانە کرد، کە ئەو ڕێگای پێدەدات کە ئەو سەردانکەرانە مەنع بکات، مەگەر لەلایەن ئەوەوە نوسراوێکی تایبەتی هەڵنەگرتبێ، بەڵام ئەم پاڵەوانە بەوەفایە وەڵامی دایەوەو ووتی: ئەم حەجاجو گەشتیارانە دوای ماندو بوونەکی زۆر گەیشتوونە ئەم شوێنە پیرۆزە قەدەغەکردنیان بەڕەوا نازانم، بەڵکو ئەو هەڵسا زیاد لەوە خواردنی بۆ ناردنو چاکەی لەگەڵدا کردن.

---

١) (النوادر السلطانیة / ل: ٢٣٧). (نووسەر)

پاشان هەواڵی پێگەیی کە (ڕیچارد) بۆ (ئینگلترا) سەفەری کردووە، بۆیە ئەم تەقەلایە ئاشتییەی دەبینی ئۆقرەی پێدا، ئەوەبوو ڕوی لە(دیمەشق) کردو بە گوندو شارە مسوڵمانەکاندا گوزەری کرد، وەکو ڕزگاریخوازەکی سەرکەوتوو پێشەوازی لێدەکراو، قەڵاکانی (الساحلیة)ی بەسەرکردەوەو، کاری بۆ بەربەستانە دەکرد کە توشی خراپ بوونو، گوێی بۆ ڕای خەڵکی ئەوێ دەگرتو، بە کامەرانی گوێی بۆ داواکارییەکان دەگرتن کە گەیشتە (دیمەشق) زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکراو، چووە ناو خەڵکەوەو هۆگری پێدان گوێی لە خواستەکان گرت.

خۆشحاڵی ئەو بە بینینی ئەو پێشوازییە ئەوەی دەخواست کە بە دەوامی لە (دیمەشق)دا بمێنێتەوە، دوای ئەوەی سور بوو لەسەر ئەوەی کە بۆ (میسر) سەفەر بکات...... ئەگەرچی (سەلاحەددین) خەمو پەژارەی تایبەتی خۆی نەبووە، کاتێ لەگەڵ دەرچونیدا بۆ پێشوازی کردن لە حاجیانی گەراوە لە (مەککە)وە توشی نەخۆشیەکی کتوپڕ بوو، کاتێ بۆخۆی چوو پێشوازی لە هاتووەکان کردو، ڕایگەیاند کە ئەو بەپەرۆشەوەیە گەر نەیتوانیوە سەردانی ماڵی خودا بکات، نازانێ کە بە تێکۆشانو خەباتەکی هەرە گەورە هەڵساوەو، چونکە هەر وەختی وەرزی حەج کردن هاتبێ ئەو لە ڕووداوێکدا بەشداری کردووە، یان سەرکەوتنێکی بەدەست هێناوە.

ئەو پاڵەوانە دەگریاو فرمیسکی دەهاتن لە یادی چووبو کە هەموو کارو کردەوەیێ بە نیازو مەبەستەو، ئەو خەباتە گەورەیەی ئەو گێڕاویەتی لەسەروی هەموو خەباتەکەوەیە؟ بەڵام بلێسەی بڕوا وای لێکردووە، کە لە دروشمە ئیسلامیەکان بپرسێو بڵێ: ئەو نوێژو زەکاتو ڕۆژوی بەجێهێناوە، تەنها حەجی ماوە نەیکردووە! ئەو بە هەرز لە گەورە پیاوانی وەکو قازی (فاضل)و قازی (ابن شداد)ی بیستووە، کە ئەم کارەییە ئاسانە، بەڵام لۆژیکیی هزری بەتەنیا بڕوا بە ویژدان ناهێنێت.

درێژە بەو ئازارانە نادەم کە پاڵەوان لەبەر نەخۆشیەکەدا کێشای‌و (١٢) شەوی پێچوو، شەو بە شەو باری تەندروستی خراپتر دەبو، لە شەوی دواییدا زانی مردنی

نزیکە، بۆیە بانگی گەورە پیاوەکی کرد کە (قورئان) بدات بە گوێچکەیداو، هەتا گەیشتە ئایەتێ کە خودا دەفەرموێ: ﴿...وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾ (هود- ٨٨). واتە: (سەرکەوتنی من تەنیا بە خودایەو پشتم بەو بەستووەو، بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە).

دەموچاوی گەش بۆوەو زەردەخەنەی هاتێو، لە شەوی (٤) شەممەی (٢٨/ سەفەر/ ٥٨٩ ك)دا لە تەمەنی (٥٧) ساڵیدا گیانی بە بەدیهێنەری خۆی سپارد، هەر کە هەواڵی مردنی بیسترا، خەڵکی (دیمەشق) هەمووی بە گەورەیی هەژاند کە بەڕاستی زەوی هەژێنەکی گەردەلوولی بوو خەڵکی هەمووی لەماڵ کردە دەرەوەو بە هاوارو گریان دەهاتن، شا (ظافر)ی کوڕی بەخێرهاتنی خەڵکی دەکرد کە بۆ پرسەو سەرە خۆشی هاتبوون، بەڵام زمانی نەدەگەڕا، بەڵکو فرمێسکەکانی ئەوەیان دەگوت!

پرسەکەی لە (دیمەشق) ەوە بۆ خۆرهەڵاتو خۆرئاوا ڕۆیشت، هەرچی خەڵکی گەلی خۆی بوو خستنییە گریانەوە، بەڵام دوژمنانی خۆرئاوای نەیانتوانی کە سەرۆکانە لەکەداری بکەن کە لە پیاوەتیو جوامێریو شاسواری ئەو کەم بکاتەوە، بەڵکو هەبوو شاهیدیو گەواهی بەڕاستی دەداو، بۆ ئاستێ بەرزی دەکردەوە، کە کەس لەوانەی هەڵساون بە هێرشبردن پێی نەگەیشتووە، بەڵکو لە شوێنێکی دور لەو بوون.

  

# کەسێتی یەکی دەگمەن (ناوێژە)

سروشتی سوار چاکێتی ڕوخسارو سیمای تایبەتمەندی (سەلاحەددین)ی داگرتبوو کە مەبەستم پێ لە سوارچاکێتی ئیسلامییە کە هەموو واتاکانی لە ڕێزو جوامێری‌و پیاوەتی‌و ئازایەتی‌و دلێری‌و بەزەیی کۆکردبۆوە کە تەنیا لەناو ئەو گەورە پیاوو کەڵە مەردانەدا خۆیان دەنوێنن کە دەگمەنن‌و لەکاتی خوێندنەوەی پەڕاوەکانی مێژوی ئیسلامدا بەسیمایان دەیانناسین‌و بەم سیفەتانە بۆن‌و بەرامەی خۆش دەدەن، ئەوانەی مێژوی ئەم پاڵەوانەیان نووسیوەتەوە ئەم سیفەت‌و ڕەوشتە ناوێزانەیان نووسیوەتەوە کە بێدەنگ بوونیان لێ‌ناکرێ، هەر ئەمەش ناوبانگی هێشتۆتەوەو ئەوی بڵاوکردۆتەوە[1].

---

١) باشترین وەسف ئەوەیانە کە مێژو نوسی گەورەی کورد (ئەمین زەکی بەگ) کردویەتی لە (مشاهیر الکرد)او لە پەراوێزەکاندا ناوەناوە بەشێکمان لێ گواستۆتەوە. وە مامۆستا (صالح قەفتان) لە (مێژوی گەلی کورد)دا لەمەڕ کەسایەتی ئەم سەردانە جیهانیە دەڵێ: مەدح‌و ثەنای صلاح الدین تەواو نابێ بە کورتی یەکێکە لە پیاوە هەرە گەورەکانی مێژو.

لەکاتی شەڕدا لەگەڵ دوژمندا بێ ئامان بووە، بەڵام لەکاتی ئاشتیدا بۆ ڕەعیەت دڵسۆزو، بۆ داماو لێقەوماو بە مەرحەمەت بوو، وە لە سیاسەتدا دوربین‌و کار ئاشنا بووە. ناحەزی زۆر دارو پیاو خراپبووە، خزمەتگوزاری بە دڵوگیانی ئیسلامییەت بووە، بەڵکو لەتەك دوژمنیشا لە چاکەکردن دوانەکەوتووە، کاتێ کە قەراڵەکانی ئینگلیزو فەرەنسە بە دوژمنایەتی هاتبوونە سەری کە بیستی نەخۆشن دوختەرو دەرمانی بۆ ناردوون، لەلایەکی ترەوە پشتیوانی زانست‌و زانین‌و زانا بووە، لە ئیش‌وکاری دەوڵەتیدا بێ‌موشاوەرە کردن فەرمانی نەکردووە، ئەنجوومەنی زانستی‌و شوڕای ناو خۆیی‌و ئیدارەو کۆگای ڕاو تەدبیرو ڕەزم‌و جەنگی جیا جیابوونە. هیچ دەعیەی نەبووە، لەگەڵ فەقیرو هەژار بێ‌پەرواو زۆر بە سەربەستی ئەدوا. حەزی لە دارا نەدەکرد کە کۆچی دنیای کرد پارەو پول‌و زەوی‌و زاری بەجێ نەهێشت ....} (وەرگێڕ)

ئەگەر لە کۆنەکان کەسێ هەبێ باسی لەم سیماو ڕەوشتە جۆراوجۆرانە کردبێ لەناو ڕووداوەکانی ئەم پاڵەوانەدا، قازی فەقیھ (بهاء الدین بن شداد) لە (النوادر السلطانیة)دا ئەمەی کردووە بە دەسپێکی کتێبێکەیو فریای ئەو خوێنەرە دەکەوێ کە دەیەوێ لە چەند باسێکی پەیوەست بەیەکترەوە لەمەڕ ئەم پاڵەوانەدا بە مەبەست بگات، ئەم نووسەرە نەهاتووە بە شیکرنەوەی درێژ زۆری بکات، وەکو کەسانی تر کە ئەم جۆرە نووسینە بەکاردێنن، سروشتی نووسینی سەردەمی ئەو بەرەو ئاراستەی گێڕانەوەیەکدا چووە کە بە دوای یەکتردا بێت.

بەمەش خوێنەر چەند زانیارییەکی تیمارکەر بەدەست ێنێ کە ناوەرۆکەکی ناوازە باس بکاتو پێویستی بە فەلسەفەیێ نەبێ کە هەندێ تەم لە ئاسۆکانی ڕوانیندا بەجێ بێلێت.

بۆیە ئەوەی قازی (ابن شداد) نووسیویەتی دەیکەمە سەرچاوەی ئەم بەند (الفصل)ە، ئەم پیاوە فەقیهو فەرمودەزانو قورئان خوێنە، زیاتر مەبەستی ئەوە نەبووە مێژونووس بێ، بەڵکو زیاتر خەمی ئەوەبووە کە باس لە توانای نموونەیی یەکێ لەو پێشڕەوانە بکات کە پێشڕەوی چاكو چاکسازین، نووسەر کاتێ ئەم نووسراوەی نووسیوە کە (سەلاحەددین) ماڵئاوایی لە دنیا کردووەو، قازیش لەم پایە ئاینی یە گۆشەگیری کردووە، پشودانو هێوری هەڵبژاردووە.

کەواتە ئەو هیچ مەبەستەکی نیە تەنیا خستنەڕوی ڕاستییەکان نەبێ، کە خۆی بەسەریەوە وەستاوە، خۆشی نزیکترین هاوڕێی ئەو بووەو، یەکەمجار لە باڵوێزییەکی سیاسی نێوان سوڵتانو یەکێ لە شاکانی (موصلّ)دا پەیوەندی بە ئەوەوە کردووە، (بهاء الدین) لە دیمانەی سەرەتادا لەگەڵ (سەلاحەددین)دا بە توندی دەجولایەوە، ئەمەش بۆ چاودێری کاری ئەو کەسەی لەمەڕ ئەودا قسەی دەکرد، (سەلاحەددین) زۆر کەوتە بەردڵی، چونکە دڵسۆزیو ڕاستگۆییو ڕاسپاردەیی لەودا بەدی دەکرد، دیسان ئەم بالوێزە سەردانەکەش هەستی بە ڕەفتاری سوڵتان کرد کە بەدڵی بێتو

سەرنجی ڕابکێشێتو، دوای گەیاندنی نامەکە بڕیاریدا سەربازێکی بەنـــمەکی ئـەو بێت، لەبەرئەوەی دەیبینی کە سورە لەسەر گێڕانەوەی شکۆو سەربڵندی بۆ ئیسلام.

کەوای لێکردبوو ببێتە جێگـای سـەر بڵنـدیو متمانـە بـەخۆیی، پاشـان ئـەم دۆستایەتی یە سەری کێشا بۆئەوەی، کە (ابن شداد) قـازی دووەمو زانـای بـەرێزی سولتان بێو، باشترین جێگایانی لای ئەو هەبێ کە ئەم دوانـەش قـازی (فاضـل)و قازی (ابن شداد)ن[1].

قازی فەقیهو فەرمودەزان بەم قسەیە دەستی بەم کتێبە کـردووە کـە بـەو نـاوو نیشانە ناوی ناوە: (بەردەوامی ئەو لەسەر ڕێسا دینییەکانو، تێبینی ئەو بۆ کـارە شـەرعی یـەکان)، ئەمـەش بابەتێکـە پێویـستە بنکـەی بایـەخی قـازی فـەقیهو فەرموودەزان بێو باسیکردووە کە سەرکردەکە دیدەنی لەگەڵ هەموو ئەو فەرموودە فەقیهییانەدا دەکرد کە لە دانیشتنەکەیدا باسیان دەکراو بەڕای خۆی بەشداری تێدا دەکردو (قسەی جوانی دەکـرد، ئەگـەر بـە دەسـتەواژەی فەقیهـەکانیش نـەبوبێ، بەمەش ساغی بڕوای خۆی بەدەست دەهێنا لەدەست لێڵیو وێـچواندن)،[2] مانـای وایە کە سولتانو روحی گشتی شەرعیەت تێ دەگەیی، بێئـەوەی گـوێ بـەو زاراوە فیقهییانە بدات کە نووسەران بڕیاریان لەسەر داوە!

ئەی زیاتر لەوە چیمان لە سوڵتانی سیاسی دەوێ ، کە لە کێشەی جیاجیادا بـە گیـانی شـەریعەتەوە دیـدەنی بکـات[3] گـەورەترین زانـای لـەبارەی عـەقیـدە بـۆ کۆبوونەوەو هەرچی لەم دەروازەوە گوتراوە کۆی دەکردەوە، لەبـەر سـوربوونی زۆری

---

١) النوادر السلطانية / ل: ٥ / نووسەر .

٢) لێرەدا نووسەر قازی هەکاری لە یاد دەکات،کە پایەی لای سەلاحەددین لەو دوانە کەمتر نەبووە.(وەرگێڕ)

٣) بەڵام مامۆستا (صالح قەفتان) لە مێژوی گەلی کورد/چ ٣/٢٠٠٥/ ل: ١٧٦)دا دەنوسێ: {(صلاح الـدین) لە خزمەتی باوکیا گەورە بووە. تەمەنی هـەرزەکاری لـە بەعلەبـەكو لـە شـام بـە خوێنـدنو سـواریگەری ڕابواردووە باوکی مامۆستای تایبەتی لە زانایانی وەخت بۆ ڕاگرتـووە، قورئـان، صـەرف، نـەحوو، عیلمـی حدیث، مێژوو وێژەو ئینشای خوێندووەو، زانینی فەقێتێشی خوێندووە} (وەرگێڕ)

لەسەر منداڵەکانی خۆی، هەر بە بچوکی ڕادەهێناو فێری دەکردن تا لە هزریاندا بچەسپێت.

ئەوان لەبەر دەستی ئەودا دەرخیان دەکرد، ئەگەر ڕێرەوی سوننی ئەومان زانی لە (میسر)دا ئەمە شوێنەواری دەرخ کردنو فێر بوونی فیقهە.

ئەو ڕوخسەتی نەکردووە بە پیشە، لەگەڵ گرانی ئەرکی سەرشانیدا سوربووە لەسەر نوێژی بە کۆمەڵ کە نەخۆشی لەسەرگران بوو داوای ئیمامەکی تایبەتی کرد، تا ببێ بە پێش نوێژو، شەو نوێژەکانی دەکردن. لە نەخۆشی دواییشیدا هەر بەپاوە (نوێژ)ی دەکرد! بەڵام بۆ (زەکات) ئەوەندەی ماڵ بەجێنەهێشت زەکاتی لێبکەوێو، زەکاتی سوننەتیش هەموو ماڵەکەی گرتەوە، کاتێ مرد لە گەنجینەی دا زێڕو ئاڵتونو زیو (٤٧) دیرهەمو گرامێ زێڕ هەبوو.

نە ماڵ نە خانوو نە زەویو زار نە باخچەو باغ نە کێڵگەیێ لەدوایدا بەجێنەما، کەم هەبوو لە میرەکانی لەویان پتر هەبێت! بەڵام ڕۆژانی (ڕەمەزان) ناچار بوو لەبەر (دەرمان) خواردن بیشکێنێ، قازی (الفاضل) ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ کە ئەو ڕۆژانە لە دەفتەری تایبەتی خویدا یاداشت بکات، کە هەرکاتێ چاك بۆوە بیانگرێتەوە[١]، هەتا دکتۆرەکەی لە هەندێ ڕۆژانی نەخۆشیەکەیدا سەرزەنشتی دەکرد کە بە ڕۆژووەو، ئەو وەڵامی نەدەدایەوەو بە گوێی نەدەکرد.

زۆر خولیاو بە تاسەوە بوو بۆ (حەج)کردن، بەڵام بارودۆخی جەنگ ئەو یارمەتی ئەوەی نەدا کە دەیویست......خانەنشینانی جەنگ هەرچەندە حەج بکەن وەکو ئەوانە نین لە ڕێگای خوادا بەگیانو ماڵ خەبات دەکەن! لە نووسینی ئەم بایەخدانەدا بەم دروشمانە پەیوەندی نێوان ئەم پاڵەوانە لەگەڵ پەروەردگاریدا

---

١) لەمەڕ قازی (الفاضل)دا ئەم فەرموودەم دێتە یاد کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {اذا اراد الله بالامير خيراً جعل له وزير صدق: ان نسي ذكره، وان ذكر اعانه ....} رواه ابو داود/ حسن/ الجامع الصغير للسيوطي. واتە: ئەگەر خوا چاکەی بۆ میرێ بوێ وەزیرەکی ڕاستگۆی دەداتێ هەر کاتێ شتی لەیادچوو بیری بخاتەوە، کە یادی کەوتەوە یارمەتی بدات. (وەرگێڕ)

دەردەكەوێ، دەردەكەوێ ئارام گرتنى ئەو لەسەر گرفتەكان ئاسايى‌يە بۆ بڕواى ئەو، چونكە دەزانێ خودا ويستى خۆى هەيەو، دواى ناخۆشيەكان خۆشى دەهێنێت.

ئەگەر نووسەرانى ئيمڕۆ هەر مرۆڤەو كليلى كەسايەتى خۆى پێ بدەن، من وا دەبينم كە بڕوا كليلى كەسايەتى (سەلاحەددين) بووە، ئەوەى بە دەقەوەلـە قازى وەرى دەگرم لەشى كردنەوەدا ئەم ئاراستەيە دوپات دەكاتەوە، كاتێ (ابن شداد) وتوويەتى[١]:

ئەو -ڕەحمەتى خواى لێبێ- ملكەچ بوو لەدڵداو، دڵ نەرم بوو، زۆر چاو بە فرمێسك بوو كە گوێى لە قورئان بوو دڵى دەترساو خشوعى پەيدا دەكردو، زۆربەى كات دەگرياو، زۆر تامەزرۆى گوێگرتن بوو لە فەرموودەو، هەر كە دەيبيست گەورە پياوێ گێڕانەوەى زۆرى لايەو زۆرى شتى بيستووە، ئەگەر لەو كەسانە بايە كە دەهاتنە لاى ئەو دەچووە لاى‌و گوێى بۆ دەگرت‌و ئەوانەش كە لەگەڵيدا ئامادەبوون لە منداڵەكانى‌و مەماليكە تايبەتەكان گوێيان لێدەبوو، فەرمانى بە خەڵكى دەكرد، كە وەك ڕێزێ بۆ فەرموودەكە دابنيشن، ئەگەر گەورە پياوەكە لەو كەسانە بايە، كە لە دەرگاى ماڵى سوڵتانەكانى نەدەداو، لە كۆڕو دانيشتوانى ئەواندا ئامادە نەدەبوو، بۆ خۆى دەچووەلاى‌و گوێى بۆ دەگرت).

لە گەورەترين دياردەى ئيمانى ئەو ئەوەيە، كە (ابن شداد) بەدرێژى باسى دەكات‌و من ناچار دەبم كە كورتى بكەمەوە، كاتێ دەڵێ: (كاتێ سوڵتان لە بەيتولمەقدس بوو هەواڵى بۆ هات كە فەرەنگەكان هەموو قسەيان بووە بەيەك، كە پەلامارى قودس بدەن، كە سوپايەكى بێسەروبن‌و تفاقەكى بێشوماريان لەگەڵدايە، ئەو هەڵسا ميرەكانى كۆكردەوە، كە پەلامارەكەى تۆق بكەن‌و كۆسپ بخەنە بەردەمى، تا لە قودسدا بمێنێتەوەو بتوانێ نەخشەو پلانى بەرگرى دابڕێژێت، بەڵام گوێيان بە بۆچوونى سوڵتان نەدا، ڕواڵەتى دوبەرەكى لە وتوێژيانـدا

---

١) النوادر السلطانية / ل: ٧. (نوسەر)

دەردەكەوت، سوڵتانى دڵ پڕ لە كەساسىو دڵتەنگ ڕۆيشتو، ئەو شەوە لەبەر ئەندێشەو بيركردنەوە خەوى لێ زڕا.

ئەم شەوە (هەينى) بوو قازى (ابن شداد) چوو كە بينى فرمێسكى دێتە خوارەوە دڵخۆشى دايەوەو ووتى: گەورەم پێشنيار بكە تۆ نوێژى هەينى لە مزگەوتى (ئەقصا)دا بكەيتو، دوو ڕكەعەت لە نێوان بانگو قامەتدا بكەيتو، لە كوڕنوشدا لە خوا داوا دەكەيت كە ڕێگاى ڕاستت پيشان بداتو، زەمينە بۆ هۆيەكانى سەركەوتنت خۆش بكات.

سوڵتان وەڵامى پێشنيارى (قازى) داوەو (ابن شداد)يش لەتەك ئەودا بۆ نوێژ وەستاو، گوێى لە گريانى ئەو بوو لە پاڕانەوەيداو، هەردووكيان لە خوا دەپاڕانەوە كە خودا (بيت المقدس) لە دەستى شەڕ پەنا بدات...... نوێژكەران دەرچوونو، دڵى سوڵتان ئارام بۆوە. بۆ سبەينێ مژدە هات كە فەڕەنگەكان لە ڕاكاندا نەگەيشتوونە يەك، گروپێ لەوانە ناڕازى بووە هێرش بكرێتە سەر (قودس) كە (سەلاحەددين) لەوێدا جێگير بووەو بەرگرى لێدەكات، زۆر لەوانە چوونە لايەكى تر، (سەلاحەددين) دڵى خۆش بوو زانى نزاكەى گيرابووە.

ئەمە بەشێكە لەوەى (ابن شداد) باسيكردووە لەمەڕ كارتێكردنى بڕواى ئيسلاميدا لە ڕەفتارى شا (ناصر)دا، بەڵام ڕواڵەتى دادگەرييەكەى لە گۆڕەپانى (دادگايى) ئەودا دەردەكەوێ كە هەموو (٢) شەممەو (٥) شەممان كۆڕێك دەبەسترا كە فەقيهو زاناكانو ئەوانەى دەيوستن لە ڕەعيەى خۆى ئامادەى دەبوون، هەركەس سكاڵاى هەبا بێ بەربەست دەيتوانى بەپەلە بڕواتە لاى، پاشان بە دڵ گوێى بۆ ڕا دەگرىو، ڕو لە ميرزا (نووسەر)ى دەكرد كە ئەو حوكمەى دەيبينێ لە پەڕەيەكدا تۆمارى بكات كە جێبەجێكردنى بە پەلە مسۆگەر دەكات.

لەم گۆڕانەدا كێشەى گرنگ هەبوون كە پەيوەندييان بە خێزانى سوڵتانو خزمانىو زۆر لە ميرەكانييەوە هەبوو، بەڵام ئەو حەقى لە شوێنى خۆيدا دادەنا، هەتا هەندێ كەس لەمەڕ ميراتى كۆيلەيى كەوتنە شكايەت لەگەڵ سوڵتانداو،

داواکار (المدعی) داوای دەکرد کە پێش هاتنی ئەو کۆیلـە بـۆ لای (سـەلاحەددین) ئەو ئاغای ئەوبووو، شاهیدەکان بە غەیری ئەوەی داواکارە کە گوتی: شاهیدییاندا کە ئاکامەکەی جێگای ڕازی بوون بـۆ ئـەو نـەبوو، بـەڵام سـوڵتان دوای بڕیارەکـە بانگی کردو لە ماڵی تایبەتی خۆی پێداو، پێی ووت: ئەمە ماڵی خۆمـە بـە تـۆی دەبەخشم، مادام کە حەق لە کێشەکەدا لەگەڵ تۆدا نیە.

داواکارەکە گەڕایەوە خەریك نەبوو بڕوا بکات! بەڵام بەسـەرهاتی بەخـشندەیی‌و گوشادی بۆ شاسوارەکی جوامێری وەکـو ئـەو سـەیرو نامۆنییـە کـە لـە حاڵـەتی تەنگانەداو لە حاڵەتی هەبوونی‌و دەوڵەمەندیدا دەسـتی بەخـشندەیی دیـار بێـت، بەڵکو خەزنە دارو گەنجینە دارەکانی ئەو ماڵەی دەمایەوە دەیانـشاردەوە، چـونکە ئەگەر بەو ماڵەی زانیبایە نەیدەهێشتەوەو، هـەتا هەنـدێ لـە تایبـەتکارانی ئـەو ڕەخنەی ئەو، دەست بڵاوییەی لێدەگرن لە بەخشینداو، ئەویش ووتـی: ئـەو مـاڵ‌و سامانەی لە خواردن‌و پۆشاك زیادە، ئەی بۆچی هەڵیبگرم! زۆر نامەی بـۆ دەهـات بۆ داواکردنی بەخشین‌و، قازی (ابن شداد) دەیخوێنـدەوە، ئـەویش بەپەلـە وەڵامـی دەدایەوە، تا قازی دەڵێ: من شەرمم دەکرد لەو هەموو نامانە کە دەمدایە دەستی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سەخاوەتی‌وناندەری بە دڵفراوانی دەنواند.

بەسەرهاتەکانی ئازایـەتی ئـەو، کـە لـە پـەڕەکانی ئـەم کتێبـەدا باسـیان لـە پاڵەوانێتی ئەو کرد هەواڵی ئازایەتییەکی لە ئاسایی بەدەری ئەو رادەگەیەنن، بەڵام پاڵەوانێتـی بڕوادارێك کە بـڕوای وایـە لـە هـەموو هـەنگاوێکی لـە جەنگـەکانی خەباتدا خودای لەگەڵدایە. (ابن شداد) دەڵێ: (ئەو ڕەحمـەتی خـوای لـێبێ کاتـێ جەنگەکە گەرم دەبێ لە نێوان هەردوو ڕیزدا دەخولاوەو، لەشکری لـە ڕاسـتەوە بـۆ چەپ دەبڕی‌و، سەربازەکانی ڕێـك دەخـست‌و فـەرمانی دەدانـێ بـە پێـشکەوتن‌و وەستان لەو شوێنانەدا کە خۆی دەیبینی‌و لە ڕۆخی دوژمن نزیك دەکەوتـەوە هـەتا نزیکی ئەو دەبۆوە، بەڕاستی دوو بەش وتەی لە نێوان هەردوو ڕیزەکەیـدا بەسـەردا خوێنرایەوە، منیش پێم ووت لە هەموو دەوروبـەردا قـسەکە بیـستراوەوو باسـیش

نەکراوە کە لەنێوان هەردوو ڕیزەکەدا قسەکە بیسترابن، ئەگەر گەورەم بە پەسەندی بزانێ ئەوە بگێڕێتەوە ، بە شتێ لەو ئامادەکراو کارێکی باشە، هەرچی گوێڕایەڵی ئەو بوو بۆی خوێندنەوەو، ئێمەش لە نێوان هەردوو ڕیزدا لەسەر پشتی وڵاخ بووین، جارێ دەڕۆیشتینو جارێ دەوەستاین)[١] بەم بڕوا قایمە ئەم پاڵەوانە لە بەڵاو تەنگانەدا زۆر سەقامگیربووەو قەت دوژمنی بە زۆر نەزانیوە ئەگەر بەقەد زیخو چەویش بووبن، هەر سەرەتا تێشکانی دەخستە دوژمنەوەو، ئەو پاچەسپاو بوو، سەیری شوێنێکی دەکرت کە بێترس بێو خۆی سوپاکەی پەنای ببەنێو داڵدەیان بدات، لە خەبات وچانی نەدەدا، تا دۆڕانی نەگۆڕییبایە بە سەرکەوتن، وەکو بۆ نموونە لە (عەککا)دا کاتێ نیشانەی دۆڕانو سەرنەکەوتن پەیدا بوو لە سەرەتادا، پاشان خودا سەرکەوتنی هێناو (٧٠٠٠) کەسی لە دوژمن کوشت لە سوارو لە پیادە[٢]. بەڵام خۆشەویستی ئەو بۆ خەباتو تێکۆشان، لە ڕیزی پێشەوەی ئاواتەکانییەوە بووە کە پیاو لە کۆڕی ئەو نزیك دەکەوتەوە باسی لە خەباتکردن بۆ خوداو، پاداشتی نەبڕاوەی ئەمە دەکرد.

جەنابی قازی کتێبێکی لەبارەی یاساکانی تێکۆشان بۆ کۆکردبۆوە کە ئایەتو فەرموودەو ڕووداوەکانی سەحابیەکانی تێدا هەبوو، سوڵتان زۆر دەیخوێندنەوە، ئەنجا بە شا (الافضل)ی کوڕی بەخشین، هەتا ڕێنوێن ئەویش بگرێتەوە.

ڕۆژێ لە (قودس) نوێژی (جەژنی) کردو، خوا دڵی کردەوە کە بۆ (عەسقەلان) بڕواتو وڵاتەکانی کەنار (الساحلیە) بەسەربکاتەوە تا دڵنیابێ لێیانو پاشان

---

١) مسوڵمانان لە ڕۆژی (المصاف) لە مێرگی ((عەککا)دا بە پیسی شکان و، ئاڵای سوڵتان دەکەوێ کە زەرد بووەو لە ناوەڕاستیدا داڵەکی سور دروستکرابوو، سوپاکەی هەموو ڕادەکەنو مل دەدەنە چیا ئەو ڕاناکاتو لە شوێنی خۆی هەڵناکەنێو، بە تیپەکی کەمەوە شەڕدەکات، بۆ خۆی ڕوله چیا دەکاتو خەڵکی بانگ دەکاتەوەو ناچاریان دەکات بە گەڕانەوە، بەردەوام ئەمە حاڵی ئەو دەبێ تا سەردەکەوێو، لەوانە (٧٠٠٠) سوارو پیادە دەکوژرێن. (نوادر السلطانیة)و پەراوێزەکەی کە (احمد ایبش) نوسیویەتی (ل ٧٤). وە (ابن شداد) وەسفی دەکات کە (قەت دوژمنی بە زۆر نەدەزانیو، قەت کاری ئەوانی بە گەورە دانەدەناو، لەگەڵ ئەوەشدا لە بیرکرنەوەو تەگبیر دابوو .....} (ل: ٧٤). لەبارەی سەخاوەتی ئەو دەڵێ: {هەر لە عەککا دا ١٠ هەزار ئەسپی بەخشی)}. (وەرگێڕ)

بگەڕێتەوە، ڕاوێژکارەکانی ترسان کە (فەرەنگ) هێرش بکەنە سەری، چونکە ژمارەیان کەم بوو، ئاماژەیان بۆ کرد کە شێنەیی بکات، بەڵام سوربوو ئەنجامیداو، لەگەڵ (ابن شداد) لەسەر کەناری دەریا وەستاو، هیوای پیرۆزی بۆ مەبەستی دورتر لە جەنگی خاچپیەکانی برد لە شامدا، ئەوەبوو بە (ابن شداد)ی ووت: (لە دڵی خۆمەوە شتەکت بۆ باس دەکەم، هەرکاتێ خوا ئاسانی کرد کە پاشماوەی کەنارەکەم ڕزگارکردو، وڵاتم بەش کردو وەسیەتم دانا، بەم دەریایەدا دەڕۆیشتم تا دەگەیشتمە دورگەکانیو، شوێنیان دەکەوتم، هەتا ئەوکاتەی کەس لە زەوی نەدەما بڕوای بە خودا نەبێ، یان دەمردم).

(ابن شداد) دەڵێ (ئەم قسەیەم لا زۆر مەزن بوو). لە نێوان ئەوو سوڵتاندا ئاخاوتنەکی جوان لەمەڕ ئەم واتایە پیرۆزەدا ڕوویدا کە بواری گێڕانەوەی نیە.

بەڵام ئۆ ئەو ئارامو خۆڕاگرییە جوانەی هەیبووە لە کارەساتو تەنگانەکاندا، ئەو گێڕانەوەیە چەندە جوانە کە (ابن شداد) لەو بوارەدا نووسیویەتی، کە ئەوە لە ڕەسەنایەتەکی ڕەوشتی دەگمەنەوە دەردەکەوێو ناشێ لە جوامێرو لە پیاوەکی لە ئاسایی بەدەردا نەبێ ببینین کە سوڵتان نەخۆش دەکەوێ برینێکی درێژخایەن لە لەشیدا پەیدادەبێ، ئەو دومەڵو ئاوساویانە لەناوقەدیەوە بوون بۆ ئەژنۆی دەپەڕنەوە کە وای لێدەکەن توانای دانیشتنی نەبێ بۆ قسەکردن لەگەڵ سەردانەکەرو میوانەکانیدا لەسەر کەلەکە قسەی دەکردن، بێئەوەی لەبەر ئازاری برین بڵێ ئاه[1].

---

١) ڕابردوو باسکرا کە سوڵتان توشی نەخۆشی زەردەتا (الحمی الصفراء) (Yellow Fever) دەبێ کە نەخۆشیەکی کوشندەیە مرۆڤ توشی دەبێو، لە هەندێ هەرێمی ئەمریکا زۆرە هەم لە ئەفریقاداو، ڤایرۆسێ توشی دەکات کە مێشولەی ئایدس: (Edes) هەڵی دەگرێت.

یان هیما گوکوس لە ئەمریکا داوو ماوەی هەڵهێنانی (الحاضنة)— ٢ — ١٠ — ڕۆژەو بە (٣) قۆناغدا گوزەر دەکاتو قۆناغی سێیەم ڕشانەوەی ڕەشو خوێن لەگەڵ پیسایی و، زەردویی‌و پەڵەی خوێناوی لەگەڵدا لەسەر لەشدا یان پوکو لێوو زمانو میزڵدانو چاو وزێ خوێنیان بەردەبێ و، دەبێتە هۆی کوێریو ژەهراوی بوونی گشتیو مردن. (الاحیاء الجهریة الطبیة / د: مهدی سماك/ ل ١٩٩ — ٢٠٠) کورتکرنەوەی وە تا ئیمرۆ چارەسەری نیە (چونکە ڤایرۆسی یە) بۆیە تەنیا پشت بە خۆپاراستنو قەڵاچۆکردنی ئەو مێروانەی دەیگوازنەوەو کوتان دەبەسترێت. هەمان سەرچاوە / ل: ٢٠٠ (وەرگێڕ)

ئەو لە خواردنو خواردنەوە کەوتبوو، چونکە لەکاتی نان خواردندا پێویستی بە دانیشتن بوو، ئەمەش ئەشکەنجەی دەدا، بۆیە کاتێ خواردنی بۆ دەهات فەرمانی دەکرد بدرێ بەو دەرۆزەکەرو هەژارانەی لەبەر دەرگادا وەستاون.

وەکو (ابن شداد) باسی دەکات لەم گرفتو تەنگانەیەدا هەواڵی زانی کە جەنگ لە نێوان میرەکی ئەوو میرەکی خاچییەکان ڕوویداوەو، زاڵ بوونیش لەلای دوژمنەوە دەردەکەوێ، فەرمانی بەوانە کرد کە هەڵیاندەگرت بیبەن، ئەوە بوو دەستیکرد بە ڕێك خستنی سوپا لە ڕاستو چەپداو لەگەڵ ئازارو ژانەکانو تەوژمی ئازارەکانی دومەڵاندا ئارام گرتبوو، لە جەنگەکانی تردا لەگەڵ ئەستەمی نەخۆشیەکەیدا زانییەوە کە فەڕەنگەکان ڕویان لە (التل) کردووە، تا بیرەکان بڕوخێنن، لە خێوەتەوە سوار بوو، تا بە هەڵوێستەکە ڕابگاتو لەشکر ڕێك بخاتەوەو شا (عادل)ی براکەی لەلای ڕاستەوەبێو شا (ظاهر)ی کوڕی لەلای چەپەوە بێت، شا (الافضل) لە جەرگەوە بێ، دەستیکرد بە جەنگو دوژمن چووە ئەو سەری ڕووبارەکە، سوڵتان بە سوپاوە شوێنیان کەوتو، خۆر گەرمو سوتێنەر بوو خۆی بە دەسرۆکەیەك لەبەر گەرمایی بەستبوو، بە درێژایی ڕۆژ ئاوەها مایەوە، تا شەو بە سەرداهاتو پەلامارەکە دواکەوت.

پزیشکی ئەو بە درێژایی شەو دەرمانی دەکردو سەرقاڵی ئەوبوو، داوای لێدەکرد کە لە چادرەکەیدا بمێنێتەوە بۆ بەرگرتنو خۆپاراستن لە تەشەنەکردنی برینەکانی، کاتێ گوێی لەدەنگی کەڕەنا (شەیپور- بووق) بوو هەڵسا کە خۆی پێشڕەوی جەنگەکەبێو کوڕو براکانی خۆی کردە پێشەنگ لە جیاتی خۆیدا، چونکە توانای پێشکەوتنی نەبووە، لەبەرئەوەی ئەگەر دوژمن ببینێ نەخۆشە زیاتر هانی دەدات، بۆیە فەرمانی کرد کە ئاڵاو بەیداخی زۆر بچەقێنن، تا دوژمن ڕوبەرەکەی بە چڕوپڕی ببینێو لەترسان بڕوات، ئەمەش هاتەدیو بە سەرکەوتنێکی شکۆدار

کۆتایی پێهات.[١] لە جەنگو پێکدادانەدا هەواڵی مردنی ڕۆڵەیەکی خۆی بۆ

---

١) پرسیار کرا بارودۆخی کورد چۆن بووە لەسەردەمی سوڵتاندا؟ منیش دوای گەڕان بە چەند سەرچاوەیەکدا بینیم کە باری کورد لەم سەردەمەدا لە ڕوی سیاسیەوە بەم شێوەیە بووە:

١- وەکو لە (مشاهیر الکرد/ امین زکی بگ/ ل ٢٤)دا هاتووە: {میسرو شامو کوردستان تا تونسو سودانو یەمەنو تا عەدەن} لە ژێر کۆنترۆڵی ئەودا بووە.

٢- هەولێرو شارەزور لە ژێر میرنشینی سوڵتان (مظفر الدین)دا بووە کە زاوای (صلاح الدین) بووە.

٣-بەپێی (امارە بهدینان / صدیق الدملوجی) لە دورگەی (ابن عمر)دا حکومەتی ئازیزانی کوردی پەیدا بووە کە تا (١٨٦٤) ز دەوامی کردووەو لەسەر دەمی دەسەڵاتی ئەییوبی دا دانیان بە حوکمی ئەواندا هێناوەو، لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا ژیاون.

٤-وە بە پێی (ابن خلکان ج١ / ل ٥٨) شا عادلی ئەییوبی لە میری ئامێدی تۆرە دەبێ بە ناوی (احمد المکنی)و لە دەسەڵات دەری دەکات، بەو پێیە ئامێد یش لەژێر کۆنترۆڵی ئەییوبیەکاندا بووە.

٥- لە (دائرە المعارف الاسلامیة / ت: حمید ریبوار / ل: ٥٥)دا هاتووە: بە پێی ڕێکەوتنی (١١٨٧)دا کە پەیمانێ بوو لە نێوان عزالدین زنکیو صلاح الدیندا بەسترا (صلاح الدین) ناوچەی ئالبو شارەزوری لە ناو دەوڵەتی خۆیدا دانا. لە ساڵی (١١٨٩)دا شارەزوری دایە دەست خزمەتکارەکەی (کشتوگدی) کە لە خزمەکانی یەعقوب قەیقجاب بووە، تاکە ڕێگای ئەییوبییەکان بۆ دەسەڵات گرتن بەسەر کوردستاندا لە ڕێگای خەیلەکان بوو، سەرەتا ئەم ناوچەیە لەبەردەستی (تقی الدین)دا بووە (ساڵی ١١٩١) (هەروەها بەپێی ئەم نوسراوە لە دیاربەکردا (ئەرتۆقیدیوکان)و لە (موصل)دا زنکییەکانو بەکتاکیندیەکان کە پێشتر نوێنەرایەتی زنکییەکانیان دەکرد لە هەولێردا ئەو حوکمی تایبەتی خۆی هەبووە بەسەریانەوە).

بەڵام دوای مردنی سوڵتان (شا نجم الدینی ئەییوبی) توانی بگاتە میرنیشنی (المؤتمر) لە ساڵی (١٢٠٧)و دوای ئەو سڵتەی (خەیلەکان) بە (ئەشرەف)ی برای شپێراو، خۆی بەشانی ئەرمەن ناوبرد پاشان دەسەڵات گەوتە بەردەستی برای سێیەمی (مظفر) تا (١٢٤٤)، لەو سەردەمەدا بارودۆخو ئاسایشی ناوچەکەدا چەندجارێ شێوا، ئەمەش بەهۆی پەلامارەکانی جۆرجییەکانو خوارزم شاهیەنو مەگۆل بوو. جۆرجییەکان لەوکاتەدا چالاکی خۆیان دژ بە خەیلاتەکان دەست پێکرد کە دوو میری ئەرمەنی (زاکارە)و (ئیوان)ە سەرکردایەتییان دەکردن. زانایانی ڕەگەزناسی مرۆڤایەتی ئەم دوو میرە لە پاشماوەی هۆزی بەدرخان دادەنێن کە لقێکی هۆزی (بابیرخان)ی کوردین. زۆرینەی سوپای ئەییوبی تورک بوونو ژمارەکی زۆریشی کورد بووە. لە ساڵی (١١٨٧) سوڵتان صلاح الدین داوای لە کوردی باکوری ڕوباری دیجلە کرد بۆ خەباتو، خەڵکی جەزیرە پەرتەیان لێکرد بەتایبەتی لە (١١٨٨)دا، بەڵام هێزی دیاربەکرو زۆر لە خێڵە کوردییەکان بە زۆری شانبەشانی صلاح الدین دەجەنگان.

لە سەرکردە کوردەکاندا (سیف الدین مشطوب) لە هەمووان دڵسۆزتر بووە، وەکو لە هەڵوێستەکەیدا بە (سوڵتان) دەڵێ: (گەورەمان ئێمە خزمەتکاری تۆین تۆ بەهرەو گەورەییەت پێداینو دەوڵەمەندت کردین، لە گەردەن زیاتر ئیمانەوە ئەوە لەبەردەستت دایە، سوێند بەخوا کەسمان ناگەڕێینەوە لە سەرکەوتنی تۆ هەتا دەمرین). (النوادر السلطانیة /ل ٣٧١).

هاتو، نامەكەی پێچاوە بێئەوەی هیچ خەمو پەرێشانییەك پیشان بدات، تا لە ورەو چوستی سوپای كەم نەكاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا فرمێسك بەچاویدا دەهاتنە خوارەوەو، ناتوانێ پێش بە فرمێسك بگرێت. دیسانەوە لەكاتی گەیشتنی هەواڵی مردنی (تقی الدين)ی برازاكەشیدا كە یەكێ بوو لە پاڵەوانەكان بە هەمان كار بڵندبوو، نامەكەی بەخەفەتەوە پێچایەوە تا جەنگەكە بڕایەوە، ئەنجا دەریهێنانەوە زۆر بەتوندی دەگریاو خەڵكی دەوریشی لەگەڵ ئەودا دەستیان كردە گریان، (ابن شداد) ووتی: (خەڵكینە داوای لێخۆشبوون لە خوا بكەن، ئەم ڕەوشە مانای نیە.

سوڵتان ووتی: بەڵێ، بەڵێ، داوای لێخۆشبوون لە خوا دەكەینو بێدەنگ بوو!

بەڵام لە ڕوی سنگ فراوانیو زۆری هێمنیو لەسەر خۆیی یەوە فەرەنگەكان خۆیان وەسفی دەكەنو زیاتر لەوە باس ناكرێت، كاتێ بە ناو خەڵكیدا دەڕۆیشت، خەڵكی لەدەوریدا قەرەباڵغیو چڕ ژانیان پەیدا دەكرد لەدواوە سەرشان (عەبا)كەیان ڕادەكێشا كە نەیدەتوانی بڕواتو، ئەویش دەوەستا.

وەیەكێ لە كارە ناوازەكانی ئەو لەگەڵ (ابن شداد)دا ئەوەیانە كە: ڕۆژێ لە ڕەشەبایەكی ساردو سڕدا لەگەڵ (ابن شداد)دا سواری وڵاخ دەبێو، ئێستری قازی پێش ئەو دەكەوێتەوە هەندێ قوڕاو بە قاچەكانی دەپڕژێنی بە لەشی (سەلاحەددین) دەكەوێو جلەكانی پیس دەكات، بەڵام ئەو پێدەكەنێو، قازیش دەیەوێ كە دوابكەوێ تا ئەم بارە دوبارە نەبێتەوە، فەرمانی پێدەكات لە شوێنی خۆیدا بەردەوام بێت.

---

ئەنجا ئەبو هەیجاءو ئەنجا سوڵتان مظفرالدين وەكو ڕابردوو باسكرا. یەكێ لە ڕۆڵە گرنگەكانی مێژوی (صلاح الدين) بۆ كورد لەم نامەیەدا دەردەكەوێ كە لە قودسەوە بە (صلاح الدين) دەگاتو (نوادر السلطانية / ل ٣٧١) تۆماری كردووە كە چیاكان هەڵی ناگرن: {انك ان اردتنا فتكون معنا او بعض اهلك، حتى نجتمع عنده، والا فالاكراد لايدينون للأتراك والاتراك لايدينون للاكراد). ئەمەش قورسایی سیاسیو سەربازی كورد دەردەخات لەناو ئەو سەردەمەداو، فراوانی ئازادی لەم دەوڵەتەدا. (وەرگێڕ)

بەڵام هەڵەشەیی هەندێ لە ستەمکاران، ئەو بە هەموو هێوری و ئەگەرێ ڕوی تێکرد، یەکێ لەو نموونانە کە گێڕانەوەی درێژەی دەوەێ ئەوەیانە کە کوردێ چۆن لەگەڵ کەسێکدا بەوپەڕی توندی قسە دەکات، ئاوا لەگەڵ سوڵتاندا قسە دەکات، بەڵام سوڵتان ڕقی دەخواتەوەو دەڕواتەوە چادرو دەواری خۆی و، (ظاهر)ی کوڕی وایزانی فەرمانەکانی ترسناك دەردەکات لەمەڕ ئەوداو ترسا کە دوای بیستنی ئەم قسە نابەجێیە لەم برادەرە کوردە وەڵامی بداتەوە، بەڵام سوڵتان چاوپوچشی لەو هەڵە شەیە دەکات و، میوە بۆ میوانەکانی دێنێ و دەڵێ: بخۆن تا ئەوەی ڕابرد لە یادی بکەین!

فەرەنەگەکان بە چاوپۆشی و لێبوردەیی ئەویان دەزانی لەگەڵ دوژمنانیاندا، کاتێ یەکێکیان دەکەوتە هەڵەیەکەوەو، لەسزای میری خاچ پەرستی دەترسا، ڕایدەکردە سەربازگەی سوڵتان ڕایدەگەیاند کە ئەو داڵدەی دەدات، ئەویش دەیحەواندەوەو ڕێزی دەگرت. بەڵام فەرمانی بەیەکێ لەپیاوانی تایبەتی خۆی دەکرد کە چاودێری بکات نەوەك ئەو کەسە سیخوڕێ بێ و خراپکاری بەدەستەوە بێت.

پێشتر باسمان لە ژنێك کرد کە منداڵەکەی لەدەست دەدات و دێتە لای سوڵتان و کار بۆ بەختەوەرکردنی ئەم ژنە دەکات و بە شوێنی ئەو منداڵەدا سۆراغی کرد، هەتا سۆمای چاوی پێ ڕونکردەوە، ئەمەش کارە دەگەمەن و ناوازەکانن و ئاماژەیێ بۆ ئەمە کیفایەتە، ڕەنگە بە قسەی کۆتایی لەمەڕ ئەمەدا ئەوەبێ کە (ابن شداد) گێڕایەوەو کە لێرەدا باسی دەکەم[1].

(ئەو، تێکەڵی و هاوڕێتی خۆش بوو، ڕەوشتی جوان بوو، ڕوخۆش بوو، ڕێزی لە ڕەگەزی عەرەب و واقعی ئەوان دەگرت و، سەرگوزشتەی ئەوانی دەپاراست. بە نەژادی ئەسپ شارەزابوو، بەشێوەیەك کە ئامادەبووان سودیان لێوەردەگرت کە خەڵکی تر ئەو سودانەیان وەرنەدەگرت، ڕەوشت جوان بوو، لە خەڵکی دەپرسی لەمەڕ نەخۆشییەکەی و دەرمانکردن و خواردن و خواردنەوەو بارودۆخەکەیدا، دیسان

١) النوادر السلطانیة / ل ٢٧. (نووسەر).

دانیشتنەکەی خاوێن بوو ناوی کەسی لەلا بەخراپە نەدەهات بە چاك نەبێ‌و، حەزی نەدەکرد بە چاك نەبێ ناوی کەسی لەلا باس بکرێ‌و، قەت نەمبینیوە جنێودانی پێ‌خۆشبووبێ بەکەس بگوترێ‌و، هەرکە هەتیوەکی لەلا ئامادەدەبوو بەزەیی لەگەڵ سەرپەرشتکاری ئەودا دەنواند، دڵی دەدایەوەو پێی دەبەخشی، ئەگەر گەورەکی هەبوایە پشتی پێ‌ببەستێ تەسلیم بەوی دەکرد، ئەگەرنا ئەوەندە چاکەی لەگەڵدا دەکرد، کە پێویستی ئەو دابین بکات‌و بە کەسێکی دەسپارد کە بە پەروەردەو مشۆرخۆری ئەو هەڵسێت). ئەگەر (قازی ابن شداد) ماوەکی زۆر هاوڕێتی سوڵتانی کردبێ‌و نانی لەگەڵدا خواردبێ‌و هات‌وچۆی لەگەڵدا کردبێ تا بووە بە شوێنی ڕازی ئەو، گەشتیاری (ئەندەلوس)ی (ابن جبیر) هیچ شتێکی ئاوای لەگەڵ ئەودا نەبووە، بەڵکو بە سەرتاپای جیهاندا سوڕاوەو تەنیا گەشتیارەکی ناوداربووە.

بێ‌شومار سوڵتان‌و پادشاو قەڕاڵی بینیوە، لەوانە تەنیا (سەلاحەددین) کەوتۆتە بە دڵ‌و لە (باب الموازنه)دا باسی دەکات‌و وتویەتی[1]: (ئەم وڵاتە کە هی سوڵتانی جۆراوجۆرە وەکو شایەکانی هۆزەکان لە ئەندەلوسدا، هەر هەموویان ڕەوشتێکی تێدایە کە دراوەتە پاڵ وشەی (الدین)، لەوێدا تەنیا گوێت لە نازناوی زەق دەبێت، هەم سیفەتانێك کە بەدەستهێنانیان کەڵکی نیە، بەڵکو گەل‌و پاشاو دەوڵەمەندو گەدا لەناویاندا بەشدارن، کەسێکی تێدانیە کە شایانی ئەم سیفەتەبێ تەنیا (سەلاحەددین) نەبێ کە شای شام‌و میسرو حیجازو یەمەنەو بەچاکەو دادوەر ناوی ڕۆیشتووە، ئەم ناوە هاوشانی ناویەتی‌و، وشەیەکە لەگەڵ واتاکەی پێکاوپێك دێتەوە، بەڵام ئەم ناوە بۆ خەڵکی تری جگە لە ئەو وەکو ڕەشەبایەکە کە بە خێرایی دەڕوات، وەکو شاهیدی دانێکە کە ڕەخنە ڕەتیدەکاتەوە کە ڕەخنە لابەرێ لایدەبات.

القاب مملـــكة فـي غير موضـــعها
كالـهر يحكـــي انتفاخا صولة الاســـد

١) رحله ابن جبير/ ل ٢٢٨. (نووسەر).

لە چەند لاپەڕەکی زۆری گەشتەکەیدا ناوی سولتانی بەو پەڕی ستایشەوە بردووە، بەلاّم ستایشەکی بابەتی کە واقیعی کرداری پشتگیری لێدەکات، هەم خودی بینەریش کە ئەم گەشتیارە خۆشی ئەو ڕاستییەی بینیوە ئەگەر هەرچی (ابن جبیر) باسیکردووە لەمەڕ (سەلاحەددین)دا باسی بکەم درێژە دەخایەنێ‌و، ئەمە باسێکی تەواو هەلّدەگرێ کە لێرەدا بوار نیە بنووسرێتەوە، بەلاّم دوو بابەت لە بابەتەکانی گەشتەکەیدا باس دەکەم کە لە شێوازێکدا قسەدەکات بۆنی دلّسۆزی‌و لێکدانەوەکی ڕاستگۆیی لێدێت‌و، هەموویان گوزارشێکن ڕاست‌و ڕەوانن بەلّگەی زۆری لەسەر هەیە کە لەلایەن گەورە مێژونووسەکانەوە نووسراوەتەوە، (ابن جبیر) دەلّێ: (چاکەکانی ئەم شارەیە -ئیسکەندەرونە- شکۆو بلّندییەکەی بۆ سولّتان دەگەڕێتەوە: قوتابخانەو فێرگەو، ئارامگای دانراو لەناویدا بۆ خوازیاران‌و خواپەرستان کە لەناوچە دورەکانەوە دەهاتن‌و هەریەکەیان دەچووە ناو شوێنێکەوە پەنای دەبردەبەرو، دەچووە لای فێرکەرو مامۆستایەك ئەو هونەرەی مەبەستی بوو فێری بکات‌و، هەر تەقەلایەکی مەبەستی بایە پێوەی هەلّدەستا).

ئەنجا دەگاتە قسەی دوورو درێژ کە بە دەقی خۆی لە چەند بابەتێکدا باسی دەکەم، پاشان بەدوای ئەوەدا وتوویەتی: (سەیرترین شت کە بۆ ئەو بێگانەو نامۆیانە ڕێك کەوتبوو ئەوە بوو کە هەندێ لەوانەی دەیانویست بۆ ئامۆژگاری لە سولّتان نزیك بکەونەوە لای باس دەکەن کە زۆربەی ئەوانەی ژەمە نان وەردەگرن لەبەر ئەوە نیە کە هەژاربن پێویستی یان پێ بێ بۆ بژێوی ژیان، بەلّکو لەبەر ئەوەیە لەو سەفەرەدا نان‌و تویشویەکی کەمیان پێدەمێنێ، ویستی سۆراغی هەولّی ئەم ئامۆژگاریکەرە بکات، ئەوەبوو ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم سولّتانە چووە دەرەوەی شار، چاوی بەهەندێ لەو کۆمەلاّنە کەوت‌و، بەڕێگای بیابانی (تەڕابلوس)دا هاتبوون لە برسان‌و لە تینوەتی ڕەنگ‌و ڕویان نەمابوو پرسیاری لێیان کرد کە بۆ کوێ دەچن، هەوالّیان پێدا کە مەبەستیان سەفەری حەجکردنی مالّی خوایە، ئەوانە بە سواری وشکانی هاتوون‌و زۆر ماندوو شەکەت بوون لەم دەشتاییەدا، ووتی:

ئەگەر ئەوانە بگەنە جێ کە ئەو هەموو ناوچە ناسراوانەیان بڕیوەو ئەو هەموو ماندوێتیو شەکەتییەیان بینیوەو هەر یەکەیان زێڕو زیوی خۆی پێیە پێویستە کە بەشدارییان بکرێو ئەو دابو نەریتەی لەگەڵماندا بەکارهێناون بەردەوام بێو نەپچڕێ، ئەمەش شتێکی باشە بۆ ئەو کەسەی کە دەڕواتە لای ئەو جۆرە کەسانە، ئەوانە مەبەستیانە بێنە لای ئێمە بۆ ئەو بەشەی ئێمە لەبەر خاتری خودای شکۆمەند کردومانە بە ئەرکی سەرشان.

بەڵام لەمەڕ بابەتی تردا لەبارەی ئەودا دەڵێت:[١] ((یەکێ لە شکۆو پیاوەتی یەکانی ئەم سوڵتانە نزیکە لە خوای گەورەیە کە شوێنەوارەکەی وەکو یاداشتێکی جوان بۆدینو دنیا ماوەتەوە: لابردنی گومرگو باج بوو کە لەسەر حاجییەکان دانرابوو کە فشاری زۆری دەخستە سەریان لە دانیدا کە تۆبزیو ستەمی تێدا بوو، ئەرکی سەر شانی ئەوانیان قورس دەکرد کە بە تەواوی ڕۆیان بچوێنێ، بەڵکو لەوانە وە هاتووە هەرکەس کە نەتوانێ بیدات زیاد لە خەرجی خۆی ئەوە پێویستە ئەو گومرگو باجە دیاریکراوە بدات کە (٧) دینارو نیوەو، لە دیناری (میسر)یش دەبێ (١٥) دینار بێ بۆ هەر سەرێك، ئەمەشی لە توانا دا نەبوو، زۆر بە ئازارەوە دەیتوانی بیدات، ئەم جۆرە سزادانە لە (جیددە)دا هەبوو بە لکو زیاتریش لەمە.

بەڵام سوڵتان ئەم گومرگە نەفرین لێکراوەی لابردو، لە جیاتی ئەوەدا ئەو نەریتەی دانا کە دەبێ خواردنو توێشویان پێ بدرێتو، لە جیاتی ئەوەدا باشترین جێگرەوەی داناو، لە ڕێگای بۆ حاجیەکان خۆش کرد، کە خەریك بوو بپچڕێ، خوداوەند لەسەر دەستی ئەم سوڵتانە دادوەرە مسوڵمانانی لە دەست ڕووداوەکی گەورەو بارەکی بە ئەشکەنجە رزگار کرد، هەر کەسێ بڕوای وایە حەج بنەمایەکی ئیسلامە سوپاسی ئەوی لەسەرە،.... بۆ ئەو گومرگەی لە وڵاتی (میسر)و شوێنی تردا هەبوو، هەم ئەو باجەی دەکەوتە سەرو وردودرشتی شتومەك لەکاتی کڕینو فرۆشتنیدا، هەتا گومرگ لەسەر خواردنەوەی ئاوی (نیل) دانرابوو، بەڵام سوڵتان

---

١) رحلة ابن جبير / ل ٢٥. (نووسەر).

ئەم داهێنراوە: نەفرین لێکراوانەی هەموو لابردو، دادگەری فراوان کردو، ئاسایشی بڵاوکردەوە، یەکێ لە دادوەرییەکانی سوڵتان بێترسکردنی ڕێگاو بانەکان بوو کە خەڵکی لە وڵاتی ئەودا بەرگی شەو دانانێن بۆ ڕاپەڕاندنی ئەوەی مەبەستیانە، لە شەوی ئەودا هەست بە هیچ ترسێ ناکەن بیانگێڕێتەوە، بەو شێوەیە ڕەوشی ئەوانەمان لە (میسر)و ئیسکەندرونەدا بەرچاوکەوت).

ئەم گەواهییانە بابای لێکۆڵەر بێنیاز ناکات لەوەی کە دەبێ پەڕەی زۆرتر بخوێنێتەوە، نموونەی ئەم کارە ناوێزانە بە پەرش‌وبڵاوی لە لاپەڕەی دور لەیەکتریدا هاتوونو، بە شوێندا گەڕانیان هەندێ ماندووبونو ئازاری دەوێت.

# هاوسـەنگی یەکـی نا دادگــەرانە لەبــارەی
# ( عماد الدین )و ( نورالدین )و ( سـەلاحەددین )دا

لە چاخی نوێدا هونەری نووسینی مێژوویی بەباشی گەشەی کردو هەڵچوو، ئیمرۆ مێژووی ئیسلامیمان دەبینین کە لە چەشنی جۆراو جۆردا پێشکەش دەکرێـتو، بـە لێکدانەوەی مەنهـەجی بە پێـی ئـەو ڕۆشـنایەی لـە ڕێبـازە ئـەدەبیو دەرونـیو کۆمەڵایەتەکانەوە سەری هەڵداوە لێك دەدرێتەوە، تا لەمەڕ یەك بابەتدا کـە چـەند نووسەرێ نووسیویانە دەخوێنییەوە.

لەجیاتی ڕوانینوو ڕێبازی هەمە جۆرو، شێوازی جیاجیادا شتێ وا دەبینـی کـە ببێتە شوێنی سەرسوڕهێنانی تۆ. هەر لەوکاتەوە (ابن خلدون) ڕێگای شیکردنەوەی خـۆی دەسـت پێکـردووە بـۆ زانینـی هۆکارەکـانو، بەسـتنەوەی ئاکامـەکان بـە دەسپێکەکانەوەو پڕکردنەوەی کەلەبەرو بۆشایە فراوانەکان بـەو شـتانەی لـۆژیکی شتەکان ئاماژەی بۆ دەکاتو ڕەوشی شوێنو کات دەینووسێتەوە. نووسـینی مێـژو وردە وردە لە پێودانی ئاسایی خۆی لە گێڕانەوەو دانـەپاڵ (الاسـناد)دا لادەداتو، ڕووداوەکان بـەپێی سـاڵو ڕۆژ دەگێڕدرێتـەوە بێئـەوەی ڕەخنەیـەکی کارامـە لـەو داستانانە بگیرێ کە دێتە ناوەوەیان لەکاتی بوونی جیاوازیو پێچەوانەوەی شپرزەدا بە وردی لە بەرامبەریدا بەکێ دابنرێت، تەنیا کەسێ لـەو زانایانـە نـەبێ کـە لـە مەسەلەکاندا قوڵ بوونەوە، تا چەرخی نوێ بە شێوازی بەرنامەیی خـۆیو لـۆژیکی بەهێزیو هۆ دەرخستنی زانستی خۆی (التعلیل العلمـی) هاتـە مەیدانـەوەو، لـە کێڵگەی مێژووی خۆیدا کشتوکاڵەکی ڕەنگ گەشاوەی بینی کە بەرەکەی بەتام بێو جۆرەها چەشنی هەبێت.

هاوسەنگی کردن لەنێوان رووداوەکان‌و کەسەکاندا لە نووسینی مێژوییدا مەیدانەکی فراوانە پێنووسی نووسەران سەرنجی دەداتێ، دەبینین رووداوی دێرۆك بە رووداوەکی کتوپڕەوە پەیوەست دەکرێ، لە پێودانگەکی وردا هۆیەکان‌و ئاکامەکان لەگەڵیدا دەردەکەون‌و تا یەك لە تایەکی تر پێشتر دەخات، یان هەردوو تایەکان لە یەك جێگەدا هاوسەنگ دەکات لە سەرزەنشت‌و پێهەڵاوتندا، هەندێجار هاوسەنگی کردن بۆ پاڵەوانەکان دەگوزارێتەوە کۆن‌و نوێی ئەوانە لەسەر خوانی ڕەخنەدا لە ئاستەکی یەکسانی ورد وایە، بێگومان خوێنەر بەسودەکی زۆر سەردەکەوێ‌و سوود لەو شیکارو لە پێشتر دانانە (الترجیح)دا وەردەگرێ، ئەنجا لەگەڵ نووسەردا بە ئاسۆی فراوانیدا دەڕوات‌و هەردوکیان سەیری هۆکارەکانی بەرز بوونەوەو دابەزین دەکەن، یان ئەوەی بە هۆکانی لادان‌و مام ناوەندی (الاعتدال) سەر هەڵدەدات، ئەمەش چێژەکی هزری تێرو تەسەلەو، ئەوکەسەوی چاوگی ڕەسەنایەتی یەکەی هەڵسەنگێنێ لەسەری سوردەبێت.

بەڵام ئەو هاوسەنگی (الموازنە)یە بەچێژە هەندێ جار توشی تەزووی شاراوە دەبێت‌و نووسەر بەلایەوە دژوار دەبێ کە برگەی ڕاستەقینە بپێکێ کە دەیلێت، مەبەستی لەوە بەدڵ بوونەکی شاراوە یان ئاشکرای پاڵەوانێکی دیاری کراوە کە لە بەرامبەریدا چاکەی کەسانی تر کەم دەبێتەوە، ئەم مێژونووسە شتەکان بەو پێیە لێکدەداتەوە کە ئەو بەدڵ بوونە ڕونەی ئەو ڕازی بکات، ئەو هەندێ جار لە بەدڵ بوونی نەستی (الاعجاب اللاشعوری)دا بێئاگایە کە لایەنی دووەم سەرزەنشتە دەکات‌و ڕەخنەی لێدەگرێ، ئەمە قۆناغەکی دڕکاوییە پێویستی بە هێورییەکی تەواوە، تا نووسەر حەقیقەتی دەرونی خۆی پە پێداچوونەوەو شیکردنەوە بۆ ئاشکرا ببێت! لێرەدا گەواهی یەك هەیە بەڵگەکی بەهێزە: کتێبخانەی مێژویی (ئەندەلوس)ی‌و خۆرهەڵاتی بە زۆرێ لە دانراوەکانی توێژەری شارەزا مامۆستای دکتۆر (حسین مؤنس) سەرکەوت‌و گەواهی ئەوەیدا کە بە تاوو توێیە وردەکانی‌و ڕایە ڕاستەکانی زۆر سودمەند بووە، تا ئێستا من بە دڵخۆشییەکی بەختەوەر بۆ

شوێنەوارە مێژووییەکانی ئەو دەگەڕێمەوە ئێستاش کە لەگەڵ هەندێ ئاراستە دەروونییەکانیدا کە دێتە ڕێگامەوە جیاوازیم هەیە ئەوە بە حەقی خۆمی نازانم کە ڕاستیم پێکابێ‌و ڕێگای ڕاستم گرتبێت، چونکە من وەکو ئەم نووسەرە شارەزاو بیرتیژو بیر بەهێز نیم، بەڵکو ڕوانینەکی سادەییە کە ڕەنگە پەسەند بێ‌و بابەتەکی هەڵە چارە بکات، یان ڕەنگە ڕەفز کراوبێ‌و پێویستی بە ڕاستکردنەوە هەبێت[1].

کتێبێکەی ئەو بە ناوی (من قصص البطولة)[2] خوێندمەوە، زۆرێك جوانکاری‌و ڕونی هاوسەنگی لە نێوان کەس‌و کەسێکی تر دروست دەکات، من لە ڕوانینیی دڵسۆزی خۆمەوە پێم وایە کە زۆرێك لادەدات‌و دوردەکەوێتەوە لە هێرش کردنە سەر کەسێ کە زۆربەی جار پشتگیریکردنی، یان لای کەمی پاساو بۆ هێنانەوەی دەوێت، من سەرگەردان دەمێنم‌و دوو دڵ دەبم کاتێ ئەو بە دڵ بوونە نەستەی (اللاشعوری) نووسەر دەبینم کە ئەوەندە بەرز دەبێتەوە گەرم دادێ، تا ستەم لە مام ناوەندەکانیش دەکات، بۆ نموونە دکتۆر لەمەڕ پاڵەوانی گەورە (نورالدین محمود زنکی) شکێنەری خاچییەکان دەنووسێ کە نموونەی پێدەهێنینەوە.

بەر لە هەموو شتێ بە دکتۆری بەڕێز دەڵێن: من زۆرو بێ‌سنور ئەم کەسایەتیە نمونەیی یەم بە دڵەو، هەرچی باست کردووە لە چاکەکانی سەرسوڕهێنەری ئەو شك‌و گومان هەڵناگرن، سەرەتا باسی ئەو دوو وتارە دەکەم کە بەر لە چەند ساڵێ لەمەڕ (نورالدین) نووسی بووم‌و لە یەکێکیاندا نووسیومە: (نورالدین) لە دیارترین ڕەوشت‌و پاکترین بنەچەکانیدا بە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) دەچێتەوە، ئەگەر بە پاکژدانان‌و پیرۆز ڕاگرتنی حەق‌و ڕاستی بێ گوێدان بە دەسکەوتی سیاسی‌و سەرکەوتنی جەنگی پڕەنسیبی میری بڕوادارانی خاوەن وەرع‌و زوهد بووبێ، ئەو پیرۆز ڕاگرتنەی حەق بێ‌گوێدان بە شتی تر بڕوای (نورالدین) بووە.

---

١) ئەم‌وتارە بەر لە مردنی خوالێ خۆش بوو (د: حسین مؤنس — ر —) نوسراوە. (نووسەر).
٢) مع الابطال / د: محمد رجب لبیومی / ل ٩٥ / مطبعة دار القلم بدمشق. (نووسەر).

هەرچەندە ئەم دووکەسەیە بەهۆی هەواو ئارەزوی کین لەدڵان حەزی تەماعکاران توشی کارەسات هاتوون، لە هەندێ خۆ شلکردنو نەرمی کردندا (التهاون) لەسەر حیسابی حەقدا شتی پەرتو بڵاو کۆدەکاتەوەو، شۆڕشەکان خامۆش دەکاتەوە، بەڵام نموونەی باڵا بە گوێچکەی هەر دوو پاڵەوانە بە ڕیزەکەدا هاوار دەکات کە تەنیا حەقو ڕاستی پاکژ ڕابگرنو پیرۆزی بکەنو دڵ بە دەسکەوتێ خۆش نەکەن کە بێ ویژدانیو دڵتەنگی تێدایە، ئەی لەو بانگەوازەی بڕواداەرکی ڕاستگۆ، کە لە ئارەزووەکانەوە بەرز دەبێتەوە، ئەگەرچی بۆ گوێگرە کەشی زۆر شەکەتیو ماندوبوون بگێڕێتەوە)، بەڵکو سەرباری ئەمەش من لەو دکتۆرە خۆم بە ویژدان تر دادەنێم لەمەڕ (نورالدین)دا کە لەناو قسەکانیدا دەڵێ: (ئەو سەربازەکی شارەزانە بوو، سیاسیەکی مەزن نەبوو، بەڵکو بڕوا دارێك بوو کە بڕواداریە ڕاستەکەی وای لێکرد بوو کە پێویستی بە کارامەیی سەرکردەییو زیرەکی ڕامیاری نەبێت).

ئەم قسەیە پێویستە بە ڕاستکردنەوە هەیە، شایەد لە حەق نزیك کەوتبمەوە کاتێ لە پەرچدانەوەیدا بە دڵسۆزییەوە وتوومە[1].

(پیرۆز ڕاگرتنی پرەنسیپەکانی ئیسلام ڕامیارییەکی بەرزەو زۆر کەس ناتوانن دەستی پێوە بگرن لەو کارانەدا کە هەندێکی وەردەگرنو هەندێکی تریش بەرکەنار دەکەن، لە هەمان کاتیشدا دژوارە بەلایانەوە دان بەو کەموکوڕیەدا بێنن، کە سەرنشتەکردنی گومان هەڵناگرێتو لە نەنگی یەکە بکۆڵنەوەو ئەو شل کێشانە ناتەواوەیان دەکەن بەزیرەکییەکی بلیمەتانە کە بارو دۆخەکان پێویستی دەکاتو کارە شاراوەکانو نادیارەکان فەرزی دەکات، پاشان چاو لە خەڵکانێ دەکەن کە شل کێشان لە حەقدا ناکەنو، دوری نێوان هەردوو گروپ دەبینن لە جیاوازی ئامانجو مەبەستو ڕێگا دا، ئەوکاتە سەرکۆنەی ئەو کەسە دەکەن کە گوێ بۆ ڕاستی دەگرێو شوێن باشترین ڕێگا دەکەوێت، ئەگەر لە ساتێکی بڕواداریو دوربینیدا بۆ

---

١) مع الابطال / محمد رجب البیومی / ل: ٦٩). نووسەر)

ویژدانیان بگەڕێنەوە پەردە لەسەر فرتو فێڵیـان لادەچـێ، کـە بـۆ ستەمکارییەو دەزانن کە پیاوانی باش ئەو کەسانەن سیاسەتی زیرەکانەو نەرم کێشان لەکـەداریان ناکات، بەڵکو ڕامیاری قورئان بە تەنیا بڕوا جەختی لەسەر دەکاتەوە!

ئایا پێشەوا (عەلی) لە پەروەردەو ڕای ڕاستو فیقهو ڕوانینیدا سیاسی نەبوە؟!

ئایا (نورالدین) لە لێبوردەیی و پەیمان بەجێهێنانو ڕاستی بەڵێنیدا سیاسەتمەدار نەبووە؟!

نەخێر ئەی ئەوانە!! ئەم دوانـە دو سیاسـەتمەداری گـەورە بـوون، پڕەنسیپەکی نـەمریان هـەبووە کـە ئارەزویـەکی سـەرکەش ڕوی تـێ ناکـاتو، خـەیاڵ پـلاوی هەڵەشەیی پاکژیەکەی لەکەدار ناکات!! ئەم دوانە سیاتمەدارەکی ژیربوون پەیوەسـت بوون بە سیاسەتی قورئانو زیرەکییەتی ئیسلامو، قەد غەدرو ناپاکییان لە پەیماندا، یان بەبێ بـوونی دوژمنایـەتی تەشـقەڵەیان بەکـەس نـەکردووە! بـەڵکو ئـەو دوو سیاسەتمەدارە بەرزە سیاسەتمەدارەکی نمونەیی بوون لە دنیای تەماعەکاندا.

کەواتە پایەی (نورالدین) بەلای منەوە گەورەترە نەك بـەلای دکتـۆرەوە!! بـەلام بابەتی ئەم وتارە لەم سنورەدا ناگیرسێتەوە، بـەڵکو ڕو لـە ڕاسـتکردنەوەی ئـەوەی دەکات کە نووسەر لە (دیمەنی هاوسـەنگی)دا باسـیکردووە لەمـەڕ (عمـاد الـدین زنگی) بـاوکی (نورالـدین) لەلایەکـەوەو، (سـەلاحەددین ئـەییوبی)و (نورالـدین) لەلایەکی ترەوە، لەمەڕ ئەم دوو پیـاوەدا هەنـدێ ستەمی کـردوو، لێـرەدا ڕاسـت کردنەوەو ویژدان دێت.

دکتۆر (حسین مـؤنس) دەڵێ: (نورالدین): وەکو باوکی خۆی نـەبوو کـە (عمـاد الدین)ە کە، بە دوای دەسەلاتدا دەگەڕا بەهەر نرخێـك بێـت لـە ئاگربەسـت کـردن لەگەڵ خاچییەکانداو ڕۆیشتن لەگەڵیاندا بۆ هەر کوێیەك مەبەستیان بێ دڕدۆنگـیو دوودڵی نـەدەکرد، بـۆ دەسـتنان لـە دەسـتی مـسوڵمان یـان مەسـیحی بایـەخی پێنەدەدا، مادام کارەکە سەربکێشابا بۆ زیاترکردنی موڵکیو دارایی.

لەمەڕ (سەلاحەددین)دا دکتۆر (مؤنس) لە هەمان باسدا دەڵێ: (سەلاحەددین) لە هەر کوێیەك بۆنی مەترسی کردبایە خۆی دەگۆڕی، چاوی هێمنیی‌و خۆڕاگری تێدا دادەپۆشی‌و، پرۆژەو داخوازییە زۆرەکانی تەواو نەدەبوو، پێویست بوونی بە سامان هەر دوایی نەدەهات‌و، سەرکارو باج وەرگرانی ئەو ڕەقترین کەس بوون لەسەر خەڵکیدا، هەر بازرگانێ بە وڵاتێکدا ڕابردبایە مسۆگەر باج وەرگرانی پشتیان دەشکاند، نیشانەی ساماندارى لەسەر هەر مرۆڤێ دەرکەوتبایە مسۆگەر لەلایەن پیاوانی سوڵتان بە سزادان ئاگاداریان دەکردەوە، جوتیارو هەژارو پێدەسەڵاتان لە خۆماندو کردندا لەگەڵ ئەودا بوون، هەر میوەیێ لە کێڵگەکەیاندا پێگەیشتبایە باج وەرگران هەڵیان دەلوشی، هەر گوڵەگەنمی سەری دەرهێنابایە لە عەمبارەکانی سوڵتاندا جێگیر دەبوون، تا وای لێ‌هات خەڵکی لەسەردەمی ئەو ڕوت‌و هەژار بوون‌و لەسەر دەروازەی چەرمەسەری برسێتی بەجێی هێشتن کە خەڵکی بڕیەوە چۆن بڕینەوەیەك. ئەمە قسەی جەنابی دکتۆر کە بوو لەمەڕ ئەم دو پاڵەوانە گەورەیەدا ئەگەر زۆر (نورالدین)ی بە دڵ نەبوایە لە بوواری هاوسەنگی‌و لە پێشتر داناندا (الترجیح) ئاوا ستەمی لە (عماد الدین)ی باوکی‌و شاگردەکەی کە (سەلاحەددین)ە نەدەکرد.

لێرەدا بەکورتی شوێنی ستەمە جەرگبڕە کە باس دەکەین لەم دوو پیاوەدا بۆ ئاشنابوون بەوەی کە ڕابردوو قسەمان لێکرد!! خاچپییەکان پەلاماری خۆرهەڵاتی ئیسلامییاندا کە کاتەشی دژوار بوو، میرنشینەکانی شام لەژێر چنگی ڕژێمی دەرەبەگی دابوون کە هەر یەکە کاربەدەستی ویلایەتەکی بچوك بوو کە هیچ سوپایەکیان نەبوو، یان هێزی کۆبکاتەوە، قەڕاڵ‌و میرەکانی دەوڵەتە بچوکەکانیش ناکۆك بوون‌و، بێ حاڵی بوون لە یەکتری‌و یەك بوون تێ‌دەپەڕی، خەلافەتی (عەبباسی) پەکی کەوتبوو لاواز بووبو نەیتوانی زیان لەخۆ دور بخاتەوە، خەڵکی پەنایان بۆ بردو قژو مووەکانیان بڕی‌و هاواریان کردو گریان، بەڵام بێ‌سودو قازانج بوو. هەرچی دەوڵەتی (فاتیمی) بوو لە میسردا ڕوی لە فێڵەکانی کۆشك‌و پلانەکانی (ووزەرا)و، ناکۆکی ناوخۆی نێوان خەلیفەو سەرۆك سوپاکاندا بوو!!

بەم کارە خراپو سوکە مەمالیکەکانی ئیسلامدا هەڵوەشاوەیەو خاچییەکان توانیان چوار میرنشینی (الاتینی) لە (ئەلرەها)و (ئەنتاکیا)و (بەیتولمەقدس)و (تەراپلوس)دا دابمەزرێنن، دوای ئەوەی لافاوی خوێنیان لەناویاندا تا سنگیان هەڵساند، هەر لە جەنگی (قودس)دا(٧٠) هەزارکەس لە مسوڵمانان شەهید بوون!!

چارەنووس وا بوو (میری موسڵ)ی ئەوکاتە (عماد الدین زنکی) کە بەم کارە دژوارە هەڵسێ کە زیرەكو ورد بوو لە بەڕێوەبردنداو دانایەکی گەورە بوو، سور لەسەر یەکگرتنەوەی میرنشینە عەرەبیکان لەژێر سەرکردایەتی خۆیداو زۆربەی ناوچەی (جەزیرە)ی گرتە خۆیو، ئنجا حەلەبی داگیر کرد، وە زۆرێکی تر لە وڵاتی شامو بەرامبەر فەرەنگەکان بێتەوەو، توانی بە سوارو پیادە سەنگیان بخاتە سەرو بە کوچەو کۆڵاندا شوێنیان بکەوێو، بە ترسو تۆقینەوە داوای فریاکەوتن لە شای (قوستەنتینییە) بکەن. پاشان پەلاماری (الرها)ی داو دەستی بەسەرداگرتو مسوڵمانان لەدەستی ئەو هەستیان بەهێزی خۆیان کرد، خاچییەکان ترسانو زانیاری بەڵێنی کلێسا بە سەرکەوتنی یەك لە دوای یەکدا وەکو تەراویلکەیەکی فریودەرە لە بیابانەکی گەرمدا کە کۆچکەر پێی هەڵدەگیرسێت.

(عمادالدین) مەبەستی موڵكو دەسەڵات نەبووە بەهەر نرخێك بێ بەڵکو ریزەکانی بۆ دوای خۆی کۆدەکردەوە وەك قیادەیەك تا کەس لەدواوە خەنجەرێکی لێ نەدات، ئەمەش بەهۆی دوربینی بووە، کە سەرنج ڕاکێش دەنووسرێت، کاتێ ئاگربەستو دانووستاندنی لەگەڵ خاصیەکاندا کرد لە هەندێ تەنگانەدا، بە زیرەکی خۆی کاتی درێژ دەکردەوە تا زەمینەی بۆ بڕەخسێنێ بۆ خۆ کۆکردنەوەو پەلاماردان، باری ئەو وەکو باری (نورالدین) نەبوو، ئەو خاوەنی هاواری یەکەم بوو بۆ خۆ کۆکردنەوەو ئامادەبوون، ئەگەر ئەرکی گرانی ئەو نەبوایە لە کۆکردنەوەداو دەرکردنی نەیارانیدا ئەو کلتورە بەهێزی دروست نەدەکرد.

دکتۆر ڕاست دەکات کە دەڵێ: (نورالدین) زاهیدتر بوو لە دەسەڵاتو سیاسەتدا لە باوکی ئەمە کەس نکۆڵی لێ ناکات! بەڵام سنور بەزێنی لە ڕاستییەکەدا دەکات کاتێ دەڵێ: (لەگەڵ خاچییەکاندا دەڕۆیشت چۆنیان بوویستابایە!).

کەواتە میوەی سەرکەوتنی چنییەوە، ڕێگای بۆ (نورالدین) ئەنجا (سەلاحەددین) خۆش کرد! نموونەی (عمادالدین) لەگەڵ ئەم دوو کەسەی دوای خۆیدا وەکو خێزانێکە کە دەیەوێ باخچەکی گەورەو فراوان دروست بکات لە خاکەکی پڕ لە تاوێڕو دڕكو تەپۆلکەیی و گردا، ڕاگری گەورەی دڕكوداڵ لادەبات و ڕێگا خۆش دەکات و جۆگەلەی بۆ ڕادەکێشێ و، گەشە بە تۆوە دەدات و ئەنجا دەمرێ و، کەسانی دەست بە ڕواندن و تۆو دەکەن و کشتوکاڵەکە بە ئاودان و پەیین کردنە ئەستۆ، تا لق و پۆپ دەردەکات و بەرەکان شۆڕدەبنەوە!! ئەوە دەبێ سوپاس بکرێ نەك بێ بەڵگە بە تەماعکار ناوەزەوی بکەین؟!

ئەمە (عماد الدین) بوو بەڵام مەسەلەی (سەلاحەددین) چۆن بووە؟ من وا دەزانم ئەوەی (دکتۆر مؤنس) پشتی پێ بەستووە لە قسەو باسەکانیدا لە توندڕەوو کین لەدڵەکانی فەرەنگەکانی وەرگرتبێت، وە لە خەیاڵ و ئەندێشەی فراوانی چیرۆك نووسەکانی ئەوان وەریگرتبێ، کاتێ چۆن ئەفسانەی خەیاڵییان هەڵبەستووە لەمەڕ سوڵتاندا کە بە جۆرەکی تایبەتی خشڵ و زێڕو ئاڵتونی لە جولەکەو مەسیحییەکان بە جۆرەکی تایبەت سەندووە!

ئەوەی مێژونووسانی عەرەب باسیان کردووە، هەم بە ویژدانە ئەوروپی یەکان لەمەڕ ئازایەتی و بەخشندەیی (سەلاحەددین) زۆردورە لەو شتە هەڵبەستراوانە!!.

ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە لەبواری هاوسەنگی مێژووییدا بە تاکە پاڵەوان ناوی بنێم بەڵگەنەویستی بلاوی وام باس دەکرد لەو نموونانەی لەمەڕ ئازایەتی و جوامێری و بەخشندەیی (سەلاحەددین)ە گەڕانەوە کە دکتۆر ی مێژونووس لە یادی کردون، بڕوا ناکەم هەر کەسێ بە نووسینی کردارەکانی سوڵتان هەڵدەستێ ئەوەی لەیاد بچێ کە لە ڕۆژی گێڕانەوەی (قودس)دا (٢٢٠) هەزار دینار ڕزگارانە

(الفدیە) بەڵکو زیاتریش وەرگرت هەموی بەسەر زاناکانو خەباتگێڕانو هەژاراندا دابەش کردو، زۆرێك هەژارو پەککەوتە خاچ هەڵگرەکانی بێ رزگارانە ئازادکردنو چاوپۆشی لە خشڵو ئاڵتونو زێڕەکانی کردنو لێی وەرنەگرتن کە بڕواناکەم کاری ئاوا بەڕەوشترین کەسی سەدەی بیستەم ئەنجامی بدات.

کچی شای خاچ هەڵگر خاچی زێڕینو خشڵی درەوشاوەی سەرنج ڕاکێشی هەڵدەگرێ، یارەکانی ویستیان پەلاماری بدەنێ، بەڵام جوامێری دەگمەنی ئەو ڕێگەی بەئەنجامدانی ئەم کارەنەدا، بەڵکو - بەتریك)ی (قودس) ماڵی پەرستگاو کلێساکانی (البیع والکنائس) لەناو سندوقی جیاجیادا کۆکردبۆوەو، ئەم هەواڵە بە گوێی (سەلاحەددین) گەیشت بەڵام ئەو گوێی پێ نەداو، لە بەخشندەیی بێ وێنەی خۆیەوە ووتی: دروست نیە دوای ئەوەی لە خەونە ئایینیەکانیدا توشی بەڵامان کرد لە سامانەکشیدا توشی بەڵای بکەین!! خۆزگە دەمزانی ئایا سوڵتانی دوای ئەوە هیچ مسوڵمانەکی کە نیشانەی پر دڵداریو دەوڵەمەندی پێوە دیاربێ هەڕەشەی بەڵا بەسەردا داهێنانو سزادانی لێدەکرێت!!

با سەرنجی ئەو نووسراوەی دکتۆرە موسڵمانە بدەینو لەگەڵ نووسراوی ئەوروپی یەکانی بەراوردی بکەین کە خاوەنی کتێبی (تاریخ المؤخرین) دکتۆر (احمد البیلی) لە کتێبەکەیدا (سەلاحەددین) گێڕایەتیەوە: (لەبەر زۆری بەخشندەییو سەخاوەتی ئەو، فەرمانبەرەکانی حەزیان نەدەکرد بە پارەو سامان بزانێو لێیان دەشاردەوە، هەتا کاتی پێویستی دەهاتو ئەنجا چەندی بیویستبایە بۆیان دەهێنا، ئەمەش لەبەر زۆر بەخشندەییو سەخاوەتی نواندنی ئەودا، ئەگەر دەستی بەسەر ناوچەیەك لە ناوچەکاندا دەگرت نەریتی وابوو ئاگا نامەی بەخشندەو سەخاوەتی خۆی بەسەر پەیڕەوانیدا بڵاودەکردەوە، هەم دانیشتوانی ناوچەکەداو، بەمەش بۆ لای خۆی ڕایی دەکردن، هەتا کاتێ (دیمەشق)ی گرت هیچ شتێکی لە گەنجینەی ئەوێدا دەسکاری نەکرد، بەڵکو هەمووی بەسەر خەڵکەکەیدا بەشییەوەو دابەشی کردو هەرکەس لە خزمەتی دابوایە ڕێزی لێدەناو بە نەرمی لەگەڵیدا دەجولایەوە، هەتا ئەگەر شتێکی خراپی لێدەبینین لە سنگی خۆی دەکردەوەو ئاشکرای نەدەکرد.

بەڵام کۆڕو کۆبوونەوەی ئەو خاوێن بووو کەس نەیدەوێرا قسە بەکەسی نزیك لە خۆی بڵێ، هەر هەتیوەكو بێ سەرپەرشتێکی دەبینی سۆزوبەزەیی بۆ دەجولا، ئەنجا منداڵو خێزانی خۆی خۆش دەویستو لەگەڵ منداڵەکانیدا بەشداری یاری ئەوانی دەکردو زۆر حەزی بە دادگەری دەکردو، هەر کەسێك بە گوێی یاساکانی نەکردبا سزای دەدا، بۆ مەسەلەی ستەمکاری هەفتانە دوو ڕۆژ دادەنیشت بۆ دادگایی کردن. بۆ هەژارو دەوڵەمەندو کە لەماڵەوە بایە یان لە سەفەرو ڕۆیشتن دابایە

ئەگەر بمانەوێ زۆرێ لە دەقەکانی مەسیحییەکان تۆمار بکەین، ئەوا ماوەی قسەیان نابێ، بەڵکو ئەوەندە بەسە کە داستانە ئیسلامیەکان گێڕاویانەوە لە چاکەکاری نایابو ئەندێشەی جوان، ئێمە نامانەوێ ئەوە بگێڕینەوە کە برادەرو هەڤاڵەکانی ئەو نووسیویانە کە تێکەڵاوی ئەوبوونو بڕوایان پێ هەبووە وەکو (ابن شداد)و کەسانی تر تا لە هەندێ زێدە ڕەوی ئەماندا نەکەوینە گومانەوە لەڕای ئەوانەدا کە لە وەرگرتنو ڕەفزکردنی شتدا توندی دەنوێنن!

بەڵکو ئێمە ئەو شتانە وەردەگرین کە لە گەشتەکەی (ابن جبیر)دا خۆی بەچاوی خۆی بەرچاوی کەوتوون لە بەخشندەییو پیاوەتی سوڵتان، چونکە لەو کەسانەیە کە لە نووسینی مێژووی سوڵتاندا پشتی بە هیچ ڕویەك نەبەستووە کە بۆنی لایەنگیری لێبێت، بەڵکو ئەو ڕێبوارێك بووەو، ماوەیێ لە (میسر)دا سوڕاوەتەوەو شتی بینیوەو بەرچاو کەوتووەو، پاشان کە لە ولاتەکە دورکەوتۆتەوە بێئەوەی کەوتبێتەوە ژێرکاریگەری کاربەدەستەوە، یان لە گەورەیێ نزیك کەوتبێتەوە وە نووسراوی خۆی خستۆتە ناو یاداشتەکەیەوە، وە پیاوە مێژوونووسەکی ڕسمی نەبوو کە سەرنج ڕاکێشانی پاڵەوانەتی هانی دابێ بۆ زیادە کاری، بەڵکو وەسفێکە کە بیری سەرقاڵ کردبوو هەڵی دەڕێژێ بێئەوەی شوێنێکی بۆ تۆمارکردنی زانستی بۆخۆی دابێت.

کتێبەکەشی مـۆرکی ڕاسـتگۆیی سـادەیی و وەسـفەکی ئەمینـداری وەرگـرتن، هەندێ لەوەی وتویەتی ئەوەیە[٢]. (بەشێك لە جوامێریو شکۆ مەند یـەکانی ئـەم شارە کە لەڕاستیدا بۆ سولّتانەکەی دەگەڕایەوە: قوتابخانەو خوێندنگەو ئارامگاکان بوون کە بۆ خەلّکی بە داخوازیو پەرستن بوو کە لە هەرێمە دورە کانەوە دەهاتن‌وو هەریەکیان شوێنێکی دەگرتو لەناویدا خۆی دەحاواندەوە، مامۆسـتا یـەك هـەبوو ئەو هونەرو شاکارییەی مەبەستی بووایە فێـری دەکـردو، سـولّتان بـە شـێوەیەکی ئەوەندە فراوان چاودێری خۆی فراوانکردبـوو بـۆ نامۆکـانو بێگانـەکان کـە هـەتا فەرمانی دابوو گەرماویشیان بۆ دابـین بکـەن لـە کاتـێ پێویـستی پێبوونیانـداو بیمارستانو خەستەخانەی بۆ نەخۆشیەکانی ئەوان دانا بوو، دکتۆرو نوژداری دیاری کرد بوو کە سەردانی بارودۆخیان بکەن، کـارگوزارو خزمـەتکار لەبـەر دەسـتیاندا بوون فەرمانیان پێدەکردن کە چاو لە بەرژەوەندی ئەوان لـەکاتی ئامـاژە پێکردنـی ئەواندا لە چارەسەرو خواردەمەنیو، ئەوان لە جیاتی دکتۆرەکانو پزیـشکەکان بـە چارەکردنیان هەلّدەستان. پیرۆزترینی ئەم مەبەستانە ئەوە بوو سولّتان بۆ ڕێبوارانی خۆرئاوا دوو نانی دانا بوو بۆ هەر کەسێ کە دەگەیشتە جێگـا، هـەموو ڕۆژێ بـۆ دابەشکردنی ئەمە مرۆڤەکی ئەمیندارو دەستپاکی لەلایەن خۆیەوە دادەنا، ڕۆژانـە دەگەیشتە (٢٠٠٠) یان زیاتر لە (نـان) بـەپێی زۆر کەمییەکـەی، ئـاوا بـەردەوام بوو.... بەلاّم هاوەلاّنی خۆی لەوپەڕی خۆشگوزەرانیو خۆشی دابوونو پێویـستییان بە هیچ پیشەیێ نەبوو).

·لەم تۆمارکردنە نمایشی یە (العـرضـی)دا کـە تـەنیا گواسـتنەوەی فۆتـۆگرافی ڕابردووە کە ڕویداوە هیچ شـتێ نیـە بیلـێین کـە بـە سـتایشو پێهەلاّوتنـەوەیانو شکۆدار کردنەوەی خۆش هاتن نەکرێت!!

---

٢) ابن جبیر / ل: ١٠) پێشـتر ئاماژەمان بە بەشێکی ئەم دەقە کرد. (نووسەر)

ئەوەی دکتۆرەکە باسیکردووە لەکاتی خستنەڕوی قسەکاندا لەمەڕ (نورالدین)دا هانمان دەدات بۆ هۆشیاریدانەکی زۆر لەکاتی هاوسەنگی کردندا لە میانەی دوکەسدا.

ئەگەر لەم هاوسەنگ کردنەدا بوار هەبێ بۆ تێڕوانینەکانو، بنجو بنەوانی ڕاستییەکان ئاوەڵە بکاتەوەو، دەرفەتی شیتەڵ کردنو ڕامان بدات، ئەوکاتە لە لایەنگرتنی شاراوەدا شتێ دەکات بە ئامرازێ بۆ سنور بەزێنیو لادان، زۆر جار هاوسەنگی ئەدەبی لەنێوان دوو دەقداو بەراوردکردنیان پەسەندترە لە هاوسەنگی مێژویی نێوان دووکەسدا، چونکە هاوسەنگی ئەدەبیو وێژەیی لە دەقە هونەرییەکاندا دوو شوێنەواری ئەدەبی لەبەرامبەر خوێنەری بەویژدان لە جاری یەکەمدا نمایش دەکات، ئەنجا داهاتوو ڕای خۆی دەبێ لەمەڕ خوێندنەوەی شێوازەکەداو، لەو حوکمو بڕیارەدا کە دەنووسرێتەوە، بەڵام هاوسەنگی مێژویی لە نێوان دووکەسدا بۆ ئەو حوکمانە دەگەڕێتەوە لەمەڕ ئەو دوو کەسەدا کە هاوسەنگی لە دلێدا دروستی کرون، بێئەوەی ڕووداوی زۆر بۆ خاوەنەکەی بێنێتەوە!!

بۆیە وردەکاری لە هەموو شتێ پێویستترە لەم بوارەدا، ئەگینا ڕوی ڕاستی لەوەیدا کە دەگوترێو لابراوە هەڵگیراوە.

# ئــەوانــە چیــان وتـــووە

کەس نیە لە کلتورو کەلەپوری ئەدەبی ئێمـەدا وەکـو سـەلاحەددین بـە شـیعر ستایشی کرابێ، کاتێ شاعیرانی سەردەمی خۆی سەقامگیریو بـڕواو سـەرکەوتنی یەك لە دوای یەکی ئەو سەرەنجی ئەوانیان ڕاکێشاوە، لەهەمانکاتـدا دڵیـشیان لـە ڕقـی دوژمـنانیـان دەکـوڵا کـە ئـەوروپای دەسـتدرێژکار نـاردبونی تـاکو خـاكو نیشتمانیان بێ دادگەرانە داگیر بکەن، بەم ستایـشەی (سـەلاحەددین) هەڵوێـستی گڕگرتوی کپکـراوی ناخیـان هەڵدەڕشـت. ئەگـەر وا ڕێـك کەوتبایـە کـە پیـاوانی مێژوونووس ژیاننامەی ئەم پاڵەوانە نەمرەیە نەنووسـنەوە، ئـەوەی ئـەو شـاعیرانە بەجێیانهێشتووە ڕۆڵی سەیری ئەویان دەرخستووە لە بەدەستهێنانی سەرکەوتنیدا.

(دکتۆر احمد بدوی) پێڕستێکی درێـژی نووسـیوە لەمـەڕ نـاوی ئـەو کەسـانەی ستایشی (سەلاحەددین)یان کردووە، یان ئەو کەسانەی توانیویەتی کۆیـان بکاتـەوە کە سەرچاوەی شـیعرو هەڵبەسـتەکانو نـاوی دیوانـەکانو پـەڕاوی زانـست گەلـە کەلەپوریەکان (الموسوعات التراثیـة)ە هـەموو دیـاریکردووە کـە بـۆ توێـژەرەوانی ئەدەب ڕێگا خۆشدەکات بۆ زانینیی شێوازی شیعری لە چاخی (سەلاحەددین)دا.[1]

ئەگەر شێوازی ئەم جۆرە دەربڕینیانە لە سـەدەی چـوارەمو بەرەوسـەرتر نەهاتبایـە خوارەوە ئەم دەستمایە گەورەیە ناوبانگێکی زۆری دەبوو لـەناو خوێنەرانـدا، بـەڵام ئاستیان هەر چەندێ بێ لەناو ستایشکاراندا جێگایەکی بایەخداریان بۆ ئـەم پیـاوە مەزنە هەڵگرتووەو پاراستووە.

---

١) الحیاة الادبیة فی عصر الحروب الصلیبیة (ص ٤٣٤ تا ٤٣٨}. (نووسەر).

شیعری مێژوویی هۆکارێکی گرنگە بۆ زیندوکردنەوەی گیانی میللەت، یەك هەڵبەستی شاعیرێکی گەورە کە لە بۆنەیەکی مێژوویی ناوداردا دەگوترێ دەبێتە دەنگو دۆیێ وەچەکان دەیڵێتەوە.

سەیری هەڵبەستی (قصیدە) شاعیر (ابو تمام) بکە لە ڕووخانی (عموریە)داو (موعتەصەم) بە نەمرییەکی سەیری دەهێڵێتەوە، نەك لەبەرئەوەی لە جەنگدا سەرکەوتووە، بەڵکو زۆرکەس بەر لە ئەو لەوبارەوە سەرکەوتن مەهدیو ڕەشیدو مەئمون، بەڵام کەسێکیان نەبووە وەکو (ابو تمام) کە ئەوەیان بۆ بڵێت.

ئێمە ڕووداوی (سیف الدولة) لەگەڵ (ڕۆم)دا دەزانین، چونکە مێژونووسان لە کتێبەکانیاندا تۆماریان کردووە، بۆ غەیری (سیف الدولة) شتی زۆریان تۆمار کردووە، بەڵام (سیف الدولة) شاعیرێکی وەکو (ئەبو طیب المتنبي)ی هەیە ڕووداوەکانی ئەوی لە شیعرەکانیدا هەڵگرتووە، ئەم پاڵەوانە کە شاعیرەکەی باسیکردووە کردویە بە پاڵەوانێکی ناودار.

بەداخەوەم کە دەبینم ئەوکاتە شیعری عەرەبی ئەم چاخە لە گەیاندنی پەیامی نەمری خۆی لایداوە کە بەرزکردنەوەی وردو هۆشیارکردنەوەی دڵەکانەو بووەتە هاوشێوەی مەتەڵەکان، بۆیە کاریگەری خۆی بۆسەر خەڵك لەدەستداوە، بە شێوەیەکی وەهاش ئەگەر بێتو ئەو شاعیرانەی خوازیاری شیعری سەربەستین ناتوانن لە بەهێزترینی بۆنەکاندا شیعرێك بڵێن کەلەسەر زمانی خەڵکی بگوترێتەوە.

بێگومان دیوانی شیعری عەرەبی دوێنێ، ئەمڕۆ قسەیەکە نازانیت شیعرێکە یان پەخشانێکە، خۆزگە پەخشانێك بان کە حاڵی بوونیان کرابایە![1] لە بەرامبەر

---

١) ئەم جۆرە نەخۆشیە ڕوی لە شیعرە کوردییەکانیش کردووە، کام شاعیرەی ئیمرۆ توانیویەتی شوێنی خۆی لەناو دیوانی شاعیرە کۆنەکانی کوردا تۆ مار بکات وەکو: {مەلەویو مەحویو نالیو جەزیریو وەفاییو شێخ ڕەزاو، قانیع، و... هتد} ؟.

سەربارەی ئەو شاعیرانە کە بە عەرەبی شیعریان نووسیوە وەکو (الزهاوی)و (ئەحمەد شەوقی)و (ڕەصافی)و هیتر، وەکو لە (مشاهیرالکرد)دا ناویان هاتووە. هونەر بەگشتی لە تەواوی دنیادا لە ڕێچکەی خۆی لایداوە هەم لە ناوەڕۆکدا هەم لە مەبەستدا. شیعرەکانی کۆنی کورد لە چاو شیعرەکانی ئیمڕۆ وەکو

ئەم کۆمەڵە زۆرەی (د. احمد بدوي) ئاماژەی پێیان کردووە، دەبینی سەرم سوڕماوە کام شیعرەیە هەڵبژێرم بیکەم بە گەواهیدەر لەناو ئەو هۆنراوە جوانانەدا!

ئێمە دەزانین ئەوانەی بە (سەلاحەددین)یان هەڵاوتووە لەیەك ئاستدا نین لە باشیدا، هەیانە (المجلی)یەو هەیانە (المصلی)یە، واتە لە پێشترەو لە پاشترەو، دیوانی هەندێ لەوانە کۆکراونەوەوو ئەو شیعرانەیان تێدایە کە لەمەڕ (سەلاحەددین)دا گوتراوە وەکو قازی (فاضل)و (ابن الساعاتی)و، (ابن سناء الملك)و (اسامة بن منقذ)و (سبقط بن التعاویذی)و (ابن عنین)و (عمارة الیمنی)، ئەگەر لێکۆڵەر بە شیکردنەوەی قسەی هەریەکێ لەوانە هەڵسێ لە ئەنجامی بەخشینی ئەم شیعرە زۆرانە، ئەوەندەی دەستدەکەوێ کە ستایشکراوەکە لە شکۆیەکی بینراوەدا دەربکەوێت.

بەڵام ستەمە تەنیا باس لەوانەو دیوانەکانیان بکەین کە لەبەردەستی توێژەراندا بەکاردەهێنرێن، چونکە سەرکەوتنێکی بەرچاویان تێدا دەبینرێ، کۆمەڵە شاعیرێکیش واز لێبێنین کە نەتوانراوە هۆنراوەکانیان لە دیوانێکی سەربەخۆدا گرد بکرێنەوەو، دوای ئەوە لە پێشترن لە جوانکاریو بەهرەی زۆریاندا، رەنگە ئەم لاپەڕە سادانە هەندێ تیشکیان خستبێتەسەر سەرەنجامی وێژەیی ئەوانەو هاندەرێ بێ بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ لە ناسراوەکان بکۆڵێتەوە، تا هەوڵ بدەن ئەوەی لەناو پەڕاوە دەست نووسەرە فەرامۆشکراوەکاندا شاردراوەتەوە زیندوی بکەنەوە، ئەمە هەڵەی شاعیر نیە کە ئەو نەناسراوەو ناوبانگی دەرنەکردووە.

بەڵکو هەڵەی ئەو کەسەیە بۆ پشودان خەوتوونو تەنیا بە دیوانە چاپکراوەکانو ئەوەی لە دوو، یان سێ کتێبدا بڵاوکراوەتەوە لەمەڕ رێڕەوی (سەلاحەددین)دا لە سەردەمی خۆیدا وازیان هێناوەو چەند شتێکی لێرەو لەوێش کە نەناسراوەکان وتوویانە باسکردووە.

---

موعجیزەیێ وان کە سەردەمیان بەسەر چوو بێت! شیعری شاعیرانی کۆن هەمووی ئیلهامو خورپەی دڵ بووە کە لە نەستی شاعیرەوە هەڵقوڵیوە، بەڵام شیعرەکانی ئیمڕۆ هەستی شاعیر بە تۆبزی دروستیان دەکات! ئەمەش جیاوازییەکی جەوهەرییە لە نێوان شیعری دوێنێو ئیمڕۆدا. (وەرگێڕ)

بەڕاستی کەمتەرخەمی منیش لەو خاوەن دیوانە چاپ کراوە بڵاوانەیە کە باسەکە والیێدەکەن پێویستی بە وردبوونەوە بێت، بەشکو لەوەدایە کە ستەم لە خودی (سەلاحەددین) دەکات، چونکە شتی گرانبەها بەلاوە دەنێم کە لەمەڕ ئەودا گوتراوە، ئەمەش مافێکە.

بەڵام ئەوەی لەم ستەمە کەمدەکاتەوە ئەوەیە من لەو بوارە کەمەدا شت کۆناکەمەوە، بەڵکو تەنیا نموونە دەهێنمەوە، هەرچەندە هەڵبەستو قەسیدەی ناوداران بێنمەوە هەڵبەستێکی باشتر لەو هەڵبەستە بەجێدێڵم کە من هێناومەوە، ئەوەش ڕێگا بە من دەدات بەرلەوەی لە چاوگەکانی ئەم کتێبە بکۆڵمەوە چەند کەسێ هەڵبژێرم کە هەندێکیانم نەبیستووە.

لەوانەش شاعیری نابینا (سعادة بن عبدالله الحمصی) کە دەهاتە لای (سەلاحەددین)و کارەکانی ئەوی بە دڵ بووە، جوانترین وەسفی ئەو کە بە دڵیا دێ دەکاتو توانای وێنە بیرکردنی وەسفی ئەوی بە شێوەیێ هەیە کە تەنیا بە گوێچکە نەبێ نەیبینیوە، ئەگەر (ابو العلاء) ملەملانێی خوێنەرانی خۆی کردبێو چەند هەڵبەستو هۆنراوەیەکی ڕێك خستبێ لەمەڕ خەباتی زرێپۆشینی جەنگیدا کە نەیبینیوە، بەڵکو کەس چاکتر لەوانەی دەیبینین لێی زانیوە، ئەوە (سعادة بن عبدالله الحمصي) لە چەند هەڵبەستەکیدا زۆر وەسفی سوپای (سەلاحەددین)ی کردووە کە پێیان گەیشتۆتە شوێنی ئەنگاوتن. کە وتویەتی:

فاسلم فجيشك لا يثنى له علم
واسعد فبيتك لا تهوى له عُمُدُ

عرمرم كالابى الطيّار منتشر
تحصى الرمال ولا يحصى له عدد

تسمو عليه سماء من عجاجته
مبنية من قناة تحتها عمد

سماء نقع لشيطان العدو بها
من الاسنة شهب كلها رصد

وفـي دياجية نار مـن صوارمـه
تكاد تقطر ماء وهـي تتـقـد
نار تشب على أيـدى عُطارفـة
لايبرق الجو الاّ كلما رعـدوا
ما جنّ عبقر جنّ كلما عزفـوا
ما اسد بيشة اسد كلما حـردوا
من كل اروع أقارحه ثمل لا يستفيق
وما سـيفه غـرد
فـي كـل يوم جـلاد لو المّ به
عمرو بن ود عداه الصبر والجـلد
شم بالشآم سيوفا من عزائمهـم
اذا غمدت المواضـي ليس تنغمـد
ولا تخف فالعوالـي شوكها ثمـر
حلو الجنى المعالـي صابُها شـهد
فمن يكن بالوامضي خاطباً ابـداً
زفّت اليه بلاد كـلها خـرد

ئەم شیعرە بەهێزەو هەرچی لەو بابەتەوە وتراوە لە شوێنی خۆیدا پێی دەچێت، وەسفی بەرجەستەیی (الحسي) تۆزو خۆڵ (العجاجة) کە لەسەر ستونی ڕمەکان بەرز دەبێتەوەو، ئەو شمشێرانەی لەکاتێدا ئاگریان لـێ بڵند دەبێت خوێنیـان لێـدەتکێت بەڵگەیەکە لەسەر بیرتیژێکی سەرسوڕهێنەر لـە ڕمـانی شـتێکدا کـە لای شـاعیر دەبیسترێ نەك دەبینرێت.

بەڵام ڕۆشنبیری زانستی لەم وتەیـەدا ئاشـکرایە کـە لەمـەڕ (عـەمرۆی کـوڕی وەدد)و شێری بێشەڵانو جنۆکەی خێونـشین گـوتراوە، بـەڵام ڕامـانی وردی بـەری لادێییەکان (العوالی) کە لێکردنەوەی خۆش‌و بە تامەو، بەرزاییەکان کە هەنگوینی

شیرینی لێیه، هەرچەندە مرۆڤ ئازار بچێژێ لە ڕێگەیداو ئەو کچانەی بە زەبری شمشێر داخوازی دەکرێن.

بە جوانترین شێوەی چاوەڕەێکراو هاتوون، شاعیر لێرەدا لەمەڕ سوپاوە قسە دەکات نەك سەرکردەی سوپا، چونکە سەرکردایەتی سوپای چاکی هەڵبژاردووە ئاشی شوێنەکە هەڵدەسوڕێ تا تاجەگوڵێنەی سەرکەوتن بەدەستدێنێت.

بەڵام وتەی تایبەت بە (سەلاحەددین) لەم هەڵبەستە جوانەدا هاتووە کە شاعیر (سعادة بن عبدالله الحمصی) جوانکاری تێدا کردووە، کاتێ پەنای بردۆتە بەر ڕامانی بەرجەستەیی (التصویر الحسي)، وەك ئەوە بسەلمێنێ کە (ابو العلاء)و (بشار) لە ڕابردوودا سەلماندویانە کە هەرای جەنگییانو بینەرێ وەسفکردووەو، لە ئاستی ئەو دوانەدا دانەبەزیوە لەکاتێکدا کە ئاڵاو شمشێرو ڕمو ئەسپی ڕەسەنی (سەلاحەددین)ی وەسفکردووە لە ئاستی ئەم دوانە دانەبەزیون، وتوویەتی:

و راية ما هفت يوما ذوابلهـــــا
الا على قد عســـــال من الذبـل

صفراء خافقة بالنصر حائـــــزة
بالحلول ما لم يُحْزه الغيـر بالحيـــل

منشورة ليس يطوى عزم صاحبها
حتى ينال مكانا قـــط لم ينـــل

وصارم مرهف خفت مضــــاربه
فليس يسبق الا سرعة الاجــــل

سيف ليوسف ما قدت حديدتـــه
الا من الظفـر المقرون بالجــــذل

كأنه وهو فـي يـمناه منصـــلت
برق جلا عارضا فى عارض هطـل

و ذابل عطفه يهتز من طـــرب
الى الطعان وما يهتز من خطـــل

يزداد من طوله طولا براحتـــــه
اذا طوال الردينيـــات لم تطـــل
وسابح لو يجارى الريح عاصفـــة
لقيدت خطوات الريـــح بالفشـــل
سهل القيادة فما يُعـرى الى شـغب
جمّ الناشـط فما يدعى الى كســل
نجم يمر ببـــــــدر فى دجى قتـم
صقر يكبر بليـث فـي شـرى اسـل

(سعادە)ى نابينا ويستويەتى كە تواناى (وێنە بيرى)[1] خۆى بچەسپێنێ نـەك لە نواندنى (ئەندێـشەيى دەرونــى)و (دالّغـەى مرۆڤايـەتى)دا كـە لـەو نـزيكترن‌و پەيوەستترن، بەڵكو لە ڕامانى ديارەدى بيناييـدا[2] ئالآيـەكى شـەكاوەو شمـشێرى تيژى بڕندەو ڕمێكدا كە لە دەستى شۆڕەسواردا درێژ دەبێتەوەو ئـەو ئەسـپەى كـە بەهۆى چالاكى خۆى ڕێگا بە باى تيژڕەو دەگرێ هـەنگاوەكانى فەشـەل پێـدێنێت‌و تێكدەشكێنێت:

نـجم يـمر ببـــــدر فـي دجـــى قتـــم
صـــقر يكـــرُّ بليـث فـي شرى أسلِ

لێرەدا ئەم داهێنەرە بەجێدێڵم ڕوو لە داهێنەرێكى‌ترى نەناسراو دەكەم كـە بـە (فتيان الشاغورى) ناسراوە، هەوڵمدا شتێكى قەناعەتبەخش لەمەڕ ئەم شـاعيرەوە بزانم، بەڵام تەنيا ئەوەندە دەزانم كە ئەو لە (شاغور) بـووە كـە پەيوەسـتكراوە بـە ئەوەوە! ئەگەرچى ئەوەمان لەدەست چوو كە زێدو باوانى ئەو بزانين، بە شيعرى ئەو دەزانين كە ئەو ياوەرى شكۆدارى (سەلاحەددين) بووە، هـەر لەوكاتـەوەش كـە لـە جەنگى (دەمياط)دا لە سەردەمى وەزارەتەكەيدا دەركەوت، تا ئەو ڕۆژەى بـوو بـە

١) وێنە بير (ڕامان – التصوير).
٢) بينايى (البصريه)

پاڵەوانی پاڵەوانەکان لە ڕۆژی (حطین)دا، وەکو زانیمان (ئیبن خەلەکان) وەکو لە (وفیات الاعیان)دا[1] باسیکردووە کە ماوەیێ لە (الزیدانی)دا ماوەتەوە کە خاوەنی دیمەنێکی سروشتی لە ئاسایی بەدەربووە، خاوەنی کتێبی (الخریدة) شتێکی کەمی لەمەڕ ئەودا نووسیوەو ئەو ستایشەی لەمەڕ (سەلاحەددین)ی بەجێی هێشتووە قەرەبووی ئەو هەواڵانە دەکاتەوە کە لەمەڕ ئەودا نەماون، وە لە وەسفی بە ئاکام نەگەیشتنی دەستدرێژیکاراندا بۆ سەر (دمیاط) جوانکاری نواندووە، دوای ئەوەی ئەم پاڵەوانە ماوەیەکی کەم حوکمی (میسر)ی وەرگرتووە بەرەو دوا پاشەکشەیان پێدەکات، ئەمەش یەکەم کاری پاڵەوانانەیە دوای مردنی (اسد الدین) پێوەی هەڵدەستێت، (شاغوری) دەڵێت:

ولما اتوا دمیاط کالبحر طامیاً
وليس له من كثرة القوم ساحل

یزید عن الاحصاء والعد جمعهم
الوق الوفٍ خیلهم والرواحل

رأوا دونهم اسدا بایدیهم القنا
وبيضا رقاقا احكمتها الصياقل

وداروا بها فی البحر من کل جانب
ومن دونها سد من الموت حامل

رای الکلب ملك الروم اذ ذاك فتحها
فخاف، و أمُّ الملك والروم هابل

---

١) وەکو لە (مشاهير الكرد/ محمد امين زكر بگ)دا هاتووە لێرەدا دوو خەلەکان هەیە، یەکێکیان دەکەوێتە قەزای ڕانیە. ئەویتر دەکەوێتە قەزای ڕەواندزەوە لە گەروی گەلی عەلی بەگداو وادەردەکەوێ کە (ابن خلكان)و برایەکەی خەڵکی ئەوێ بوون هاوسەردەمیدا (ابن الاثیر) بووە، کە لە (دورگەی ابن عمر) لەدایك بووەو لە حەلەبدا چاویان بە یەکتر کەوتووەو برایەکی (ابن الاثیر)و باوکی (ابن حاجب)ی زانا لەگەڵ سوپای (صلاح الدین)دا بوون وەکو ڕابردوو باسمانکرد، (ابن حاجب الكردي) خاوەنی (الكافية) کە سەرچاوەیەکی گرنگی ڕێزمانی عەرەبییە، باوکی ئەم زانایە لە (مشاهيرالكرد)دا ناوی (عزالدين موسك)ە. (وەرگێڕ)

فعادوا على الاعقاب منها هزيـــمة
كانهم ذلاَنعـــام جوافـــــــل
وما أمّلوا ان يلحقوا ببلادهـــــم
لتعصمهم مـــما داوه المعاقــــل

ئەگــەر خوێنــەر کارامەییــەکی زۆر لــەم هەڵبەســتانەدا بــەدی دەکــات، ئــەم کارامەییە شــوێنی خــۆی بــۆ هەڵــچوونێکی ســۆزی خــاڵی کــردووە کــە لــەکاتی سەرکەوتنی (حطين)دا بە یەکجاری دەرونی شاعیری پێهەڵچووە.

ئەنجا هۆنراوەکی لەخۆوەی ڕێکخستووە کە ئەو هەڵچوونە سۆزییە پێویستی بــە جوانکاری‌و تۆکمەیی نەبێت. جوانترین شت ئەوەیــە کــە وەســفی خــۆ بەکــەمزانی سەلاحەددینی لەناو خەڵکدا کردووە، دوای بیستنی شتە جوانەکانی ئــەو چــاوەکان سەیری دەکەن‌و تێی دەڕوانن. (فتيان) لە ڕۆژی (حيطين)دا دەڵێ:

جاشت جيوش الشرك يوم لقيتهم
يتــذامرون عــلى متــون الضــمَّر
او ردت اطراف الرماح صدورهـم
فولغن فـي علق النجيـع الحمـــر
فهناك لم يُرَ غير نجم مقبـــــل
فـي إثر عفريــــت رجيم مدبر
فمن الذي من جيشهم لم يخـــترم
ومن الذي من جمعهـــم لم يؤسرِ؟
حتى لقد بيعت عقائل ارهقــت
بالعبـي بالثمن الاخـــسِّ الاحقرِ
لا يعد منك المسلمون فكم يـــد
او ليتهم معروفهـــا لم تنكـر

امنت سربهم وصنت حريمهم
درأتَ عنهم قاصمان الاظهر
ما ان رآك الله الا آمراً
فيهم بمعروف و مُنكرَ منكرِ
متواضعا لله جل جلاله
وبك اضمحلت سطوة المتكبر
لم يخلُ سمع من هناء مهنىء
للمسلمين ومن سماع مبشر
واستعظم الاخبار عنك معاشر
فاسصغروا ما استعظموا بالمخبر
مَضَت الملوك ولم تنل عشر الذي
اوتيه من منجح او مفخرِ!

من وام بە خەیاڵدا دێ کە ئەم هەڵبەستە هەڵچونێکی هەستییە لەیەك دانیشتندا گوتراوە، چونکە لە بەجێهێنانو واتادا ئاسانەو وەکو ڕۆیشتنی ئاو بۆ ناو ڕووبار دەڕوات، ئەگەر شاعیر شتێکی هاتە پێشو حەزی پێدەکرد ئەوەی بە خەیاڵی دادێ باسدەکات، بێ پێویست بوون بە شێنەیی کردن، چونکە خۆماندوکردن لە هەندێ بارودۆخدا بێ ئاکام دەبێت.

بەڵام (ابن جبیر) بە گەشتیار دەیناسین نەك بە شاعیری لە قەڵەم بدەین، چونکە ئەوەی لە شیعرەکانی ماوەتەوە زۆر کەمەو، مێژونووسانی ئەو وتویانە کە ئەو دیوانێکی شیعری هەیە تایبەتە بە شیوەنی خێزانەکەیەوە، بەو پێیە لە ڕیزی پێشەوەی ئەو شاعیرانەیەوەیە کە لە شیعرەکانیاندا ئەو ڕەوتەیان گرتووە، بەڵام ئەم دیوانە وون بووەو نەدۆزراوەتەوە، گەشتەکەشی ماوەتەوەو دەنگی داوەتەوە. لەم گەشتەدا چەند پەڕەیێ لەمەڕ (سەلاحەددین) هاتووە کە لە تێکۆشانی جەنگی ئەوو هەڵوێستی پاڵەوانانەی ئەو دەدوێت، لەگەڵ ئەوەشدا سکاڵا لەمەڕ خراپی

گومركو باج لەدەست باجوەرگرانى گومرگى (ئيسكەندرونە) سكالاَ دەكات، كاتێ زەحمەتو ئەركيان خستبووە سەر ئەو حاجيانەى لە (مەغريب)ەوە دەهاتنو لە تواناشياندا نەبوو ڕاى بپەڕێنن، دواى ئەوەى (ابن جبير) لەمەڕ دژواريەكانيان قسە دەكات باسيكردووە كە سكالاَ كە دەگاتە گوێچكەى (سەلاحەددين)و ئەويش بەزەيى پێدا دێنەوەو فەرمان بە كۆتايى هێنان بە كێشەكە دەكا.

بەلاَم بۆنەى باسكردنى ئێستاى ئەو هەلَبەستە جوانەيەتى كە لە گرتنى (بيت المقدس)دا لەسەر دەستى (سەلاحەددين)دا گوتويەتى، چونكە ئەم گەشتيارە دوور نيە زياتر لە جارێ سەردانى خۆرهەلاَتى كردووە، كارەساتو بەلاَى فەرەنگەكانى لەمەڕ بێدەسەلاَتو چەوساوە مسولَمانەكان زانيوە كە لە خەوى لێزڕاندبوو خەمەكى ترى بۆ زياد كردبوو، چونكە ئەو (مەغريبى) بوو هەمان دۆخى بەدەست فەرەنگە (فەلە)كانى ئيسپانەوە بينى بوو كاتێ لە ئەندەلوسدا ولاَتى مسولَمانيان داگير كردبوو، بۆ ئەوپەڕى (مەغريب) سنوريان بەزاندبوو، كارەساتى وايان قەوماند بوو كە دلَى (ابن جبير) بتەزێنێو وەك بلَێى مەبەستى ئەم حەجە بۆ سوككردنى خەمەكانى بووەو، زۆر ڕووداوو گەرمەسات لە (خۆرهەلاَت)دا لەو پەڕى توندیدا دەبينێ، تروسكاييەكى هيواش لە (سەلاحەددين)دا دەبينێ، سەرئەنجام ئەم تروسكاييە ئاگرى گرتو بووە ڕوناكييەك لەكاتى گرتنى (قودس)دا ڕوناكى دەداو، خاچييەكانى لەوێدا شاربەدەركردو دلَخۆشييەكى ئەوەندە گەورەبو كە گەورە شاعيرە ناودارەكان دەريانبڕيوە، لەوانە (ابن جبير) بەم هۆنراوە بەناوبانگە هەلَيدەڕێژنێو بە ستايشى (سەلاحەددين)ەوە وتويەتى:

اطلت على افقك الزاهر
سعود من الفلك الدائر
فابشر فان رقاب العدا
تمد الى سيفك الباتر

وكم لك من فتكـــــة فيهمو
حكت فتكة الاســـد الخـــادر
كســرت صـليبهــم عنـــوة
فلله درك مــن كاســـــــر
وامضيت جـدك فـي غزوهـــم
فتعســـا لجـدهم العاشـــر
ودابر ملكه وبالشـــــــآم
و ولى كأســـــــهم الدابـــر
جنودك بالرعــب منصــــورة
فناجز متى شـــئت او صـــابر
فكلهم غرق هالـــــــــك
بتيار عســـكرك الزاخـــــر
ثـأرت لدين الهدى فـي العـــدا
فآثـــــرك الله من ثـائـــر
وقمت بنصر اله الـــــــورى
فســـماك بالملـــك الناصر
تبيــت الملـوك على فرشـــهم
وترفل فـــي الزرد الســـابري
وتؤثر جاهد عيش الجهـــــاد
على طيب عيشـــهم الناضـــر
وتسهر ليلك فـي حـــــق من
سيرضيك فـي جفنـــك الســاهر
فتحت المقدسّ من ارضــــــه
ثعادت الى وضــعها الطـــاهر

وجئت الی قدسه المرتضـــــــى
فخلصته من یـــد الکـــــافر
واعلیت فیه منـار الهـــــدی
واحییت من رســـمه الدائـــر
لکم ذخر الله هـذي الفتـــــوح
مـن الزمـــن الأول الـغـــــابر
وخصــك من بعد فاروقـــــــه
بها لاصــطناعك فـي الآخـــــر
مصحبتکم القیت فـي النفـــوس
بذکر لکم فی الوری طـــائـــــر

جوانکاری ئەم هۆنراوەیە تەنیا لە ئاسانیو بیری ڕاستگۆییو سۆزی گەرمیدا نیە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا ڕوانینی خەڵکی (مەغریب) بۆ (سەلاحەددین) ڕوندەکاتەوەوو هەواڵ دەدات کە دنیای ئیسلامی ئەوکاتە یەك جەستە بوون، سنورە دەستکردە سیاسییەکان لەناو دەوڵەتەکاندا میزاژی سۆزایەتی لەناو ئەوانەدا مەنع ناکات کە ئاین پەروەرن بۆ ئیسلامو ئەوان لە هەموو شوێنێکدا لە هیواو ژانەکاندا یەکدەگرنەوەو، ئەم حەقیقەتەش دوژمنانی مسوڵمانان لە دەرەوەو ناوەوەدا دەتۆقێنێ، لەدەرەوەدا جەنگی خاچییەکان دیارترین مەترسیداری ئەوە، لەناوەوەشدا چەندان بانگەوازی گومانداری وەکو ڕەگەزپەرستییەتو فیرعەونییەتو بەربەرییەتو فینیقییەتمان بینی کە هەموویان بۆ جەنگکردن لەگەڵ ئیسلامدا کێبەرکێ دەکاتو هەرکەس باسی بکات دەتۆقێ وەکو چۆن کەسێ پێوەی درابێ لە کەڵبەی مار دەترسێت، ئەو نەوازشتکەرانە هەموو هۆیەکیان بەکارهێنا کە سەرنجیان ڕابکێشێو نیازی خراپی ئەوان ڕووپۆش بکات کە لێك هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی نێوان وڵاتە ئیسلامیەکانە، بەڵام ئەمە بێسودە، چونکە ناتوانن ڕووناکی خوا بکوژێننەوە.

کاتێ سوپای فەڕەنگەکان لە ئەوروپاوە وەکو کوللە پەلاماری قودسیاندا دوای

پاکژکردنەوەی لە پیسی ئەوان بۆ گێڕانەوەی، شاعیرەکان هەستیان بە مەترسی کرد لە داهاتوودا، بەلاّم دەیانزانی (سەلاحەددین ئاستەنگێکی بەرزەو دژوارە وە خەباتی ئەو بۆ رزگاری (المسجد الاقصی)، ئەگەر جارێکی تریش توشی کارەسات بێتەوە وچان ناگرێ.

(الرشيد النابلسي) کە وەکو نەناسراوێکە لەناو ئەدەبیاندا، چونکە من هیچ شتێ لەبارەی ئەو نازانم، جگە لەوە نەبێ لە شیعرە هەجوەکانیدا هاتووە لە بەشی سێیەمی (فوات الوفيات/ ابن شاکر)و ئەو شیعرەش کە لەبەشی دووەمی (الروضتين)دا هاتووە! ئەمەش بۆ زانینی ئەو زۆر سود نابەخشێت، ئەم شاعیرە ویستویەتی، من دەڵێم ویستویەتی کە سەرەنجی (سەلاحەددین) بۆ ئەو رووداوانە رابکێشێ کە ئەم دەیانبینێ‌و ئەویش لێیان بێئاگایەو، هۆنراوەکی ستایشکەری نووسیوە لەناویدا وتویەتی:

ويح الفرنجة بل ويل أمّهـــــم او ما
فيهم لبيب علـى العـــلاّت يغنبـر
فكم نثرتهموضر با اذا انتظمـــــوا
وكم نظمـــوا طعنا اذا انتشـــروا
ان يَممّـوك فلا بـــدع لجهلهـــــم
تسعى الى الاسـد في غاياتها الحمـر
فمام عن حوزة البيت المقـــدّس لا
خوف -وحاشاك من خوف- ولا ضـرر
هو الشريك وقد ناداك معتصـــــما
فما علـــى مجده من بعد ها حـذر
وسوف تسـتغفر الايام هفوتهـــا
وتحصد الفئة الاوغـاد ما بـــذروا

ما ابهج الدين والدنيا بمالكهـــا
الصديق يوسف لا لاذت به الغيـــر
ملك تساوت جمادى في الجهاد وتّموز
لديه وضـــاهى ناجرا صـــــفر
فليس يثنيه حرّ ان توقـــــد عـن
رضا الا له، ولا ان اغـــدق المطـــر
ولا ينهبهه عما يكـــــــابده
ضـج — اعيذ معاليـه — ولا ضجر
ولا يرى الروح الاظهر ســـــهلتـه
فـي بطن معركة مركـــوبها وعــــر
صبر جميل كطعم الشـهد في فمـــه
وعند كل مليك طعمـــه الصـــبر

وە ئەم قسەیەی ئەو کە دەڵێ: (صبر جميل... هتد) ئەوەمان دەخاتەوە یـاد کـە (ابن جبير) ئاماژەی پێکردووە کە سەرکۆنەی هەندێ پاشـاکانی هاوچـەرخی خـۆی دەکات کە لەناو بەهرەکاندا شـانازی دەکـەنو کەشـخەلێدەدەنو لەسـەر ئاوریـشم دەخەونو خۆشگوزەرانی بەسەر خەباتدا هەڵدەبـژێرنوو دەخـەونو شـەونخونیش بـۆ (سەلاحەددین) بە جێدێڵن کە بەرگری بکات لەکاتێکـدا ئـەوان خـەوتوون! هـەبوو لەوانە پلانو نەخشەی بەدزییەوە بۆ دادەڕشتو سەرکەوتنی ئەویان بێ شـکان بـوو بۆ ئەوان، بە پەنهانی ڕقیان لێی دەبۆوە، بەڵام زمانەکان بە شێوەیێ لەمەڕ ئەواندا دەدوا کە ئابڕوچوونو ناوزڕانی ئەوانی تێدا بێت، ئەمە نموونەیەکە لـەو شـیعرانەی شاعیرە نەناسراوەکان لەمەڕ پاڵەوانـەتی (سـەلاحەددین) قـسەیان کـردووە، کاتـێ بەرەو فیردەوسی پەروەردگاری گەڕایەوە ئەم ستایشە گۆڕا بە شینو زارییەکی گـەرم کە بە کارەساتێکی گەورە دادەگیرسێتو تاووتوێی ئەم شینو زارییەش ڕێژەکی خۆی هەیە لە نێوی ئەدەبیدا پێم خۆش نیە سۆزو خۆشەویـستی بـە سـوێی خوێنـەر بـە

باسکردنی ئەم کارەساتە هەژێنەرە بوو روژێنم کە شینگێرەکان هەستی پێدەکەن، ئەگەر بەر لەوە شینی تری گەورە پیاوان نەبوایە هەر لەسەردەمی هەموویانەوە (محمد) کوڕی (عبدالله) ﷺ نزیك دەبوو، گیانەکان لە لاشە جیابکاتەوە.

کارەساتی (سەلاحەددین) وەکو شاعیری عەرەبی باسی دەکات لە ڕابردوداو:

**وما کان قیس هُلْکة هُلْك واحد**
**ولکنّه بنیان قوم تهدّما!!**

واتە: ئەندازەی مردنی ئەو یەك مردن نەبوو بەڵکو خانوی گەلێك بوو ڕووخا.[1]

---

١) حوکمرانی ئەییوبیەکان:

١/ لە (میسردا (صلاح الدین الایوبی – یوسف کوڕی ئەییوب ١١٧٤ زایینی.

- عەزیزی کوڕی عوسمان کوڕی صلاح الدین ١١٩٣ ز .
- مەنصور محمد کوڕی عوسمان ١١٩٨ ز .
- عادل(١) احمد کوڕی ئەییوب ١١٩٩ .
- کامل (١) محمد کوڕی ئەحمەد ١٢١٨.
- عادل (٢) محمد کوڕی محمد ١٢٣٨ .
- موعەظەم توران شا کوڕی نەجمەددین ١٢٤٩ .

٢ / ئەییوبیەکان لە دیمەشقدا :

- الافضل نورالدین علی بن صلاح الدین ١١٩٣ .
- العادل (١) احمد بن ایوب ١١٩٦ (مصر وشام) .
- المعظم عیسی ابن احمد ١٢١٨ .
- الناصر داود بن عیسی ١٢٢٧ .
- الاشرف موسی کوڕی احمد ١٢٢٩ .
- الصالح اسماعیل کوڕی احمد (١) ١٢٣٧ .
- الصالح اسماعیل کوڕی احمد (٢) ١٢٣٩ – ١٢٤٥ .
- الکامل (١) محمد کوڕی احمد (١٢٣٧) مصر وشام .
- العادل (٢) محمد کوڕی محمد ١٢٣٨ مصر وشام
- الصالح نجم الدین ئەییوب موڕی محمد (١) ١٢٣٩ .
- الصالح نجم الدین ئەییوب کوڕی محمد (٢) ١٢٤٥ – ١٢٤٩ .
- الصالح اسماعیل کوڕی احمد (٢) ١٢٣٩ ز .
- الصالح نجم الدین ایوب کوڕی محمد (٢) ١٢٤٥ مصر وشام .

– المعظم توران شاه کوڕی نجم الدین ١٢٤٩ – ١٢٥٠ مصر وشام .
٣ / (ئەییوبییەکان لە – حەلەب دا) :
– العادل (١) احمد کوڕی ئەییوب ١١٨٣ پاشان مصر وشام .
– الظاهر غازی (١) کوڕی صلاح الدین ١١٨٦ .
– العزیز محمد کوڕی غازی ١٢١٦ .
– الناصر یوسف کوڕی محمد ١٢٣٦ – ١٢٦٠ .
٤/ ئەییوبییەکان لە (حماه) :
– تقی الدین کوڕی توران شا کوڕی ایوب ١١٧٨ ز .
– المنصور (١) احمد کوڕی عومەر ١١٩١ .
– الناصر قلبج کوڕی ئەرسەلان کوڕی سلیمان ١٢٢٠ .
– المظفر (١) محمود کوڕی سلیمان ١٢٢٩ .
– المنصور (٢) محمد کوڕی محود ١٢٤٤ .
– المظفر (٢) محمود کوڕی محمد ١٢٨٤ .
٥/ ئەییوبییەکان لە (حمص)دا :
– شێرکۆ کوڕی شادی ت ١١٦٩ .
– القاهر محمد کوڕی شێرکۆ ١١٧٨ .
– المجاهد شێرکۆ (٢) ١١٨٦ .
– المنصور ئیبراهیم کوڕی شێرکۆ (٢) ١٢٤٠ .
٦ / ئەییوبییەکان لە (میا فارقین)دا :
– الناصر صلاح الدین کوڕی ئەیوب ١١٨٥ ز .
– العادل (١) احمد کوڕی ئەییوب ١١٩٤ .
– الاوحد نجم الدین کوڕی سیف الدین ١١٩٩.
– الاشرف موسا کوڕی سیف الدین ١٢١٠ پاشان شام .
– المظفر شهاب الدین غازی کوڕی یوسف الدین ١٢٢١ .
– الکامل ناصر الدین محمد کوڕی شهاب الدین ١٢٤ – ١٢٨٤ ز .

(المنجد في الاعلام / لویس معلوف). ماوەی حوکمی (صالح الدین) لە میسردا (٢٤) ساڵ بوو، (١٩) ساڵ لەوە لەشامدا بەڕێکردو (١٧) کوڕو کچی هەبوو، پاشان دەوڵەتی مەمالیکی دەریایی هاتە شوێن کە سوڵتان (مظفر قوطوز) سەرکردایەتی کرد لە (٦٥٧ ك)دا.

دوا شای ئەییوبییەکان لە میسردا (الاشرف موسی) بوو، وە لە شامدا (الناصر یوسف) بوو. (النوادر السلطانیة/ ابن شداد/ تحقیق احمد ایبش/ ل١٢/ط٢/٢٠٠٥م/ دیشق).

هۆی ڕووخانی ئەم دەوڵەتەش وەکو ڕابردوو باسمانکرد پەیدابوونی ناکۆکیو پەرتەوازەیی خێزانی ئەییوبی بوو، کاتێ شا (الافضل) کە دانراوی باوکی بوو بەرکەناریان کرد .(انا لله وانا الیه راجعون) (وەرگێڕ)

# نـێـوەڕۆك


پێشـــەکی ........................................ ٩

چـەند دێرێك لەبارەی سەلاحەددینەوە ........................................ ١٣

پەتای پەرەسـەندوو ........................................ ١٥

بەر لە سەلاحەددین ........................................ ٢٩

خێزانێکـی دلێـرو نەبەز ........................................ ٤٥

بەرەو میسـر ........................................ ٥٩

وەزارەتی سـەلاحەددین ........................................ ٧٩

(خەلافـەتی) لابـراو ........................................ ٩١

نێوانی دوو پاڵەوانی گـەورە ........................................ ١٠٣

لە پێناوی یەکـڕیـزیدا ........................................ ١١٣

چاکسازییەکانی ناوخۆ ........................................ ١٢٧

سـەرلەنوێ بەرەو (شـام) ........................................ ١٤١

چەند گومانێ بێ ڕێگە پێ دان باس دەکرێن ........................................ ١٥٥

ڕۆژی حـیتـین (الحطين) ........................................ ١٦٧

میـری کـەشـتیگـەل (الاسطول) ........................................ ١٨١

بەیتولـمەقدیـس ........................................ ١٩٣

جەنگـەکانی (عەککـا) ........................................ ٢٠٥

مەلەوانەکی گیان بەخش (پێشـمەرگە) ........................................ ٢٢١

خەمەکانی پاڵەوانێك ........................................ ٢٢٩

قازی (فـاضـل) .................................... ٢٤٥
ئاسـتەنگو تەنـگو چەڵەمـە .................................... ٢٦١
کوژانەوەی چـرایەکـــە .................................... ٢٧٥
کەســێتییەکی دەگـمەن (ناوێزە) .................................... ٢٨١
هاوسەنگییەکی نادادگەرانە لەبارەی (عمادالدین)و (نورالدیـــــن)و
(سەلاحەددین)دا .................................... ٢٩٩
ئەوانـە چیـان وتـووە .................................... ٣١١
نێوەڕۆك .................................... ٣٢٩

